# بلوڤکەری یەک دوو گومانی

# سەلەفی



نووسینی
محمد بونیت

وەرگێڕانی
نجم الدین فرج أحمد



ناوی نوســــــــەر: محمد بونێیت

نـاوی کتێـب بەکوردی: بڵق و کەفی یەک دوو گومانی سەلەفی

نـــــــاوی وەرگێـــڕ: نجم الدین فرج احمد

چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/هەولێر

نەخشەســـــــــازی: إسماعیل طه

خـــــــــەت: نـــەوزاد کۆیـــی

بـــــــــــەرگ: ئەمیـن مخـلـص

نـۆرە و ساڵـــی چـاپ: یەکەم ١٤٣٢ك - ٢٠١١ز

تیـــــــــــراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١٨٨٤) ساڵی ٢٠١٠ ی پێدراوە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دلدگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

## پێشکەشە

بەو موسوڵمانە زیتەی دین و بەرەو ماقی سەلەف لە دیدو بەرەو لاقی مەدخەلیزم جوێ دەکاتەوە.

انَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ .

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا

أمَّا بعدُ: فإنَّ أصْدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدي هَدْيُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وكُلَّ ضَلالةٍ في النَّارِ .

## ئەم کتێبە

ساڵی ٢٠٠٤ بو لە ماڵی برایەکی جەزائیری لە ئۆسلۆ کتێبێکم بە ناوی (کشف الشبهات .. عقیدة السلفین في میزان أهل السنة والجماعة) بینی، لەو کاتەی من سەیرێکی سەرپێیم دەکرد، خاوەن ماڵەکە وتی: نوسەری ئەم کتێبە محمد بوننێتە نوسەرێکی ئیسلامی تازە پێگەیشتو و دەرکەوتوە، بەڵام بە داخەوە پار لەژێر ئەشکەنجەی جەللادانی وڵاتی مەغریبدا شەهید بوە. دوایش کتێبەکەی پێشکەش کردم..کتێبەکە لە ناوەرۆکیدا بەو هەمو بەڵگانەی پشتی پێ بەستون دەوڵەمەند بو، بەڵام لە ڕوی ڕێکخستن و چاپکردنیەوە سەرەتایی و زۆر ناڕێك بو..

دواتر زانیم، کە نوسەرەکە مامۆستای زانکۆیەو دکتۆرای لە (ئیبنوحەزمی زاهیریی)دا هێناوەو ناسراوێکی ڕەوتی سەلەفی جیهادییەو، ئەم کتێبەش چاپێکی تری جوانتر کراوەتەوەو بە ناوی (عقیدة أدعیاء السلفیة في میزان أهل السنة و الجماعة) بڵاو بۆتەوە، بینیم کە ئەبو محمەدی مەقدیسی پێشەکیەکی کورتی بۆ نوسیوە..

لە ٢٠٠٤ ـ ٢٠٠٩ کە گۆڤاری دوربینمان لە نەرویج دەر دەکرد، مەلا عومەری مۆکەبەیی هەندێك بابەتی لەو کتێبە دەرهێناو بە ناوی (گەڕەلاوژێی سەلەفیەکان) کردی بە چەندین مەقالەیەك بۆ دوربین، لەوێدا وەکو بابەتێکی موناقەشە بڵاو کرانەوە، بەڵام ئەو لەگەڵ ئەوەشدا، کە دەقە ئەسڵی کتێبەکەی هەمو وەرگێڕابو، بەڵام تانەو تەشەری خۆی بە شێوازێکی ئەدەبی خستبوە

سەر، من نوسینەکەی ئەوم بۆ لێك جویٚ نەکرایەوە، بۆیە وەك خۆی بە ناوی (چەند هەڵوێستەیەك) دامنایەوە ..

دواتر بەداخەوە مەلا عومەر هەر لە پێشەکیەکەیەوە وازی لە وەرگێڕانی کتێبەکە هێناو، ئەو ئەرکەش کەوتە سەر من... منیش پار (٢٠٠٩)کە بیستم وا کۆمەڵێك سەلەفی ناحاڵی لە دین و سیاسەت لە کوردستان کەوتونەتە شەق هەڵدان لە ئەهلی ئیسلام و دیدی مورجیئەێتی خۆیان کردۆتە دینی خوا، گەڕامەوە سەر کتێبەکەی بوننێتی رەحمەتی و هەمویم کردە کوردی.. بەو هیوایەی سودێك بە رەوتەوان و هاوبیرانمان بگەیێنێت، بە تایبەتی لەم کاتەدا، کە روەو روی ئەو سەلەفیە داماوانە بونەتەوە.

کەوابو ئەو بابەتەی بە ناوی (چەند هەڵوێستەیەك) لێرەدا دەبینرێت هەر نوسینی دانەرەکەیە بەڵام لە داڕشتنەوە کوردیەکەیدا بە شێوازێکی تانەو تەوس نیشاندراوەتەوە.. ئەمما بابەتەکانی دوو بەشی (پێناسەی باوەڕ) و (پێناسەی کوفر) هەر نوسینەکەی محمد بوننێتی مەراکیشییەو وەکو خۆی کراوە بە کوردی..

لەبەر ئەوەی باسەکانی بوننێتی رەحمەتی دووروردرێژبون، ناچار بوم بەش بەشیان کەم و ناونیشانی تریان بۆ دانێم، بۆ نمونە پێشەکیەکەی خۆی، کە بە یەك ناونیشان نوسیبوی بۆتە چوار هەڵوێستە، پێناسەی باوەڕ، کە بۆتە بەندی یەکەم، هەر هەموی بە یەك ناونیشان نوسیبو، خوێنەر لە بەردەوامبون و تەواو کردنی سارد دەبۆوە، بۆیە ئەویشم کردوە بە چوار باس... هەروەها پێناسەی کوفرو وەڵامدانەوەی گومانەکان..

هەروەها زۆر لە پەراوێزەکان، کە نوسەر بۆ رۆشنکردنەوەی هەندێك بابەت کردبونی، دوردرێژ بون، پەراوێزی وا هەبو پەرەو نیوەێك بو، حەتمەن بە کوردیەکەی زیاتر لە سێ لاپەڕە دەردەچو، دیتم جیاوازیەکی وایان لەگەڵ

دەقەكە نیە، لەبەر ئەوەی هەردووكیشیان بۆچونی كەسێكن، بە باشم نەزانی وا لێك دور بن؟ بۆیە زۆرینەیانم لە كوردیەكەدا كردەوە بە دەقی كتێبەكە.

كتێبەكە زیاتر لە سەد زاراوەو ناوی زانایانی سەلەفی تێدایە، نەدەكرا بۆ كتێبێكی وا بچوك هەمویان بناسێنم، نەشدەكرا وازیان لێ بهێنم بە تایبەتی زاراوەكان، بۆیە هەوڵمداوە ئەوەی بە زەروریم زانیوە، پێناسەیەك یان شەرحێكی كورتی بۆ بكەم.

ئەم كتێبە هەرچەندە ناونیشانەكەی هەزەلییانەیە، بەڵام ناوەرۆكەكەی زۆر زانستیانەیەو بە پێی دیدو بۆچونی ئەهلی سوننەت وجەماعەتەو وردەكارانە پێناسە سەقەتەكەی مورجیئەكان (وەدخەلی و سەلەفیەكانی بەر سێبەری حاكمەكانی ئەمڕۆ) بۆ باوەڕ رەت دەكاتەوە..

ئەوەی بۆ شێخی ئەلبانی نوسراوە (رەحمەتی) یان (رەحمەتی خوای لێ بێت) ئەوە من نوسیومە، چونكە ئەو كاتی، كە نوسەر ئەم كتێبەی نوسیوە، ئەلبانی رەحمەتی مەزن لە ژیاندا مابو ..

خوا پاداشتی نوسەرو وەرگێڕو بڵاوكاری بنوسێت و، هەروەها ئەو كەسەی، كە بە دەرس دەیڵێتەوەو لێی بڵاو دەكاتەوە .. ئامین ..

# ڕێڕەوی باس

نجم الدين فرج احمد

هەمو موسوڵمانێکی پابەند بە ئیسلامەکەیەوەو زۆر لە کەسانی تریش، وشەی سەلەفییان بیستوەو دەیبیستن وشتێکی هەر لێ دەزانن .. هەر نەبێ نەبێ ئەوە دەزانن، کە سەلەفی ئەو گەنجە موسوڵمانانەن، کە بایەخ بە یەکخواپەرستی دەدەن و دژی شیرکن و ناهێڵن خەڵك هاوار بۆ شێخ و مشایەخو شەخس و مەرقەدەکان ببەن. هەروەها بایەخیان زۆر بە پابەند بونە بە حەدیس و سوننەتی پاکی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، بۆیە لە ڕواڵەتیاندا نوێژیان وەك هی ئەوەو ـ گەر دەسەڵاتدارە تاغوتەکانیش لێیان گەڕێن ـ ریشی درێژ دەهێڵنەوەو سیواك بەکار دەهێنن، لە ئەحکامی شەرعیشدا شوێن مەزهەبێکی دیاری کراو ناکەون.. ئەوی لە نزیکیشەوە دەیانناسێت دەزانێت ئەمانە لەسەر ڕاوبۆچونی زانایانی پایەبەرزی ئەم سەردەمەن، وەکو شێخ محمد ناسروددینی ئەلبانی وبن باز ـ رحمەتیان لێ بێت ـ و زانایانی سەلەفی تر .

ناوی سەلەفێتی لە وشەی سەلەفەوە هاتوە، کە بە مانای پێشینە، بۆیە دەبینیت هەندێك لە سەلەفیە کوردەکانی سلێمانی و هەندێك لە کەلارو بادینان وشەی پێشینیان بۆ خۆیان و پێناسەی ڕێبازو بەرنامەو کەسایەتییەکانی خۆیان بە کار دەهێنا .. ئەمە لە روی زمانیەوەیە، بەڵام لە روی زاراوەوە، سەلەفی بەو کەسە دەڵێن، کە لەسەر ڕێبازو بەرنامەی سەلەف

دەڕوات، کە بریتین لە ئەسحابەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و تابعین (واتە نەوەی دوای ئەوان) و تابیعی تابیعین (واتە نەوەی سێهەمی دوای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وەکو چوار ئیمامەکەی ئەهلی سوننەت و ئیمامی ئەوزاعی ومەکحول و قەتادەو هەردوو سوفیانەکەو عەتائی کوڕی ئەبو رەباح و .. هەروەها ئەوانەش، کە لە سەردەمەکانی تردا لەسەر بەرنامەی ئەوان رۆیشتون، وەکو ئیمامی ئیبن تەیمییەو ئیبنول قەییم و ئیبنو رەجەب و ئیبنو کەثیر و ..هتد. چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مەتحی یاوەرانی خۆی و دو بە نەوەی دواتریشیانی فەرمو، کە یەکسەر بە دوایاندا دێن، بە حەدیسی خیر القرون، کە دەفەرموێ: (خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الذينَ يَلونَهُمْ ثُمَّ الذينَ يَلُونَهُمْ) الالباني/ الصحيحة، ژمارە ٦٩٩ .

بەلام ئەم وشەیە ـ وەکو هەر وشەیەکی تر کە لە قورئان و سوننەتدا بۆ ئەو مەبەستە بەکار نەهاتبێت ـ ئیختیلافاتێکی زۆری لەسەر دروست بوەو لانی کەم سەلەفیەکانی کردۆتە چوار بەش، هەر بەشێکیان دەڵێ: لەسەر ریوایەتی خەتەکەی ئیبنو مەسعودم !

هەر یەک دەڵێ: سەلەفی هەر خۆمم بەڵێ، کە من هاتم ئەتو هەڵێ !! کەس نازانێت ئەمیان بەچی چۆتە لوتکە ؟!

بە راست ئاوان، بۆیە کەوتونە ناو ناوان... بۆیە سەلەفێتی سەردەم، بۆتە هەورو هەڵاوو تەم.. لە هەمو رەوت و بزاڤێکی تر هەڵوەشاوترو گەڕەلاوژێترە.

بە هەر حاڵ بۆ خۆم زۆرم لێ پرسیون، لێک جوداودورم ناسیون ، بۆیە وەکو رێبازو دید لە چوارخانانەم پەستیون: سەلەفی حەق، سەلەفی زەق، سەلەفی دەق، سەلەفی لەق ..

ـ سەلەفی حەق: ئەوانەن کە باوەڕیان وایە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، کە وەسفی (الطائفة المنصورة)ی کردوە بەرنامەو کارکردنەکەشی

دیاری کـردوە. ئەمانـە باوەڕیـان بـە سـەلەفێتی جیهادی هەیـە. لەسـەر سیرەی عبداللەی کوڕی موبارەك دەڕۆن و باوەڕیان وایـە گێڕانـەوەی حـوکمی دیـن بـێ جیهاد ناکرێت لەمانەش: شێخ حمود العقلا و وئـیبن جـەبرین و عبدالله عـزام رەحمەتی خوایان لێ بێت، هەروەها عومەر عبدالرحمن و فیـزازی مـەغریبی و دکتۆر عبدالقادر عبدالعزیزو شێخ علی بن الحاج فَكَّ اللهُ اسْرَهُمْ...

**سـەلەفی زەق:** باوەڕیـان وایـە، کـە دەبێـت سـەلەفیەکانیش وەکـو ئیخـوان و ئەوانی تر، رێکخراوی سیاسیان هەبێت و بەشداری ژیـانی سیاسـی و گۆڕانکـاری دەسـتور بکـەن. ئەمانـە ئەوانـەن، کـە دەچـنە هەڵبژاردنـە سیاسـییەکانی وڵاتانیانـەوە. وەکـو سـەلەفیەکانی کوەیـت و پاکسـتان و سـودان، ناوداریشـیان ئیحسان ئیلاهی زەهیری رەحمەتی و شێخ عبدالرحمن عبدالخالقی کوەیتە ..

**سەلەفی دەق:** ئەو زانـاو تالیب عیلمانـەن، کـە بایـەخ هێنـدە بـە سیاسـەت و گۆڕانکاری و شەڕەپاڵی سیاسەت نادەن، هەر خەریکی بڵاوکردنەوەی ئەو عیلمە شەرعیانەن، کە زەرەری بۆ حکومەتەکان نییە. وەك هەندێك لایەنی تەوحیـدو زانیـاری حـەدیس و توێژینـەوەی کتـێبی زانایـانی کـۆن. باوەڕیشـیان وایـە، کـە پەروەردە کردن بەسە بۆ هێنانەوەی حوکمی شەرع! لەوانەش شێخی ئەلبانی و بن بازو بن عوسێمین ـ رحمهم الله ـ و زانایانی تری سعودیەو شێخ بدیع الدین سندی پاکستان و شێخ موقبیل الوادیعی یەمـەن و... هتـد. لـە راستـیدا ئەمانـە خۆیـان دوو پـۆلی تێـك ئـاڵاون: پۆلێکیـان چـاك حـەق دەناسـێت و چـاکیش دەزانێت عەقیدەی سەلەف چییەو چی داوا دەکات. بـەڵام لەبـەر ئـەوەی هـەر دوانزە عیلمەکەی کۆنە و هـیچ لـە واقیعـی ئـەم زەمانـە ئـاڵۆزە نازانێـت، خپـە. ئەوەی تریش زۆر لێزانەو قرو قەپە، خۆی لێ مت کـردوە! نـەبادا حکومـەتێك تورە کات!

**سەلەفی لـەق:** ئەمانـە كـە مەدخـەلی و جامیشیان پـێ دەڵێن، ئەوانـەن كـە موخابـەراتی وڵاتـان، بـە تایبـەتی هـی سعودیە (راستەوخۆ) و ئـەمریكی. لـە راستیدا ئەمانـە باڵی (دینـداری!) موخابـەراتی هـەمو حكومـەتێكن! دژی هـەر هـەمو كۆمەڵـە ئیسلامیەكانن. ئەمانـە هـەر كۆمـەڵێكی خواریـان دیبیـت، یـان بیستبێت سیفەتە دزێوەكەیان لێ وەرگرتوە! بۆ نمونە:

- لە غولاتی مورجیئە (مُسَمَّى الایمان).
- لە جەهمیە (مُسَمَّى الكفر).
- لە قادیانی (پەك خستنی جیهاد).
- لە ئەحباش (زمان درێژی).
- لە ئیخوان (تەعەسوبی حیزبی).
- لە زانایانی رەسمی حكومەتان (جوێ كردنەوەی دین لە دەوڵەت).

مـەلای مەشـهوری ئەمانــە، عبدالموحسـین عوبێكانــە.. ئیمـامی ئەوحــەدی دەورەو موستەشاری هەرە گەورەو ئەوەی بۆتە خاوەن پـاوەن، رەبیـع بـن هـادی المدخلییە..

ئەم كتێبە وەڵامێكی زانستیانەی (سەلەفی دەق) دەداتەوە، ئەدەب و رەفتـاری خۆشیان لەگەڵیانـدا رەچـاو دەكـات. موناقەشـەكە زیـاتر لەگـەڵ (شـیوخ)ی ئـەم تەوژمە سەلەفیەیە، بـە تایبـەتی شـێخی ئـەلبانی رەحمـەتی و محمـد ئـیبراهیم شـەقرەی ئـەردەن و (عـەلیلی حەلـەبی) عـەلی حەسـەن عـەلی ئەلحەلـەبی و هێندێكی تریان ... جا بۆ ئەوەی خوێنەر سود لە رای جوێی زانایان وەرگرێت، را پێچەوانەكانیشی بە ئەمانەتەوە لە خاوەنەكانیانـەوە هێنـاوە ـ تـا تـوانیبێتی تەئویلی باشی بۆ كردون ـ دادو ئینسافیش لای زانایانی ئیسلام وای خواستوە.. ئینجـا موناقەشـەی هەڵـەو راسـتییانی كـردوە. ئـەوەش بـە پێـی دابونـەریتی

زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەبێ وابێت .. ئیتر کێ بەڵگەی بەهێزتر بو ئەو لە پێشتر دەبێت.. نەك ئەوی عەمامەی گەورەترە، یان ریشی درێژترو پەرشوبڵاوترە، یان بە پێی بیدعەکەی ئیخوان پیری پیرانەو (اکبر الاعضاء سناً)ە!

کەوابو موناقەشەکەی ئێرە لەگەڵ داعیانی (سەلەفی دەق)ە، موناقەشەکەش لەسەر پێناسەی دوو زاراوەیە: پێناسەی باوەڕ، پێناسەی کوفر.. پاشان نوسەری رەحمەتی وەڵامی ئەو گومانانە دەداتەوە، کە بە پێناسەو پێکهاتەی باوەڕو کوفریانەوە چەسپاندوە. خۆزگە تەمەن و بواریش دەبو دەردەشەیەکیان لەسەر جیهادە بڤەکە لەگەڵدا بکەین، هەرچەندە لەوانەیە تێیدا وەکو کەڕی شایی بن.. هەرچەندە کە هەلی رەخساو لەبەر دەم دولایەنی موناقەشەکە دا وەك یەك نییە، ئەوان لە ژێر سێبەری دارودەستەی فیرعەونداو و شوێنیشیان گەرمەو معاشی وەزارەتی ناوخۆیان مسۆگەرەو لە هیچ پەکیان ناکەوێت! پیاوانی لایەنی ئێمەش راکردون، یان زیندانین، یان بێ ئازادین و ئەوی دەیڵێن لە ژێر شمشێری جەللاددایە، بەڵام ئەمە سیرەی ئیمامی شەعبی و سەعیدی کوڕی جوبەیرو دەیانی وەکو ئیبن تەیمییەو سەید قوتبی رەحمەتیە. لەگەڵ ئەوەشدا مەیدانیان پشت بە خوا بۆ چۆڵ ناکەین و ناهێڵین بەم دینەوە ببنە شایەری شایی عەلەمانی!

# چەند هەڵوێستەیەک[1]

## سەلەفی دەروێش!

ماوەیەکە سەلەفیەکان بە راست و چەپدا کەوتونەتە شمشێر وەشاندن، شمشێرێك لەو دەدەن، گورزێك بەم دەکێشن! تیرێك لەو دەگرن، مەنجەنیقێك بۆ ئەم دادەخەن و کۆمەڵێك درکەزی لە بەر پێی ئەوی تردا دادەنێن... ماشەڵا جوعبەیان پڕە. حکومەتەکەی (خادم الحرمین)و هاوسەنگەرانی ناهێڵن جوعبەیان خاڵی بێت. لێرە کتێب و لەولا شریت و لەملا تۆڕی ئینتەرنێت و لەولا کۆڕو دەرس و سیمینار و لە پشت هەموانیشەوە کەناڵی نوێی تەلەفزیۆن..

منیش هەرچەند سەیری کێشەکانیان دەکەم و بە دیققەت دەیانخوێنمەوەو ماڵپەڕیان تاوتوێ دەکەم هەنجەتێکی شەرعیم ناکەوێتە بەر دەست، تا بڵێم ئۆخەی ئەمە بەڵگەیەکی شەرعییەو ئەم قەومە داماوە ناهەقیان نییە وامان پێ دەکەن .. ئەمە پشتیان بەم دەلیلانە بەهێزە بۆیە وا دادگاییمان دەکەن و راپۆرتمان لەسەر دەنوسن و حکومەت و دەسەڵاتدارانمان لێ هان دەدەن.

لەگەڵ پۆلێکیان دەکەویتە موناقەشەوە، دەبینیت دورترین کەسن لە شێوازو رەفتارو دیالۆگی سەلەف! زۆر دیدو رەفتاریان هەر کتومت هی ئەهلی ئەهوائەو بۆیەیەکی سەلەفییان لە روکەشی دەرێی داوە. گەر کەسێك کەمێك زانستیانە لە خۆیان و بەرنامەو رێبازیان بکۆڵێتەوە، هەر زو بۆی دەردەکەوێت، کە ئەو لاف و گەزافەی لێی دەدەن، کە گوایە تەنها خۆیان لەسەر سیرەو بەرنامەی سەلەفن! زو فش دەبێتەوە، ئێمە مانانیش گەرچی الحمدلله زۆر لەوان رونتر و هۆشیارتر لەسەر بەرنامەی سەلەفی سالحی ئەم ئوممەتەین،

---

١ـ بە کەمێك دەسکارییەوە وەرگێڕراوە...

کەچی پێیان وایە ـ مادام پێڕی ئەوان نین ـ موبتەدیع وگومڕاو خەواریجین ... ئەوەی باشە کەس لە ئیسلامدا مافی ئەوەی نییە پسولەی لێبوردن (صکوك الغفران) مان پێ بفرۆشێت ..

ئەم برا سەلەفیانەمان لە زەقترین خاڵی عەقیدەدا جەهمین و دیدی مورجیئە وەکو جنۆکە خزاوەتە لەشیانەوە. بەڵام ئەوان، کە ماشاالله لە ئیخوان موتەعەسسیب ترن و لەوانیش حیزبی ترو لە کەرە حەنەفیەکان مێشك جەمان ترومولقەللیدترن ئەمە ناسەلمێنن! چونکە هەر لەسەرەتای موریدێتیانەوە فێر کراون، کە مەشخەڵی ڕێی سەلەفێتی، سێ قوتبن و دین لە غەیری ئەوان وەربگیررێت نوقسانە! نابینیت (الحَلَبي)، کە دەم هەراشێکیانە ڕای زانایان ئەلبانی و ابن بازو ابن عوسێمین دەکاتە کۆڕا (ئیجماع) و دەربارەیان دەڵێ: (انَّ مشايخنا الاجِلَّةَ هؤلاءِ الثلاثة هم نجومُ الهُدى ورجومُ العِدَى مَنْ تَمسَّكَ بِغَرْزِهِم فهو النَّاجِي ومَنْ نَاوَأهم وحاداهم فهو المُظلِمُ الداجي) التحذير من فتنة التكفير ل٣٩ واتە: ئەو سێ شێخە بەڕێزو پایەدارەمان ئەستێرەی ڕێنمایی و بەردی بەردەبارانی دوژمنن. هەر کەس دەست لەو سنگە قایم کات، کە ئەوان چەقاندویانە ئەوە سەرفرازو سەرکەوتوە. هەر کەسێکیش بەرهەڵستیان بکات و دژیان بوەستێتەوە ئەوە لە تاریکی شەوەزەنگدایە ..لە کاتێکدا، کە لە بەڵگەنەویستەکانی اصول الفقە ئەوەیە کە کۆڕا (ئیجماع) وەکو ئیمامی شەوکانی لە (ارشاد الفحول ل١٣١) دا دەڵێ: (هو اتفاقُ مجتهدي أمةِ محمد صلى الله عليه وسلم بعدَ وفاته في عصرٍ من الاعصار على أمرٍ مِن الامورِ ) بۆیە زانایان دەڵێن: ئەگەر ڕاجوێیی (الاختلاف) لە یەك زاناشەوە دەرکەوت کۆڕا نامێنێت ئیمامی ابن تیمیەش رحمه الله لە مجموع الفتاوى ٢١٦/٣ دا دەڵێ: (فمَن جعلَ شخصاً من الاشخاصِ غير رسولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم مَن أحبَّهُ ووافقَهُ كان من أهل السنة والجماعة، ومن خالفهُ كان من اهلِ البدعةِ والفُرقةِ. كما يوجد ذلك في الطوائف من اتباعِ أئمةِ الكلام في الدين ) دیققەت بدە دەڵێ أهل

السنة والجماعة، کەچی سەلەفییەکان لەم ناوە شەرعیەوە بازیان داوە بۆ سەلەفێتیەکەی خۆیان! ئەمە هەر تەعەسسوبەکەیەو ئەوانیشی وەکو ئیخوان و کەرە مەزهەبییەکان کوێر کردوە[١]..

ئیمامی ئیبنولجەوزی رحمە اللە لە کتێبی (تلبیس ابلیس دا ل١٠١) دەڵێ: بزانە کە شوێنکەوتوی مەزهەبەکان، کەسایەتی مەزهەبەکانی خۆیان زۆر لە دڵ و دەروندا لا گەورەترە وەك لە کەسانی تر، بۆیە بێ بیر کردنەوەو تێفکرین شوێن قسەکانیان دەکەون. ئەمەش عەینی گومڕاییە .چونکە دەبێت سەیری قسە بکرێت، نەك سەیری ئەو کەسەی وتویێتی. هەر وەکو سەییدنا عەلی کوڕی ئەبو تالیب بە حاریسی کوڕی ئەحوەتی فەرمو: (یا حارِثُ انه مَلبوسٌ عَلَیكَ إنَّ الحَقَّ لا یُعْرَفُ بالرِّجَالِ، إعرفْ الحقَّ تَعْرِفُ اهْلَهُ) واتە: هۆ حارس لێت تێکچوە.. حەق بە خەڵکدا ناناسرێتەوە، حەق بزانە حەقناسان دەناسیتەوە .. سەلەفیەکان لە بلاو کردنەوەی حەقدا بە تایبەتی لە باسی (کوفروباوەڕ) دا نارەحەت دەبن! چونکە پینەچێتییەکەیان کەشف دەکات، کە بۆ دەسەڵاتدارە کافرەکانی دەکەن! بۆیە خۆیان زۆر بایەخ بەم مەسەلە دژوارە گرنگە نادەن، نەبادا رایانکێشێتە نێو باسی (کفر الحکام وشرعیة الخروج علیهم)! بۆیە کە تالیب عیلمێکی خۆیان دەربارەی ئەم باسە سەرەکیانەی باوەڕ لێیان دەپرسن، هەر زو بەوە دەمکوتی دەکەن، کە ئەمە باسێکی زۆر تولانی و دژوارو پڕ هەڵدێرو باشتر وایە (جارێ) وازی لێبهێنرێت! گوێ لە ئیبراهیم

---

١ـ پێم وایە نوسەری رەحمەتی لەمەدا بە سەهوودا چووبێت، چونکە سەلەفیەکان پێیان خۆشە هەر پێیان بووترێت سەلەف .. بەڵام ئەوە بزانین، کە زانایانی ئەهلی سووننەت و جەماعەت زاراوەی (سەلەف)، یان لە بەرامبەر مورجیئەدا بەکار دەهێنا .. دەبوو سەلەفیەکان زاراوەی ئەهلی سووننەت و جەماعەتیان زیاتر بەکار بهێنایە، چونکە لە ناو زانایانی سەلەفدا بەناوبانگتربووەو، زۆرینەیان هەر ئەویان بەکار هێناوە، بەڵام دیارە سەلەفیەکانی بەر سایەی حکومەتەکانی ئەمڕۆ نایانەوێت پێیان بووترێت ئەهلی سووننەت و جەماعەت، نەبادا لە بەرامبەر شیعە بەکار بهێنرێن .. چونکە ئەمان کراونەتە خۆرکە، تا کیانی سوونی هەڵکۆڵن و وەکو مۆریانە بمانخەنە خورو، تا لە جیاتی دوژمنانی ئیسلام بە خۆیانەوە مەشغوولمان کەن. (وەرگێر).

شەقرەيان بگرە، كە شێخى گەورەى سەلەفييەكانى ئەردەنەو هاوڕێى سەددام بو، لە كاسێتى (ثلاث مسائل مهمة) دا چۆن كێشەى كوفرو باوەڕ هێندە ناسك دەكاتەوەو، بەرهەمەكەشى بە كەم بايەخ دەداتە قەڵەم! ببيستە چۆن بەو ئەحكامە شەرعيانەى لەسەر كوفرو باوەڕ بنيات دەنرێن دەڵێت: (خيالية في عصرنا هذا) خۆ ئاشكرايە ئەمە تانەيەكى گەورەيە، كە جەنابى شێخى سەلەفى ئاخر زەمان لە دينەكەى دەدات. ئەمما لاى ئەهلى سوننەت ئەوە بەردى بناغەى دينە .. ئيمامى ئيبنوتەيمييە لە (مجموع الفتاوي ١٢/٢٥١) دا دەڵێ: (بزانە كە باسەكانى باوەڕ باسى ئەو ناوو سيفەتانەن، كە بەڵێن و هەڕەشەى دوارۆژو دۆستايەتى و دوژمنداريتى ـــ الولاء والبراء ـ وكوشتن وحەرام وحەلاڵى خوێنيان لە دنيادا پێوە بەندە. خواى گەورە بەڵێنى بەهەشتى بە موسوڵمانان لەسەر خۆى فەرز كردوە، هەر وەكو، كە دۆزەخى بۆ كافران بڕيار داوە. ئەمانەش ئەحكامى كوللين و بۆ هەمو كات و شوێنێكن .. ) هەروەها لە (٣٩٥/٧)دا دەڵێ: (هەڵە كردن لە ناوى باوەڕدا نە وەكو هەڵە كردنە لە ناوێكى داهێنراو (مُحْدَث) داو، نە وەكو هەڵە كردنيشە لە ناو باسى تردا، چونكە ئەحكامى شەرعى دنياو رۆژى دنياو ئاخيرەت لەسەر هەڵوێست رادەوەستێت).

شێخ عبد الله بن الشيخ محمد بن عبدالوهاب رحمهم الله لە كتێبى(الدرر السنية في الاجوبة النجدية ١١٨/٨) دا دەڵێ: (بزانە كە ئەم مەسەلانە لەو باسە گرنگانەن، كە دەبێت موسوڵمان زۆر بايەخيان پێ بدات، نەبادا بە بێ ئاگايى بكەوێتە نێو يەكێكيانەوە، تا سنورەكانى كوفرو باوەڕى لا ديار بن. تا هەڵەو راست لێك هەڵاوێرێت. تا لە وەرگرتنى دينەكەيدا بەرچاو رون بێت و بە قسەى لوسى ئەهلى گومان و نەفامى، هەڵ نەخەڵەتێت، با ئەوانە زۆرتريش بن).

با جارێ ئەوەندە بەس بێت، خوا يار بێت بەدورو درێژتر دێينەوە سەر ئەم سيفەتە ناقۆڵانەيان.

# ئەم سەلەفێتییە زەرەری بۆ پەزەکان نییە !

وتیان فەقێیەك ڕێی کەوتە گوندێکی دور، بینی نە مزگەوتی تێدایە، نە مەلایان هەیە، نە هیچیش لە دینەکە دەزانن.. ئەوانەی کۆکردار، کە نوێژ دەزانن وپێی وتن: ئێوە دەبێ نوێژەکانتان بە کۆمەڵ بکەن وجومعەو جەماعەتتان هەبێت.. فێری بانگی کردن. کە خۆی بانگیدا، ئاغای گوند هاواری کرد:

- ئەو دەنگە چییە ؟!

+ وتیان: قوربان گیان، بانگە..

- وتی: بانگ چییە ؟

+ وتیان: قوربان گیان هاوارێکەو دەیکەن، تا هەمو بچنە جێیەك و نوێژەکەیان بە جەماعەت بکەن...

- بانگ زەرەری بۆ پەزەکان (مەڕەکان) نییە؟!

+ قوربان گیان، نەخێر..

- دەبا هەر بانگ بدەن ..

حاڵی ئەم برا سەلەفییانەش لەگەڵ حکومەتاندا وایە! حکومەت ئاغا دەپرسێ: ئەوە باسی چی دەکەن ؟!

+ دەڵێن قوربان گیان هەر باسی خوای گەورە دەکەن، کە لە ئاسمانەو دەڵێن هەر ئەو دەبێت بپەرسترێت و..

حکومەت ئاغا سەبری نەبو رستەکە تەواوکەن قسەکەی پێبڕین:

- دەربارەی حکومەت چی دەڵێن؟!

+ قوربان گیان، دەڵێن: حکومەت سێبەری خوایە لەسەر زەوی و، پیاوانی حکومەت وەلی ئەمرن و، نابێت بێ ئەوان فەرمان بە چاکەو بەرهەڵستی لە خراپەش بکرێت. هەڵس و کەوتی رەعییەت دەبێ بە مۆڵەتی حکومەت بێت ..

- ئێ ئێ دەمخۆش، لەم قسانەم پێ خۆشە ئەدی دەربارەی سیاسەت و ئابوری و نەوت وململانێی چینایەتی وسەروەت وسامان چی دەڵێن؟

- قوربان گیان، هیچ !

حکومەت ئاغا لە خۆشیاندا بە دەم گەشکە گرتنەوە وتی: بە راستی رەعیەتی چاکن ... دەی مادام زەرەریان بۆ بیرە نەوتەکان نییە با هەر موەحەید بن !!!

لای هەر سەلەفییەك باسی کوفرو بێ دینی ئەم حکومەتانەی وڵاتانی ئیسلام دەکەیت، تایان لێ دێت. کە باسی بارودۆخی سیاسی موسوڵمانان وئەم لێقەومانە شارستانێتی وشەڕە سەلیبییە دەکەیت، دەتخۆن. کە باسی ئەم ملیۆنەها داماوە دەکەیت، کە قوتیان دەدزرێت، یەکسەر دەڵێن: ئەمە سزای خوایە، چونکە ئەو خەڵکە لە حاکمەکان هەڵگەڕاونەتەوەو توشی فیتنە بون!! خێرا راپۆرتێکیشت لێ دەدەن!!

چونکە خۆیان جێیان گەرمەو یەکی سێ چوار ژنیان هەیەو، لەبەر بۆنی بوغوردا مەڕی ساغی سورەوە کراوی ناو فڕنی ئەمریکایی عافێت دەکەن و، نابیناش دەعوەتی ئەم ئەمیرو ئەو وەلی عەهدو ئەو بەرپرسی حکومیین، بۆ بانگەوازی خواییش بە ئۆڤەر تایم بە نامیلکەیەکدا لەسەر (شرح كتاب التوحيد) دا دەچنەوەو کە دێشنە گۆ، شەکرە قسەی وا فڕێ دەدەن هەر بۆنی کوفری سوتاوی لێ دێت.

محمد ابراهيم شەقرەی شێخی سەلەفییەکانی ئەردەن ، ئەوەی کە نامەی بۆ سەددام حوسێن نوسی و تێیدا دەیگوت: الى الطودِ الشامخ والجبَلِ الراسخ صدام

حسين وقَاهُ الله شرَّ حاسِديهِ [1]. ئەوجا باسی فرمێسکەکانی سەددام دەکات کە لە (عينَي النِّمْرِ القويتَينِ ) دوچاوی بەهێزی پڵنگەوە هاتبونە خوار!

ئەم پیاوە (راستتر بڵێین: ئەم نێرینەیە) ئەم شەریکە (راستتر بڵێین: ئەم فەریکە تەریکە یان ئەم ئەقڵ سوکە مەتروکە)[2] کتێبێکی هەیە بە ناوی (هي السلفية نسبة وعقيدة ومنهجا) لە ل ١٧٢ دا ئاوا دەڕشێتەوە:

(وأحسَبُ أنَّ مَقولَةَ دَعْ ما لِقَيصَرَ لِقَيصَرَ ومَا للهِ للهِ كَلِمَةٌ تَصْلُحُ لِزَمَانِنَا)

واتە: وا دەزانم ئەو قسەیەی کە دەڵێ: ئەوی هی قەیسەرە بیدە بە قەیسەرو ئەوەی هی خوایە بیدە بە خوا، بۆ ئەم سەردەمەی ئێمە شیاو بێت !!

دەبێ کوێی ئەم قسەیە بۆ کام زەمانەو بۆ چ قەومێك چاك بێت ؟! چ جای

---

١ـ سەرەتای نامەکەی ئاوایە : من محمّد بن إبراهيم شقرة إلى أخيه درع العراق الحصينة، وطوده الباذخ الشّامخ الرئيس صدام حسين وقاه الله شر حاسديه، وحقّق على يديه للأمّة ما هي راجية فيه، وأكرمه في أخراه، كما أعزّه في دنياه...

الكلمة عندك (عند صدّام حسين) ليست حروفاً متآلفة تجانست بحركاتها وترتيبها لتدلّ على معنى من معاني لغات الناس، وإن كانت هي في ذاتها آية من آيات الله في خلقه {ومن آياته خلق السموات والأرض واختلاف ألسنتكم وألوانكم} بل هي عندك حمم حارقة يرسلها قلب بغداد الرحيم الشّفيق على الباطل المتغطرس، فإذا هو بها زاهق"... :أنت أبا عدي (صدام) أحد الأفذاذ الذين ينتسبون إليها بصدق وولاء (لكلمة التوحيد)، هذا ظنّنا فيك، ولن يخيب إن شاء الله" ... : "حتى كانت القادسيّة الجديدة، وكان فارسها السديد الأبيد (أي صدام) وقمت على أرض الرافدين طوداً شامخاً، وتداعى العراقيون إليك أطواداً أطواداً، وألقت المجوسية بكل أثقالها) الجرح والتعديل (٧٤–٧٥) .

٢ـ شێخ محمدی مەقدیسی خوا ئازادی کات لە پێشەکی کتێبەکەی مەراکیشیدا نوسیویەتی، کە ئەبومالیك محمد ئیبراهیم شەقرەی پێشەوای سەلەفیەکانی بەر سێبەروپاڵانتەوانانی سەلەفی ئەردەن، ئێستا خوا هیدایەتی ڕێی راستی داوەو ڕێی عەقیدەی پێغەمبەرانی گرتووەو سنوری کوفرو ئیمانی لێك هەڵاوێردووە. مەقدیسی دەڵێ ئەبو مالیك ئێستا ئەو ئەبومالیکەی جاران نەماوە، کە ئەو قسانەی لەسەر دەکرا، چونکە ئێستا هەر هەڵوێستێکی کۆنی دەخرێتەوە پێش چاو، بە تەوازوعی خۆیەوە دەڵێ: هەڵە بووم.. تەنانەت لە ڕەتدانەوەی سامیدا لە شریتی (الكفر كفران) دا دەڵێ : منیش و شێخ ناسری ئەلبانی هەڵە بووین و سامی لەسەر حەق بوو.. یان دەربارەی ئەم ووشەو عیبارەتە توندو تیژانەی مەراکیشی ڕەحمەتی بە شەقرەی دەڵێ، مەقدیسی دەڵێ : کە بە ئەبومالیك (محمد ئیبراهیم شەقرە) م ووتەوەو ووتم: لەژێر ئەشکەنجەدا گیانی سپاردووە فەرمووی: بە هەر حاڵ خوا لێمان خۆش بێت.. خوا ڕوحمی پێ بکات ،مەتحی کردو گوتی: شایانی دوعا بۆ کردنە ..

ئەوەی بوترێت بۆ ئوممەتەكەی محمد صلى الله علیه وسلم شیاوە! والله ئەگەر خراپیەكەی هەر ئەوەندەش بیت، كە ناوی قەیسەری موشریكی تێدا خراوەتە پێش ناوی پیرۆزی خوای گەورەوە، بەس بو بۆ تۆمەتبار كردنی! جگە لەو شیرك وبێ ئەدەبییەی لە خۆی گرتوە .

كە دێتە سەر باسی فەرمان بەچاكەو بەرهەڵستی لە خراپەو جیهاد دەڵێ: (النهي عن المُنْكَرِ السياسي هو جزءٌ مِن الجهادِ بالبيانِ الذي نَقومُ بِهِ) مەبەستیشی دژایەتی كردنەكەی شێخ سەلمان العودەو شێخ سەفەر الحوالییە .. كە جیهادیان بە زمان دەكرد ..

بزانە ئەمانە پەنا بە خوا پێیان چۆن هەڵخلیسكاوە؟ چۆن مەتحی سەددام بە خواپەرستی دەزانن و دژایەتی كردنی داعییە ئیسلامییەكان بە جیهاد دەزانن! ئەمانە روی قادیانییان سپی كرد.

ئەو جیهادەش كە ئەوان پەكیان خستوەو سەدو یەك ئینحیرافیان پێ كردوە، باش بو كاكەی شەقرە رێگاو رای هەموو هاولەگەنانی بۆ كۆ كردوینەتەوەو هێندەی مەرجی (نا شەرعی) و(باتڵ) وقورسی لە رێی جیهاددا قوت كردۆتەوە، لەوانەی لە پەیامی خوای گەورەدا نین[1] ئینجا ئەوەندەی خڵتەی بیرو تڵپەی قیری تری كردوە بەسەریدا، مەگەر چەند كەسانێكی ئەهلی ( الطائفة المنصورة ) بۆ ماوەیەكی تەواو هەر خەریكی رادانی بن !![2] بەوەی

---

١ـ خاتوو عائیشە ـ خوا لێی رازی بێت ـ دەڵێ: قام رسول الله ( صلى الله علیه وسلم ) في الناس فحمد الله وأثنى عليه، ثم قال : (مَا بالُ رِجَالٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطاً ليسَتْ فِي كِتابِ الله عَزَّوجَلَّ، مَا كانَ مِنْ شَرْطٍ ليسَ فِي كِتابِ الله فهوَ باطِلٌ، وإنْ كانَ مائَةُ شَرْطٍ ) رواه البخاري / الصلاة (٤٥٦ ) وابو داود/ العتاق ( ٣٩٢٩ ) والترمذي / الوصايا ( ٢١٢٤ ) والنسائي / البيوع ( ٤٦١٨ ) وابن ماجة / العتق ( ٢٥٢١ ) واحمد ٦/٨١ـ٨٢ ) ..

٢ـ ئیمامی شەوكانی ـ رحمه الله ـ دەفەرموێ : ئیمامی بوخاری و موسلیم لە حەدیسی موغیرەی كوڕی شوعبەوە لە پێغەمبەرەوە(صلى الله علیەوسلم) گێڕاویانەتەوە، كە فەرموویەتی: (لا تَزالُ طائفةٌ مِنْ أُمَّتي ظاهرينَ حَتى يأتيَهُمْ أمرُ اللهِ وهم ظاهرونَ) واتە: تاقمێك لە ئوممەتەكەم لەناو خەڵكیدا بە حەقناسی ئاشكرایی دەمێننەوە، تا ئەو زەمانەی سەركەوتنیان بۆ دێت هەروا دیار دەبن .. پاشان

باشە شەقراغا جوان وەسفی دیدی خۆی و هاولەگەنانی خۆی دەكات و زۆر ئاشكرایانە غیرەتی سەلەفییەكانمان پێ دەناسێنیت .. لە لاپەڕە ٢٠٤ ی هەمان كتێبدا ئاوا بەسەر جیهادەكەدا دەڕشێتەوە (وَلَك أنْ تَستقرِئَ الايات الـتي جـاءَتْ مُكَمِّلَةً لِايَةِ الأمْرِ بالإعدادِ وَمُوَضِّحَةً! لِتَعْلَمِ أنَّ أفْضَلَ الجِهادِ اليومَ ـ فِي وَهْنِنا الذي نَحـنُ فيـهِ ـ هـو الإمْسَـاكُ عَـن الجِهـادِ) واتـە: دەتوانیـت هەمو ئایەتـەكانی تـر بهێنیتەوە كە هەمویان ڕۆشن كەرەوەی ئەم ئایەتی خۆ ئامادەكردنەن، تا ئـەوە فێـر بیـت وبزانیـت، كـە باشـترین جیهـاد لـەمڕۆژەدا ـ كـە لـە لاوازی وبـێ دەسەلاتیداین ـ بریتیە لە خۆگرتنـەوە لـە جیهادكردن.. دەڵێ: ئایەتـەكانی تـر (كـــە ١٢٢ ئایــــەتی تــــرن) ئـــەو ئایـــەتی ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٍ﴾الانفال/ ٦٠ تـەواو دەكـەن و ڕاڤـەی دەكـەن، كـە هـۆ موسـوڵمانینە جیهاد مەكەن!

ئاخر ئەگەر ئەو ئایەتە داوای هـیچ نـەكات غـەیری فـەرمان بـە خـۆ ئامـادە كردن (الاعــداد) بەس بو. چ جای ڕاڤەی پێغەمبـەر صلى الله علیە وسـلم، كە لەسەر مینبەر سێ جار فەرموی: (ألَا إنَّ القوةَ الرَّمي) رواه مسلم عن عقبة .

ئینجا گوێی لێ بگرە دەربـارەی ئـەو (ئایـەتی ١٧٤ی الاعـراف)ە چۆن دەدوێ:

---

ئەمەی، كە فەرمووی فەرمانی خوایەو بۆیان دێت، ئەوەی كـە پێـوەی دەناسـرێنەوەو پێـی زاڵ دەبـن، هەر ئەو كارەیە كە ئیمامی موسلیم لە حەدیسە مەرفوعەكەی عوقبەوە گێڕاویتیەوە، كە پێغەمبەرصلى الله علیه وسلم فەرموویەتی : (لا تَزَالُ عصَابَةٌ منْ أمَّتي يُقَاتلُونَ عن أمْر الله قَاهرينَ لعَدُوِّهمْ لا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى تَأْتِيَهُمْ السَّاعَةُ وَهُمْ عَلَى ذلكَ) واتە: تاقمێك لە ئوممەتەكەم (لە نێوان چل و پەنجا كەسدا) لەبەرگریی ئەم دینەدا كوشتار دەكەن، دیارو ئاشكرای ناو خەڵكن، تا ئەو كاتەی سەركەوتنیان بۆ دێت هـەروا بـە ئاشـكرایی دەمێننـەوە .. بڕوانـە كتـێبی (ارشـاد الفحـول لا ١٤٢ ـ ١٤٣) سـەرنج دە ئـەم لێكدانەوەی شەوكانی ڕەحمەتی، چونكە چەكوشی تەپڵی سەری مەدخەلی نەگبەت و سەلەفییانی بەر سێبەرە .. بۆ زیاتر حاڵی بوون لە سیفەتەكانی ئەو كۆمەڵە پێشڕەوەی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم ناوی ناون (الطائفة المنصورة) بڕوانە كتێبەكەی عبدالقادر بن عبدالعزیز: العمده فى اعـداد العـده چاپی دووەم ١٤١٠ / ١٩٩٠ لا ٧٢ ـ ٨٢. یان كتێبی (الطائفة المنصورة)ەكەی ئەبو بەصیر ..

(ومَنْ أمْعَنَ النَّظَرَ فِي هذا النَّصِ يَرى أنَّهُ يَكادُ يَنْطقُ بِوجوبِ الإمساكِ عن الجهادِ حتَّى يَكونَ الإعدادُ علَى تَمَامِهِ! وقَدْ يَكونُ مِن الاعدادِ تَرْكُ الإعدادِ، إذْ الإعدادُ يُقصَدُ بِهِ إرهابُ أعداءِ اللهِ) ل ٢٠٣ واتە: ئەوی بە دیققەت سەرنج بداتە ئەم دەقە، بۆی ڕون دەبێتەوە، كە خەریكە دەقەكە خۆی هاوار كات، كە پێویستە جیهاد نەكرێت، تا ئەو كاتەی خۆئامادە كردنەكە تەواو دەبێت! لەوانەشە واز هێنان لە خۆ ئامادە كردن، هەر خۆی لە خۆیدا، خۆ ئامادە كردن بێت!! چونكە مەبەست لە خۆ ئامادەكردن ترساندنی دوژمنانی خوایە ..

سوبحانەالله تو خوا جیاوازی ئەمەو قادیانی چییە؟

ئەمە لە پێناوی چیدا نەعلی حكومەتان بە لچ و لێو بۆیاخ دەكەن و پۆستاڵی جەللادان بە زمان دەبریسكێننەوە ؟!

بۆچی ئەم دینە دەكەنە أفیون الشعوب ؟! خوا خەجاڵەتیان كات ؟

لە پێناوی چیدا بە هەمو داعیەكی پاك و موجاهیدیكی چاك قسە دەكەن؟!

سەیری تەفسیری ئەو بۆ ئەم ئایەتەو تەفسیری (ابن كثیر ٢/٥٠٣ ) بكە، كە خوای گەورە دەفەرموێ: (وأعِدُّوا لهَم ما اسْتَطَعْتُم. أي مَهمَا أمْكَنَكُم) واتە: هەرچەندی دەتوانن...

ئەمانە مریشكی مەسڵەحەن، تەنانەت ناتوانن بشفرن، كێ ویستی بیانگرێت سەریان بڕێت! بێ دەنگ دەبن...

جیهاد، كە لوتكەی جوامێرییە، كەی شایستەی ئەوانەیە؟ جا ئەگەر جیهاد هێندە قورس و ناڕەحەت نەبوایە دەبوە مەزاقی شەوارەی دەوری زەیستان.

جیهاد ئاگری بە تینی زێڕینگەرە. هەرچی خڵتەو پڵتەیەك بەم ئیسلامەوە نوسا بێت؛ لێی دەكاتەوەو رایدەدات. جیهاد ماددەی تاقی كردنەوەی دینداریيە.. كەی لەگەڵ هەڵوێستی شەقرەو هاو رایانیدا تێك هەڵ دێنەوە.

بڕوانــە ئیمـامی ئیبنولقـەییم (رحمـه اللـه) کـە سـاڵی ٧٥١ ی مـردوە، چـی دەربارەی ئەو جیهادە رووەو شەقرە ئاساکانی زەمـانی خـۆی گوتـوە: (یـا مُخَنَّـثَ العَزْمِ أينَ أنتَ والطريق ؟!).

واتە: تۆ لە کوێ و ئەم رێگایە لە کوێ ؟!

بە زمانی زەمانی ئێمەی کوردیش دەبێ بڵێین: تۆو جیهاد کوجا مەرحەبا ..

ئینجا ئیمامی ئیبنول قەییمی رەحمەتی دەڵێ:

(طريقٌ تَعِبَ فيهِ آدمُ، وناحَ لأجلهِ نوح، ورُمِيَ في النـار الخليـلُ واضْـطُجِعَ للـذَّبح إسماعيلُ، وبِيعَ يوسفُ بثَمَنٍ بَخسٍ ولَبِثَ في السجنِ بِضْعَ سنينَ، ونُشِرَ بالمنشارِ زكريـا، وذُبِحَ السيدُ الحصورُ يحيى، وقاسَى الضُرَّ أيوب، وزادَ على المقدار بكاءُ داودَ، وسارَ مع الوحشِ عيسى، وعالَجَ الفقرَ وأنواعَ الاذى محمدٌ صلى الله عليه وسلم تَزها أنت باللهو واللعبِ ) الفوائد /٥٦ واتە: رێی جیهاد رێگایەکە ئادەمی تێدا ماندو بو، نـوح لـە تاویدا هاواری لێهەستاو ناڵاندی، ئیبراهیمی هاوڕێی خوایان لەسەر فڕێدایە نێو کڵپەی ئاگر، ئیسماعیل هەر لەو پێناوەدا بۆ سەربڕین پاڵ خرا، یوسفییان نـاوا بە نرخێکی بێ بـەها فرۆشـت ولـە زینـدانـدا چـەندین سـاڵ بـۆی مایـەوە، ئـەو رێیەی زەکەرییای تێدا بـە مشار بڕرایـەوە، یـەحیای بـەرێزی تێـدا سـەر بـڕاو، ئـەییوب لـە قۆناغەکانیـدا ناسـۆری چێشـت و داود لـە حـەددی ئاسـایی زیـاتر فرمێسکی بـۆ رشـت، ئـەو رێیـەی عیسـا بـۆی بـوە هـاودەنگی دڕنـدان و دەردی هەژاریی خەڵکی پێ دەرمان دەکرد، ئەوەی کە محمد ـ سەلامی خوای لێ بێـت ـ ئـەو هـەمو جۆرە ناسـۆرو میحنەتـەی لـە پێناویـدا چێشـت !! تـۆش، خـەریکی کاڵەمستێنەی خۆتی.

ئەم شەقرانە چۆن وەڵامی خوای گەورە دەدەنەوە؟ دەڵێن خوایە لەو هـەمو ئایەتانـەی باسـی بـەردەوام بـونی جیهـاد دەکـەن، حـاڵی نـەبو بـوین؟! مەگـەر خوای گەورەو زانا پێیان نافەرموێ: درۆتان کرد.. گەر جیهادەکەتان ـ لەبەر بێ

توانـــایی ــ واز لێهێنـــان بـــو، ئـــەدی ئیعدادەکـــە هـــەر بـــە فـــەرزی لەســـەرتان نەمابۆوە؟!!

ئیمامی ئیبنوتەیمییە رحمەالله دەڵێ: (يجبُ الاستعدادُ للجهادِ بإعـدادِ القـوَّةِ ورِباطِ الخَيلِ في وقتِ سُقُوطِهِ لِلْعَجْزِ، فإنَّ مَا لا يَتِمُّ الواجِبُ إلَّا بِهِ فَهوَ واجِبٌ ) مجموع الفتـــاوى ٢٨/٢٥٩. واتـــە: هـــەر لـــەو کاتـــەوە کـــە جیهادەکـــە بـــە هـــۆی لاوازیـــەوە لەسەر موسوڵمانان نامێنێت، خۆ ئامادەکردنەکە[١] لەسەریان فەرز دەبێتەوە ..

ئیمامی سـەنعانیش لـە کتـێبی (سُـبُلُ السَّـلام ٣٨٤/٤) دا لـە راڤـەی حەدیسـی ژمارە (١٢٣٦) دا دەڵێ: (الاعدادُ يكونُ معَ الاعتيـادِ .. مَـنْ لَـمْ يُحْسِـنْ الرَّمـيَ لا يُسَمَّى مُعِدًّا لِلْقُوةِ) واتە: خـۆ ئامـادە کـردن، بـە مەشـق و خـۆ راهێنـان دەبێـت.. ئەوی تفەنگچی چاك نەبێت، پێی ناوترێت ئامادەباش.

ئـەم تێگەیشـتنەی سـەلەف و خەلـەف لـە کـوێ و، ئـەو تێگەیشـتنە لینگـەو قوچەی شێخی ئاخر زەمانی سەلەفێتی دوکانداریێتی حاکمەکان لە کوێ؟!

---

١ـ ئامادەکردنی هێزی پیاوو چەك و پارە. وەکو کە ئایەتەکەی سورەتی ئەنفال: (وَأَعِدُّوا لَهُمْ) داوا دەکات... ( وەرگێڕ) .

# ناسکە سەلەفی گوڵ بە دەم !

لە ڕێزمانی کوردیدا دەمانخوێند کە (خەیاری گوڵ بە دەم ناسکە)

نازانم بۆچی هەر، کە ئەم سەلەفیە داماوانە دەبینم، ئەو دێڕە ڕێزمانیەم دێتەوە یاد.. ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت، کە بانگەوازی بەر سێبەری تاغوتان، کە ئەم جۆرە سەلەفییە ناسکانە مومارەسەی دەکەن، لە دروشمی (الجهاد سبيلنا)کەی ئیخوان، تەڕو بەل ترە..

ئیخوان دەڵێن ئەگەر هەفتانە سێ ئایەتی سورەتی قاف وحەدیسێکی الاربعين النوويه و لاپەڕەیەکی (فقه السيرة‌ی بوطي) و دوو لاپەڕەی کتێبێکی (فەتحی یەکن)ت خوێند، ئەوە باشترین ئیعدادت کردوەو حەتمەن حوکمی ئیسلامی پێ دێتەوە!

(غازی التوبە) کە بیرمەندێکی فەلەستینیە دەیوت بیست و پێنج ساڵ ئیخوان بوم (لە سوریا) کە دەمپرسی: ( ئەرێ نەگەیشتینە (الجهاد سبيلنا) ؟ دەیانوت: نا هێشتا ئێمە واین لە وەرگرتن و چەسپاندنی دروشمی (الله غايتنا و الرسول زعيمنا)! خۆ ئەم دوو دروشمە هەر شایەتمانەکەی ئیسلامە، نەك دروشمی ئەوان. بە داخەوە دوای بیست وپێنج ساڵی ڕیزی ئیخوانچێتی، ئیتر بێ ئومێد لە دەرکەوتنی دروشمی (الجهاد سبيلنا) وازم هێنا... بەڵام دوای ئەوەی هەمو گەنجێتیەکەمم بەو هیوایەوە بەرێ کرد) !!

ئەم کۆلکە سەلەفییانەش ـ کە لە ئیخوانی میسر حیزبی ترن ـ کە ڕاسترە بڵێین ئەم گۆلکە سەلەفیانە ـ دەڵێن: (دَعْ مَا لِقَيصَرَ لِقيصرَ ومَا للهِ للهِ كَلمةٌ تَصْلُحُ لِزَمانِنا) کتێبەکەی الشقرة / هي السلفية ل/١٧٢ واتە: کە دەڵێ: (ئەوی هی قەیسەری حاکمی ڕۆمایە) هەر بۆ قەیسەر خۆیی لێ گەڕێ و ئەوی بۆ خواشە هەر بۆ خوای لێ گەڕێ، ئەمە قەولێکە بۆ زەمانی ئێمەش شیاوە .. هەروەها لە ل/٢٠٣ دا دەڵێت: (وجوبُ الامْساكِ عَن الجهادِ حتى يكونَ الإعدادُ على

تَمَامِهِ. وَقَدْ يَكونُ مِنْ الاعدادِ تَرِكُ الاعدادِ ، إذ الإعدادُ يُقْصَدُ بِهِ إرهابُ اعداءِ اللهِ ) !!

ئەم گۆلکە سەلەفیانە لە لاکۆلان و کوچەی حیلە (شەرعی!) انـدا خۆیـان لـە چەندین بەرپرسێتی دزیوەتەوەو، چەندین کۆلی قورسی دینداریيان داناوە!

لە لابـردن و لێـك پچڕانی کـارو رەفتـار لـە بـاوەڕ، لـە تـەکفیری حکومەتـە مورتـەددەکان، لـە جیهـاد کـردن .. بـەلام زمانیـان وەکـو مقەسـتی ئینگلیزییـە لەسەر ئەو سۆفیانەی حکومەتی ئال فەهد لە مەدینە دەفیان دەداتێ. لـەو سـێ ئەندامە شیعەیەی ئەنجومەنی شورای (پەرلەمانی) سعودیەش خـۆ کـڕ دەکـەن. ئەوە لە دەسەلاتی ئابوری نیو ملیـۆن ئیسـماعیلییەکانی سـعودیەش هـەر هـیچ. بەلام بۆ گیانی موجاهیدان ئازان. چونکە هین بە خالی خۆی دەوێرێ..

بەلام الحمد لله خوا فەزحی کردون وئاشـکرا بـون، کـە لـە بەرژەوەنـدی کـام موخابەرات وبۆکـام دەزگـای جاسوسـیی ئـاوا بـە خـۆڕایی کەوتونەتـە پـەلاماری ئەهلی جیهادو، پێیان دەلێن خەواریج، چونکە بـە دەسـت و بـازو بـەرگری لـە خۆیان و دینـەکەیان دەکەن ..

ئا با بزانین کێ خەواریجەو کێ ئەهلی سوننەتەو کێ شوێن کەوتوی سـەلەفی بەرێزە ؟

ئیبنو حەزمی رەحمەتی دەلێ: (إذا كان أهلُ الحق في عِصابةٍ يُمْكِنُهُم الدَّفْعُ ولا يَيْئَسونَ من الظَّفَرِ، فَفَرْضٌ عَليهم ذلكَ. وإنْ كانوا في عَدَدٍ لا يَرجونَ لِقِلَّتِهمْ وضَعْفِهم الظَّفَـرَ، كـانوا في سَـعَةٍ مِـنْ تَـرْكِ التغـيير باليـد) واتـە: ئەگـەر ئـەهلی حـەق (موسولمانان) لە پەنجا کەس بەرەو ژورتـر بون و، لە توانایانـدا هـەبو دوژمنـان دەرپـەڕێنن و بیانبـەزێنن و، لـە سـەرکەوتن رەشـبین نـەبون، ئـەوە جیهادەکـە فەرز دەبێت لەسەریان ودەبێت بیکەن. ئەمما ئەگەر ژمارەیان ئەوەندە کەم بو، کـە لەبـەر کـەمی و لاوازی خۆیـان ئومێـدی سـەرکەوتن و زال بونیـان نـەدەبو، ئەوە مافی ئەوەیان هەیە ئەو مونکەرە بە دەست نەگۆڕن.. ئەمەش دیدی سیدنا

عەلی کوڕی ئەبو تالیب و ئەو یاوەرانەی تره، کە لە خزمەتیدا بون. هەر ئەمەشە دیدی خاتو عائیشەو تەڵحەو زوبەیرو ئەو یاوەرانەی تر کە لە خزمەتیاندا بون. دیسان ئەمە رای عبد اللەی کوڕی الزوبەیرو حەسەنی کوڕی سیدنا عەلی و یاوەرە کۆچەرو پشتیوانەکانی تری ئەو کاتەی مەدینە، کە جەنگی (یوم الحورە) ی تێدا رویدا. دیسانەوە رای هەمو ئەو سەحابی و زاناو شەرعناسانەیە، کە لە دژی حەججاجی کوڕی یوسفی سەقەفی راپەڕین. وەکو ئەنەسی کوڕی مالیك و عبدالرحمانی کوڕی ئەبولەیلاو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبول بوبحتری تائی و عەتائی ئەسلەمی و حەسەنی بەسری و مالیکی کوڕی دینارو موسلیمی کوڕی بەششارو ئەبول حەوراو و شەعبی و هی تریش راوبۆچونی ئیمامی ئەبو حەنیفەو حەسەنی کوڕی ئەلحەیی وشورەیك و مالیك هەر وا بو، ئیمامی مالیك خۆی بەشداری شۆڕشەکەی محمدی کوڕی عبد اللەی کوڕی ئەلحەسەنی کرد دژی ئەبو جەعفەری مەنسور هەروەها ئیمامی شافیعی و داودو هاوەڵانیان) بڕوانە البدایة والنهایة/ ابن کثیر ب١٠/ ٨٦ .

هەمو ئەوانەی ناومان هێنان چ یاوەران (ئەسحابە) چ تابعین (نەوەی دوای یاوەران) هەمویان، یان بە فەتواو لەسەر روداوەکە خۆی داویانە، یان وەکو راو بۆچونی خۆیان لەمەڕ گۆڕانکاری بە دەست دەریان بڕیوە. بڕوانە (ابن حزم/الفِصَل في المِلَل والاهواء والنِحَل ب٤/ ١٧١ـ١٧٢) .

لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانین هەمو وڵاتێکی ئێستای موسوڵمانان بارودۆخی تایبەتی خۆی هەیە، کەوا بو ئەحکامی شەرعی تایبەتی خۆشی هەیە. بەڵام بەمەی هێنامانەوە کۆلکە سەلەفییەکان دەخەینە سەر سێ رێیانێك:

یان دەبێ (وەك چۆن بەو موسوڵمانانە دەڵێن خەواریج کە لەسەر راو بۆچونی ئەو بەرێزانەن، کە باوەڕیان وایە دەبێ بە هێزی بازو گۆڕانکاری بکرێت) دەبێت بەو ئەسحابەو تابعینە بەرێزانەش بڵێن خەواریج بون! یان

سیفەتی خەواریجیان تێدا بوە! بەمەش حەقیقەتی (سەلەفێتی)یەکەیان دەردەکەوێت ..

یان دەبێ بڵێین ئەو بەڕێزانەی ناویان برا، بە ئەنقەست وازیان لەو بەلگانە هێناوە، کە داوای ئارام گرتن دەکەن لەسەر زوڵم وستەمی حاکمەکان، یان نەیانزانیوە. ئەمەش کەسێك دەیلێت، کە گومانی بەدی بە سەلەف هەبێت .

یان دەبێ ئیعتیراف بەوە بکەن، کە ئەمە مەسەلەیەکەو ئیجتیهاد هەڵدەگرێت. لەم حاڵەشیاندا دەبێت زمان بەرامبەر ئەهلی جیهاد کول کەن. دەنا لە گومڕاییدان. چونکە :

یان ئەوەیە پۆشاکی ئیرجاو و دەمامکی سکوڵەریستی بەرماخی کەرە حیزبایەتیانەیان کردوە .

یان جیهادیان (بە هەمو جۆرەکانیەوە) پەك خستوەو لایانداوە، چونکە ئەو وەسفەی بۆ واقیعی ئێستای ئێمەی دەکەن، بەسەر واقیعی سەلەفی ساڵحیشدا دەچەسپێت. ئەمەش وانییە، مەگەر لای کەسێکی کەڕو کونتێی وەکو!

ڕەنگە هەوڵ بدەن خۆ بە پەتکە بەلگەیەکەوە هەڵواسن و بڵێن: خۆ هەڵوێستی سەلەف بەرامبەر ئەو ناحەزو موخالیفینانەیان وەکو ئەمانەی ئێوە نەبوە. ئەوان کەسیان تەکفیر نەدەکرد! بەڵام ئێوە ئەم حاکمانەی وڵاتانی ئیسلام بە کافرو مورتەدد دادەنێن .

لە وەڵامیاندا دەڵێین: خۆ ئاشکرایە هیچ یەکێك لەوانەی شۆڕش دژیان دەکراو بە هێزی بازو هەوڵی گۆڕانیان دەدرا، ڕەفتارو کردارو بەرنامەو هەڵوێستی وەکو ئەم حاکم و حکومەتانەی ئەمڕۆیان لێ دەرنەکەوتبو. کەسی ئەو زەمانە ئاوا شەریعەتی خوای نەخستبوە کەنار.. لەگەڵ ئەوەشدا کەس ئەو کەسانەی بە خەواریج ناوزەد نەکرد، کە لە دژی ئەوانە ڕاپەڕین. ئەمما ئێوە هەر بەوەندەی ئێمە دەڵێین بەرنامەی فڵان حکومەت ناشەرعییە، ئێوە خێرا دەبنە دەمڕاستی حکومەت و حیزبە سکوڵەریستەکان و ئێمە بە خەواریج

نـاوزەد دەكـەن. دەڵێـی ئەوانـەی ئێمـە بەرهەڵسـتكاریانین عـەلی كـوڕی ئـەبو تـالیبن، خەلیفـەی بەهـەقن! لەراسـتیدا ئـەوی ئـەهلی جیهادی ئـەم زەمانـە بـە خـەواریج دەداتــە قەڵـەم، دەبێـت پێشـتر سـەلەفی سـاڵحی ئـەم ئوممەتـە بـە خەواریجێتی تۆمەتبار بكات ..

ئیمـامی طـاوس، كـە حـەججاجی كـوڕی یوسـفی سـەقەفی بـە كـافر دادەنـا، مەسەلەیەكی بەناوبانگە. (بڕوانە: تهذیب التهذیب ١/٣٦٣).

ئیمامی ئیبنوئەبی شەیبە دەڵێ: ئەبو بەكری كوڕی عـەییاش لـە الاجلحـەوە گێڕایەوە كە ئیمامی شەعبی گوتویـەتی: (أشهد أنه مؤمن بالطاغوت كافر بـالله، یعـــني الحجـــاج)[1] كتـــاب الایمـــان / ژمـــارە ٩٧ ل ٣٩ واتـــە: شـــاهێدی دەدەم، كـــە حـەججاجی كـوڕی یوسـفی سـەقەفی بـاوەڕی بـە تـاغوت هێنـاوەو كـافر بـوە بـە خوای گەورە ...

هەر ئیمامی ئیبنوئەبی شەیبە دەڵێ: وەكیعی كوڕی جـەڕڕاح لـە سـوفیانەوە و ئەویش لە مەنسورەوە گێڕایەوە كە ئیبراهیمی نەخەعی گوتویەتی: (كفى بمن یشك في أمر الحجاج لَحاهُ الله)[2] كتاب الایمان ژمارە ٩٨ ل/٣٩.

سەیر ئەوەیە كە ئەلبانی لە هەر هەمو ئەم ریوایەتانـە كۆڵیوەتـەوە، كەچی بە موخالیفەكانی، كە ئەهلی سونـنەتن دەڵێ: خەواریجن !!

ئیبنو كەثیر دەڵێ: (ئەبو بەكری كوڕی خَیْثَمَة لە ئەبو ظَفَر جەعفەری كوڕی سـولەیمان بـە سـەنەدەوە لـە قـەتادەوە دەگێڕێتـەوە، كـە لـە سـەعیدی كـوڕی جوبەیریان پرسی: شۆڕشت دژی حەججاج كرد؟ گوتی: (إنـي والله مـا خرجـتُ علیه حتـى كَفَـرَ) البدایـة والنهایـة/ب٩/١٤٢واتـە وەڵڵاهـی تـا تـا كـافر نـەبو، شۆڕشم دژی بەرپا نەكرد.

---

١ـ ئەلبانی دەڵێ: إسناده حسن.

٢ـ ئەلبانی دەرهەقی سەنەدەكەی دەڵێ: إسنادصحیح كالشمس.

ئەعمەش گێڕایەوە، کە لە موجاهیدی ئیمامی ئەهلی تەفسیریان پرسی: رات چییە دەربارەی حەججاج ؟ گوتی: دەربارەی ئەو پیرە کافرە لێم دەپرسن؟! (البداية والنهاية ) ب٩/١٤٣

ئەمەش ڕای طاوس و ئیمامی شەعبی و ئیبراهیمی نەخەعی و سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو هەمو سەرانی زانایانی سەلەفە .. دیتت کەسێك بە خەواریج ناویان بهێنێت ؟!

هۆ گۆلکە سەلەفییەکان، دیتتان یەکێك بە یەکێکیان بڵێ فیکری خەواریجی هەیە؟! بەڵام چ دەکەیت لەگەڵ کەڕو کونتێی حیزبایەتی و دۆش داماوی مەدخەلیانی مورجیئەی زەمانە ؟!

مەگەر نابینیت ئیمامێکی بەقەدرو کەڵە زانایەکی خواویست و پێشەوایەکی نمونەیی وەکو سەعیدی کوڕی جوبەیر- کە جەرگی لە مورجیئەی زەمانی خۆی رەش بو بو - چییان پێ دەڵێت ؟ دەفەرموێ: (المرجئة يهود القِبْلَة) بڕوانە (ابن بطة/ الابانة الكبرى ل/١٦٨) هەروەها(ظاهرة الارجاء / الشيخ سفر الحوالي ٢/٣٧٨) ئینجا دیقەت بدە لە واقیعی زەمانی ئەوان و ئەم زەمانە ئاڵۆزەی ئێمە... پاشانیش لەو گۆلکە سەلەفیانەی ئەمڕۆ بپرسە: ئەرێ بۆچی و بۆ پاراستنی بەرژەوەندی کێ ئەم شمشێرە کولە دەسون ؟! بۆ سەرخستنی فیکرو کوفری کێ، ئاوا بونەتە جاسوس وسەگی پۆلیسی وڵاتان ولمبۆزتان وا بە شوێن پێی ئەهلی ئیسلامەوەو ئاسەواریان هەڵ دەگرنەوە وخەبەری ئەملاولایان لێ دەدەن ؟! بۆ کێ ولەبەرژەوەندی دوری کێیە وا مەدخەلی، سەید قوتبی رەحمەتی داوەتە بەر کەرسەکی تەکفیر؟!

ئەمە حاڵی سیاسیتانەو ئەوەش حاڵی عەقیدەی گەندەڵتان، سەلەفێتیەکەتان کردوە بە کۆتەرە داری راوچی و خۆتان لە پەنایدا مەڵاس داوە گوایە بە دەردی مەدخەلی لە کتێبەکەیدا: (أضواء اسلامية على عقيدة

## سید قطب وفکرە)  بەرگری لە سەلەفێتی دەکەن !![1]

---

١ــ ئەمە کتێبێکە کە رەبیع بن هادي المەدخەلی نووسیویێتی، بەڵام الحمد لله هەر لە ریزی سەلەفیەکانەوە دایانەوە بەر دەستڕێژی رەخنەو هەر خۆیان هەڵیان تەکاند، چونکە ئەوەندە بێ ئینسافانە نووسیبووی، کە شیوخەکانی خۆشیان پێیان ناڕەوا بوو، بۆیە یەکێکی وەکو بەکر ئەبو زەید ـ کە شێخێکی موعتەبەری سەلەفێتی سعودیی بوو رحمە الله ـ لە کتێبێکیدا کە بە ناوی (المدخلی) نووسیویێتی، لە بەرپەرچدانەوەیدا دەڵێ:

١ـ هەر لە یەکەم لاپەڕەی لیستی ناوەڕۆکەکەیەوە (هی کتێبەکەی مەدخەلی کە لەسەر سەیید قوتب نووسیویێتی) وام بۆ دەرکەوت کە سەیید قوتب ـ رحمە الله ـ هەموو بنەماکانی کوفرو بێ دینی و زەندەقەی لە خۆدا کۆکردۆتەوە ! بەوەی کە باوەڕی بە یەکبوونی کردگارو دروستکراو (وحدة الوجود) هەیەو باوەڕی بە (خەلقی قورئان) هەیەو یاسا دانان بە پێچەوانەی شەریعەتی خواش بێت بە رەوا دەزانێت و زێدەڕۆیی هەیە لە پەك خستنی سیفەتەکانی خوای گەورەدا، هەروەها حەدیسی موتەواتیری پێ قبوول نییەو گومانی لە عەقیدەدا هەیەو هەموو کۆمەڵگەکان بە کافر دەزانێت و .. هەتا دوایی ئەم جۆرە ناونیشانە سەیرانەی موچوڕك بە تەوقە سەری موسوڵماندا دەهێنن ..

کە ئەمانەم دیت، خێرا کەوتمە بەراوورد کردنی ناونیشانەکان بە ناوەڕۆکەکانیان لە لاپەڕەکانی کتێبەکەیدا، دیتم هەر باسەو باسێك بە درۆ دەخاتەوە ! تا گەیشتمە ئەوەی بۆم دەرکەوت، کە ئەمە هەر ناونیشانی زەق و گێچەڵاوی هێناوەو کردوێتییە سەرباسی بابەتەکانی، دیارە ئەمەی هەر بۆ ئەوە کردووە تا خوێنەرانی ئاسایی بۆ راکانی خۆی راکێشێت و لە سەیید قوتبیان بهروژێنێت...

٢ـ دیتم ئەم کتێبەی مەدخەلی دوورە لە هەموو ئوسوڵ وبنەمایەکی توێژینەوەی زانستیانە، دوورە لە بێ لایەنی زانستیانە، دوورە لە پرۆگرامی زانستیانەی رەخنەگرتن، دوورە لە ئەمینی ودەستپاکی لە نەقڵ ولێوەرگرتن و زانیاری، دیتم هەقی پێشێل کردووە.. ئەمما ئەدەبی دیالۆگ ورەفتاری موناقەشەو بەرزی شێوازو سالاری نیشاندان، ئەوە هەر توخنییان نەکەوتووە ! ئەمەش بەڵگەیەك لە نەقڵ کردنەکانی: (لێرەوە گەلێك لە برگەی کتێبەکەی مەدخەلی نەقڵ دەکات..) بروانە کتێبی : (بکر بن عبد الله ابو زید / الخطاب الذهبي لا٤) لەگەڵ ئەم جۆرە رەخنانەشدا دەرویشەکانی مەدخەلی، هەر لەسەر گەرمە تەریقەی خۆیان مانەوەو کەوتنەوە بڵاو کردنەوەی، جا تۆ بیر لەوە بکەرەوە، کە ئەگەر کتێبێکی وا لەسەر یەکێك لە شیوخەکانی خۆیان دەرچێت، داخۆ بە حەق و باتڵ، چۆن بەرگری لە شێخ و خەلیفەکانیان بکەن.. رەحمەتی خوات لێ بێت سەیید قوتبی رەحمەتی، خۆ خوای خۆتت بەسە ..

مەدخەلی دواتر بەوە عوزری دەهێنایەوە، کە گوایا رای وا نییە، کە کوفر کەوتووە بەسەر سەیید قوتبدا ! بەڵکو سەیید قوتب کەوتۆتە کوفرەوە ! !

بە راستی عوزرەکەی لە قەباحەتەکەی خراپتر بوو. چونکە قەباحەتەکەی، کە بریتییە لە تەکفیرکردنی گومان لێ کراوێك بە پاڵنەرێکی زانراو، ئەمما خراپی عوزرەکەی، ئەوەیە کە: نەزانانە تەکفیرەکەی کردووە، چونکە نە خۆی ونە تاقمەکەشی ئەوەندە شارەزای رێساکانی تەکفیر نین، تا سەریان لە حوکمێکی واوە بێ وەی دەرچێت...

# سەلەفێتی، یان ئەسپەدارینەکەی جەژن؟!

لە سەدەکانی یەکەمی ئیسلامدا، گروپێکی راحەت تەڵەب پەیدا بو پێیان دەوتن مورجیئە. دواتر کالعادە ئەوانیش وەکو ابو الحسن الاشعری لە کتێبی (مقالات الاسلامیین) دا دەڵێ: بون بە ١٢ گروپی ترەوە، دوانیان بەناوبانگتر بون (مرجئة الفقهاء) و(الجهمیة) .. هەرە چاکەکەیان (مرجئـة الفقهـاء) کە دەیانوت هەر کەس بڵێ باوەڕم هێناوە، ئیتر باوەڕی وەك هی فریشتەیە، با سەریش بە فەرزی خوادا نەدات تا دەشمرێت هەر خەریکی فیسق و فجورو گوناح بێت! با لە جێی بەرماڵ و نوێژ لەسەر مێزو مەزە رۆژ کاتەوە! بیرت بێت وتم: هەرە چاکەکەیان وایان دەوت! ئەمما مورجیئەی (جەهمیەکان) دەیانوت: وتنی باوەڕ بە زمان زەروری نییە! واتە ئەگەر کەسێك لە دڵدا باوەڕی بە خوا هەبو، ئیتر پێویست ناکات خۆی ماندو کات شایەتمان بهێنێت، یان بڵێ نوێژو رۆژو فەرزە!

---

ئەو بۆچوونەی بەکر ئەبوزەیدم زۆر لا جوان بو، کە لە کتێبەکەیدا (المدخلی) دا دەڵێ: (ئەم کتێبە حیزبایەتیە، نوێکەی بوژاندەوە !) الخطاب الذهبي لا١١٧.

خۆزگە بەکر ئەبوزەید لە جیاتی ئەو کتێبەی، کە لەسەر مەدخەلیەکەی خۆیانی نووسیووە، لەسەر حیزبایەتیی (سەلەف) یەکانی بنووسیایە، خۆزگە دژواری تەعەسسوبی (حیزبایەتی) بۆ شی بکردنایاتەوەو، هۆکارەکانی ئەو دەردە کوشندەی بۆ بخستنایاتە رو، بەڵکو کەمێك لا بەلای حەقدا بکەنەوەو (رێبازی بانگەواز) و رێسای (هەڵسەنگاندن) ەکانیان راست کەنەوە، تا لە حاڵی خۆیان حاڵی بن وبۆ شەرعی خوا ماڵی بن.. بەڵام بەداخەوە ئەمیش، هەر چەندە ئیعتیراف بەوە کردوە، کە ئەو سەلەفییانەی خۆیان (کەوتوونەتە) چاڵەوە، بەڵام هەر لایەنگیری شیوخەکانی کردووەو عەیب وعارو باری لاری بۆ پەردەپۆش کردوون، هەنجەتی بۆ شیوخەکانی بەر سێبەری تاغووتان هێناوەتەوە ! دەڵێی لە زەمانێکی تری غەیری ئەم زەمانەی خۆماندا دەژی! واقیعی ئێستای واز لێ هێناوەو کەوتۆتە دارشتنی زۆر رێسای پۆلێن کردنی خەڵکی، کە بۆ خەڵکی غەیری ئەم زەمانە دەشێن! ئەویش هەر دەڵێی شەقرە ئامۆژگاری کردووە، بڕوانە کتێبی ( تصنیف الناس .. لا ٥٤ ).

(بڕوانە تهذيب الآثار/الطبري ١٨٢/٢) هەر لەو سەرچاوەشدا ئیمامی وەکیعی کوڕی جەڕاحی مامۆستای ئیمامی شافیعی دەڵێ: (ليس بين كلام الجهمية والمرجئة كبير فرق" قالت الجهمية: الإيمان: المعرفة بالقلب، و قال المرجئة: الإقرار باللسان).

ئیتر بە درێژایی مێژو مورجیئەو دیدو رای بو بە کورسی کورسی و ماین چەقەڵی یاری و مەزاق و دینداریەکەش بەدەردی خۆشناوان دەڵێن: (بویتە گەمەی منداران) چونکە دینداریەکە بۆتە ئەسپەدارینەکەی، کە جەژنان رەسممان لەسەر دەگرت و خۆمان لای منداڵە لادێییە داماوەکانی خزممان پێوە با دەدات، چونکە ئەوان فەقیرانە نەیاندەزانی رەسمی ئەسپی دارینەو، ئەسپی راستینە لێك جوێ کەنەوە، بۆ ئێمەش بوارێکی تەنکاوی خۆ هەڵکێشان بو!! زانا سەلەفییەکانی ئەمڕۆش دەزانن دەروێشە داماوەکانیان قول و فول لێك جوێ ناکەنەوەو هەر رەسمێکیان بخەنە بەر دەست، هەر وا دەزانن رەسمی ئیمامی بوخاری و ئیبنوتەیمییەو جەماعەتە!

جا ئیتر مورجیئە هەر هات و چو، تەمبەڵی وبێ غیرەتی وترسنۆکی لە ئوممەتدا فەلسەفاند! حەزی هەموانی ختوکە دەدا، دەیان حاکمی مورتەددو سەدان شاعیری لۆتی و، هەزاران ژنی لەش فرۆش وملیۆن هەرزەی داوێن پیسی پێوە هەڵزنا! بوە جێ داڵدەی نوێژ نەکەرو سو خۆرو قۆڵبڕ..

بۆیە ئەمڕۆ مورجیئەی زەمانەش (سەلەفییەکان) بونەتە بەلگەی گەدەزلانی بەرسێبەر. کە دەوترێ: فلان حاکمی عارەبی لە دین لایداوە دەڵێن: نابێت وا بڵێن، ئێوە خۆ لە دڵی کابرادا نین! کە دەوترێت: ئەو کوردە مارکسییە، نوێژ نەکەرەی تەسبیحی پێیەکافرە. دەڵێن: نا هەر ئەهلی ئیمانەو تەسبیحەکەشی، ئەگەرچی بیدعەیە، بەڵام بۆ زیکرە. کە دەوترێت: ئەو پاکستانییەی ریشی چل سانتیمەتر درێژە، پارەی سو (ریبا)ی وەرگرتوە، دەڵێن: گرنگ نییە، دڵ حسێبە.. کە دەڵێین: ئێوە دینەکەتان (تەنکە وەك

پـەڕی مێشـێ) پێمـان دەڵـێن: نـا ئەمـەی ئێمـە تـەواوە، نـەك ئـەوەی ئێـوەی خەواریج !!

لەسەرەتادا مورجیئە موناقەشەیەکی هێدیانەی پێناسەی باوەڕ بـو، کـە ئایا سێ بەشە؟ واتـە: ئیعتیقـادی دڵ و بڕیـاری زمـان و پابەنـدی کاروکردەوەکانـە؟ یـان دوو بەشـە: قەناعـەتی دڵ و بڕیـاری زمانـە ؟ یـان هـەر قەناعـەتی دڵەو بەس؟!

لە سەرەتاوە بۆچونێکی هەڵە بو. بەڵام جار بـۆ جـار تـەنك دەکرایـەوە.. تـا بوە مایەی فیتنەی زۆر کەس، فیتنە بە مانای قورئانی، واتە واز لە دین هێنـان و هەڵگەڕانەوە لێی..

ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ: (فصارَ ذلك الخطأ اليسـير في اللفـظ سـبباً لِخطـأ عظيمٍ في العقائد والاعمالِ، فلهـذا عَظُـمَ القـولُ في ذَمِّ الارجـاء حتـى قـال ابـراهيم النَخَعِي: لَفِتْنَتِهِمْ ـ يعني المرجئة ـ أخوفُ علـى هـذه الامَّـة مـن فِتنـة الازارقـة .. (کتێبی الایمان ل ٣٨٠) واتە: ئەو هەڵە سادەیەی یەکەمجار، کە لـە مانـای وشـەدا بو، بوە هەڵەیەکی زۆر گـەورە لـە بـاوەڕوکرداردا، بۆیـە زەم کردنـی ئیرجـائیش (دیـدی مورجیئـەکان) ئەوەنـدە چـڕوپڕ بـۆوە. ئیبراهیمـی نەخـەعی دەڵـێ: فیتنەی ئەوان ـ واتە هی مورجیئەکان ـ زۆر دژوارترە لە فیتنـەی ئەزاریقـەکان (کە گروپێکن لە خەواریج).

ئیمامی ئیبنوتەیمییە ئینجا لە هەمان شوێندا، دەربارەی گەندەڵی و خراپـی فیکرو دیـدی مورجیئـە، بۆچـونی زانایـانی تـریش دەهێنێتـەوە، وەکـو ئیمـامی زوهری، کە قوتـابی ئـەبوزەڕی غیففارییـە خـوا لێـی رازی بێـت دەیگـوت: (مـا ابتُدِعتْ في الاسلام بدعةٌ أضَرَّ على أهلِه مِن الارجاءِ) واتە:لە ناو ئەهلی ئیسلامدا بیدعەیەکی زیانبەخشی وا دانەهێنراوە لە بیدعەی ئەهلی ئیرجاو زیانبـەخش تر بێت.. سوفیانی سەوریش دەڵێ: (تركتُ المرجئةَ الاسلامَ أرَقَّ من ثوبِ السَّابِري)

واتــە: مورجيئــە ئيسـلامەتيەكەى لــە قوماشـى سـابرى تــەنك تـر كردۆتــەوە. (الثعــالبي لـە كتـيبى زمانــەوانى (فقــه اللغــة) كەيـدا دەڵـێ: قوماشـى سـابرى ئەوەندە تەنكە، كە هى ژێرەوەى لێوە ديـارە، ئـەوى دەيپۆشێت نازانيـت هيچى پۆشيوە، يان روتە) ئيمامى ئەوزاعيش دەڵێ: (كان يحيــى بــن ابــي كــثير وقتــادة يقولان: ليس شئ من الاهواء أخوف عندهم من الارجاء) واتـە: ئـەو دوو زانـا پايـە بەرزە دەيانگوت: هيچ شتێك نييـە لـە هـەواو هـەوەس پەرسـتيدا بـە لامانـەوە ترسناك بێت وەكو ئيرجاو.

ناهــەقيان نييــە، بڕوانــە مێــژوى موســوڵمانان: لــەو كاتانــەى مەســەلەى كاروكردارييان لە باوەڕ جوێ كردۆتەوەو نەيانكردوە بە بەشێكى باوەڕو زۆر بـە دوايدا نەچون، كە وتويانە: تەنها بە راست زانـينى ئيسلام بەسـە بـۆ دينـدارى! بزانە چ شكستێكيان بەسەردا هاتوە، پێچەوانەكەشيان ببينە ..

ئەدى ئەمڕۆ بۆ سەير ناكەيت؟! مەگەر بازاڕى سكوڵەريستى عالمانى بـە كـێ گەرم بوە؟! مەگەر هەر بەوانە نييە، كە دەڵێن: ئيسلامەتى بـاوەڕى دڵـەو هـەر كەس بۆ خۆى دينداری دەكات! مەگـەر نابينيـت مـەلا چـۆن سـەرى كوردەوارى كلۆڵى شێواندوە ؟ نابينيت ئەوى حـەى عەلەسسـەلا لـە ئيسلام چۆتە دەرەوەو رۆژى هـەزار كـوفر دەكـات، هـەر پێـى دەڵـێن ئيمانـدارەو لەسـەر موسـوڵمانێتى ماوە! چونكە مورجيئە (زۆربـەى مـەلاى كـورديش هـەر لـەوانن) دەڵـێن: كـوفر (التكذيب والجُحُود) ە واتە بەدرۆ خستنەوەى پێغەمبەر صلى الله عليــه وسـلم! و نكوڵى كـردن لـەوەى هێنـاوێتى.. بـاوەڕيش بريتييــە لــە (التصــديق) واتــە: بــە راستگۆزانينى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم .

ئينجا لەم نەزانى و حاڵى نەبونەشەوە، دينەكەيان لە قورئان و سوننەتەوە بۆ گۆڕيون بۆ پەندى پێشينان، كـە دەڵـێ :(بـزن بـە پـێى خـۆى ومـەڕ بـە پـێى خۆى) و (كەس ناچێتە قەبرى كەس)!!

ئاخر لەم دەلاقەوە بو، کە بلۆکی سەرمایەداری بە سەرۆکایەتی ئەمریکا، خزایە ناو دیدو دینی موسوڵمانان ودوژمنداریێتیەکەیانی لە خۆی لاداو کردنی بە گژ کۆمۆنیزمدا!! نەتبینی ئەو رق و قینەی بەرامبەر کۆمۆنیزم دروست بو، بەو ئیعتیبارەی دژی باوەڕە، کە (تصدیق)ی پێغەمبەرانە، بەرامبەر لیبراڵی رۆژئاوا دروست نەبو! چونکە عەلەمانیەتی سەرمایەداران و لیبراڵەکان (تکذیب) ناکات، هەر (تبدیل) دەکات!! واتە هەر دەیگۆڕێت!! ئەمەش بە پێی دیدو دینی مورجیئە کافر بون نییە! بەلاّم ئێمەی ئەهلی سوننەت الحمدلله بەرچاومان رۆشنەو جیاوازییەك لە نێوان (تکذیب)و (تبدیل)دا نابینین.

هەندێك پارت و گروپی کۆمۆنیست، کە ئەقڵیان بە گەمەکە شکا، ناوی گروپەکانیان دەکردە پارتی سۆشیالیستی فلانی! تا بڵێن: ئێمەش چیدی (تکذیب) ناکەین وباوەڕمان بە ئیسلام هەیە، بەلاّم ئێمە سیستمێکی سۆشیالیستیمان هێناوە!! مەگەر ئەمە هەر ئەو کلاّوە نییە کە کراوەتە سەری هەزاران (داعی)و مەلای کوردی زەین کوێری شوێنکەوتوی حزبە عەلمانیەکان و گروپە سۆشیالیستیەکان؟! چەند هەزار مەلا هەیە بۆتە دەروێشی ئەم گروپ و ئەو گروپ؟!

حیزبی سەلەفییە لاحیزبییەکانی کوردستانیش، کە شمشێریان هەر بۆ ملی ئێمە دەسون، دەڵێن: حزبە عەلمانیەکان ئەهلی ئیمانن و لە ئێوەش دیندارترن! چونکە ئەوان وەکو ئێمە مورجیئەن گەرچی کەم کردارن، بەلاّم ئێوە خەواریجن! چونکە ئەم مارکسی ولیبراڵە ناحاڵیانە بە کافر دەزانن، کاکەی ئیخوانیش پشتیان دەگرێ و دەڵێ هێشتا ئەمانە کەس ئیقامە حوججەی لەسەر نەکردون!! سلاّو لە ئەقڵ وعیلمتان!

ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ: (والُمطاعُ في اتِّباع غيرِ الهُدى ودينِ الحقِّ، سواءً كانَ مقبولاً خَبرُهُ المُخالِفُ لكتابِ الله، أو مُطاعاً أمْرُهُ المُخالِفُ لأمرِ اللهِ، هو طاغوتٌ)

مجموع الفتـاوى/١١٣/٢٨. واتـە: ئـەو كەسـەى لـە غـەيرى رێبـازى خـوايى و ديـنى حـەقى خـوادا، گوێرايـەڵى دەكرێـت و ملـى بـۆ كـەچ دەكرێـت، گـەر سەرپێچـى فەرمانى خواى كردو بە پێچەوانەى قورئان فەرمانى دەركرد ـ ئـيتر گوێرايـەڵى ئەو فەرمانە موخاليفەى كرا بێت، يان نەكرا بێت ـ ئەوە تاغوتە.

كاكە برا... ئاگاداربە، بە ناوى سەلەفەوە سوارى ئەسپە دارينەكەت نەكەن و بڵێن پىٚ بكەنەو وێنەت بگرن!

رەنگە بەستەزمانانە بڵێيت: ئەرىٚ سەرمان لىٚ شێواوە نوێـژمان نـەدەكرد، دەتانوت: كافرن ونانى دەستتان حەرامـە، بـە حـەلا حـەلا كەوتينـە نوێـژكردن، حەى دايم و يا هو يا مـەن هوى سۆفيمان پـىٚ خـۆش بـو، وتتـان كـوڕە نەكـەن شـيركە. بـەرەو ئيخـوان هـەلاتين، دلّمـان بـە شـيعارەكانيان خۆشـبو، بـە تـەماى جيهاد بوين دژى سەددام، كەچى كرديانين بە مجلس الحكمـى ئـەمريكا! وتتـان: كـوڕە زو وەرنـە دەرىٚ كـافر دەبـن! لـەويش هـەلاتين.. وتمـان: دەبينـە سـەلەفى، ئەمـەيان خۆشـە، ئيقتيدايـە بـە سـەلەفى سـاڵح، بـە ئەسـحابەكان، وامـان لێهـات قسەمان نە لە مـەلا وەردەگـرت، نـە لـە داعيـەكان، تـەنها لـە شيوخى سعوديە، كەچى وتيان: نابێت لە ئيبن جبرين وحمود العقلاوو سـەفەر الحوالى و سـەلمان العـۆدەو.. وەربگـرن! وتمـان: ئـەدى لـە كـىٚ؟! وتيـان: لـە ئـيبن بـازو ئـەلبانى و شـەقرەو مەدخـەلى !! وتمـان ئۆخـەى دۆزيمانـەوە! بوينـە دەروێشـى ئـەوانيش، ئـەوا ديسـان ئێـوەش هـاتون دەڵێن: كـوڕە كاكـە ئەوانـە سـەلەفى نـين! ئەوانـە مورجيئەن! سوارى ئەسپەدارينـەتان دەكەن!

براى شيرينم، راست دەكەيت.. بەڵام سەرت لىٚ نەشێوێت، ئەمـە دەردى بـىٚ خيلافەتييە، بەڵام گوىٚ لە بـراى خۆت بگرە :

ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ: (فَمَن قالَ بالكتابِ والسنةِ والاجماعِ فهو مِن اهلِ السنةِ والجماعةِ) مجموع الفتاوى١٩/١١٥، واتە: هەر كەس بەقورئان و سوننەت و كۆڕا (ئیجماع) قسەی كرد، ئەوە ئەهلی سوننەت و جەماعەتە ..

ئیمامی شاطبیش دەڵێ: ( يَجبُ عَلَى كُلِّ ناظرٍ في الدليلِ الشرعي مُراعَاةُ مَا فَهِمَ مِنْهُ الاوَّلُون ومَا كانوا عليهِ في العملِ بهِ فهو أحْرَى بالصَّوابِ وأقْوَمُ في العِلْمِ والعَمَلِ) الموافقات٣/٥٧ واتە: پێویستە لەسەر هەركەس، كە تەماشای بەڵگەی شەرعی دەكات، ئەوە لەبەر چاو بگرێت، كە ئایا پیاوانی پێشین چۆن لەم بەڵگانە حاڵی بو بون وچۆنیان عەمەل پێ كردوە، ئەمە نزیكترە لە راستییەوە، ئەمە راستترین شێوەی فێربون و كار بە عیلم كردنە ..

ئیقتیدا بەوانە بكە، كە لە خزمەت پێغەمبەری نازداردا صلى الله عليه وسلم ئەم دینەیان وەرگرتبو، پاشان بەوانەی لەوانەوە دینەكەیان وەرگرت، پاشان بەوانەی تر، كە لەوانەوە نزیك بون. گوێ بگرە لە سیدنا ئیبنو مەسعود ـ خوا لێی رازی بێت ـ كە دەڵێ: (ألا لايُقَلِّدَنَّ احدُكُم دينَهُ رَجُلاً إنْ آمَنَ آمَنَ، وإنْ كَفَرَ كَفَرَ، فإنْ كُنتمْ ولا بُدَّ مُقتَدِينَ فَبالَمِّيتِ فَإنَّ الحَيَّ لا يُؤْمَنُ عليهِ الفتنةُ ) شرح اصول السنة/اللالَكائي ژمارە ١٣٠ ٩٣/١، هەروەها (البغوي: شرح السنة ١/٢١٤) واتە: دینداری خۆتان مەكەنە لاسایی كردنەوەی كابرایەك، گەر باوەڕی هێنا ئێوەش باوەڕ بهێنن، گەر كوفریشی كرد ئێوەش كوفر بكەن، ئەگەر هەر چارتان نییەو، هەر دەبێت تەقلیدی كەسێك بكەنەوە، ئەوە تەقلیدی كەسێك بكەنەوە، كە مرد بێت، چونكە زیندو لە رێ لانەدانی مسۆگەر نییە...

كاكە برا، شوێن قەرەباڵغی مەكەوە، وا نەزانی هەر جەماعەتێك زۆر بو ئەوە چاكەو شایەنە لەگەڵیاندا بیت.. نا لە كەمی هاوبیرو هاورایانت رەشبین مەبە، گەشبین بە بەوەی حەقت ناسیوەو پێوەی پابەندیت. ئیمامی ئیبنو القەییمیش دەڵێ: (عليك بطريق الحق ولا تَسْتَوْحشْ لقِلَّةِ السالكينَ، وإياك وطريقَ

الباطِلِ ولا تَغْتَرْ بكثرةِ الهالِكينَ) مدارج السالكين١/٢٢ واتە: پێویستە ڕێبازی حەق بگریتە بەر، کەمی ڕێبوارو کاروان بێ تاقەتت نەکات، نەکەی ڕێی ناحەق بگریە بەر، بە زۆری فەوتاوان نغرۆ نەبیت .

شیعە عادەتێکیان لە تەدلیسدا هەیە، کە وتت شیعە خراپن، دەڵێن: ئێمە جەعفەرین! کە وتت جەعفەری موخالیفن. دەڵێن ئێمە ئیسناعەشەرین! کە زانیان شتێك لە ئیختیلافات دەزانیت، دەڵێن پێویستە ئەم باسانە نەکەین، چونکە خزمەتی ئیستیعمار دەکات، کە زانییان هیچ نازانیت، وردە وردە دەبنە برادەرت و لێت نزیك دەبنەوەو بە دزییەوە دێنە لات ودەکەونە سرتەسرت، کتێبت بۆ دێنن و هەر لەگەڵت خەریك دەبن تا لە هاوبیرانت جوێ دەکەنەوە.. ئەم سەلەفیانەی هاورێشمان زۆر عادەتی خراپیان هەیە لە هی شیعە دەچێت! کە زانیان گوێ لە ئێمەمانان دەگریت، دەڵێن گوێیان لێ مەگرەو هات و چۆیان مەکە، چونکە ئەهلی بیدعەن وشەرعەن نابێت سەلامیش لە ئەهلی بیدعەو زەلاڵ بکرێت، تا تۆ دور دەخەنەوە، ئینجا کە زانیان ڕێی توێژینەوەو پرسیارو وەلامت بڕاوە، شوبهەکانی خۆیانت لێ دەکەنە دین و دینداری ئەهلی سوننەت، هەموشی هەر بە ناوی سەلەفەوە! ئەوی خۆی بۆی وەلام نەدرایەوە، دەتباتەوە بۆ لای مەدخەلی، هیچ جارێکیش ناهێڵێت دەستت لە بن بازی ڕەحمەتی گیر بێت، چونکە بن باز فەتوای تەکفیر کردنی حاکم وحیزبە عەلمانیەکان داوەو لە زۆر مەسەلەی عەقیدەدا وەکو ئەلبانی نییە، چ جای مەدخەلی وجامی و زانایانی تری بەناو سەلەفی ..

دەڵێن نابێت موقەللید بیت، کەچی خۆیان موقەللیدترن، دەڵێن: نابێت حیزبت هەبێت، خۆیان لە هەمو کەس حیزبی ترن، دەڵێن نابێت خەت وشێخ ومەزهەبت بەسەر حەقدا سەرخەیت، کەچی ئەوان هەر هەمو کارو هەڵوێستەکانیان هەر ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە .. ئاخر بۆ پێرێکی تێری وایە، کە ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵی: (فالحَذَرَ الحذرَ ايُّها الرَّجُلُ أنْ تَكْرَهَ شيئاً مما جاء بە

الرسولُ (صلى الله عليه وسلم) أو تَرُدَّهُ لأجْلِ هواكَ، أو إنتصاراً لِمَذهبكَ، أو لشيخيكَ أو لأجلِ اشتغالكَ بالشَّهَوَاتِ أو بالدنيا، فإنَّ اللهَ لَمْ يُوجِبْ على أحَدٍ طاعةَ أحَدٍ إلا طاعةَ رسولِه، والاخذَ بما جاء به بحيث لو خالف العبد جميع الخلق واتبع الرسول ما سأله الله عن مخالفة احد، فإنَّ مَنْ يطيعُ أو يُطاعُ إنما يطاعُ تَبَعاً للرسول وإلا لَو أمَرَ بخلافِ ما أمرَ به الرسولُ ما أطيعَ. فاعلم ذلك واسْمَعْ وأطِعْ، واتَّبِعْ ولا تبتَدِ تكنْ أبترَ مردودا عليك عملُكَ) مجموع الفتاوى ١٦/٢٩٢ واتە: ئاممان کاکە نەکەی لەبەر خاتری هەواو هەوەسی خۆت، یان بۆ سەرخستنی مەزهەب و (دیدو بۆچونی خۆت)، یان هی مامۆستاکەت یان لەبەر حەز لێبونی دنیایی خۆت، شتێك لەوە ببوغزێنیت، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هێناوێتی، چونکە خوای گەورە غەیری گوێرایەڵی فەرمانی خۆی و پێغەمبەرەکەی لەسەر کەس فەرز نەکردوە، ئەگەر کەسێك شوێن پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کەوتبو، پێچەوانەی هەر هەمو خەڵکی بوەوە، خوای گەورە موحاسەبەی ئەوەی ناکات بۆچی پێچەوانەی ئەو خەڵکە بۆتەوە، ئەوی ملکەچی دەکات، یان بۆی دەکرێت لەبەر شوێنکەوتنی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم، دەنا گەر بە پێچەوانەی ئەوەوە فەرمان بدا گوێ رایەڵی ناکرێت .

# کۆبەندی یەکەم

## بەندی یەکەم

**عەقیدەی مەدخەلی و پاڵانتەوانانی[1] سەلەفی لە پێکهاتەی باوەڕدا ؛ باسەکانی ( باب الایمان ).**

## بەندی دووەم

**ڕەواندنەوەی گومانی مەدخەلی و پاڵانتەوانانی سەلەفی لە باسەکانی باوەڕدا.**

[1] (پاڵانتەوانان): ئەوانەی ئیدیعای سەلەفی دەکەن

# باسی یەکەم

## مەدخەلی و پاڵانتەوانی سەلەفێتی کام جلەی مورجیئەیان پۆشیوە؟

سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان و، پاڵانتەوانانی سەلەف، ناچارن ئەو پێناسەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بۆ باوەڕ دەیکەن، ئەوانیش بیکەن! ئەوانیش لە کۆڕو کۆمەڵی ئاشکرای خۆیاندا دەڵێن: (الإیمانُ: قَولٌ وَعَمَلٌ یَزِیدُ وَیَنْقُصُ ) واتە: باوەڕ گوفتارو کردارەو زیادو کەم دەکات. بە ئاشکراش لە هیچ شوێنێك والحمدلله ناوێرن بە راشکاوی نکوڵی لەم پێناسەیە بکەن، چونکە دەزانن، کە زانایانی پێشین لەسەر ئەو پێناسە رێکن .. بەڵام بۆ ئەوەی گەرویان نەگیرێت و توشی ئەرکی قورس نەبن! هەوڵ دەدەن لە دوو لاکۆڵانەوە بۆی دەرچن:

**یەکەم:** دەڵێن کوفر پەیوەستە بە بەدرۆخستنەوەوە (حَصْرُ الكُفْرِ فِي التَّكذيبِ)[1] بە درۆخستنەوەش چونکە پێچەوانەی بەراست زانین (التصدیق )ە، ئەوا پێناسەی باوەڕ دەهێننەوە سەر تەنها گوفتار (قەول). واتە پێناسەی باوەڕ لای سەلەف، بریتییە لە قەناعەتی دڵ و بڕیاری زمان (تصدیق بالقلب واقرار باللسان)! ئێ خوا وەکیل ئەمەش هەر پێناسەی مورجیئەکانە ..

**دووەم:** دەڵێن کردار مەرجی باوەڕ نییە (العمل لیس شرطا في الایمان) بەڵکو تەواوکەرێتی! ئاشکرایە، کە دەوترێت: ئەم خاڵە مەرجە بۆ فلان شت. مانای

١ـ بڕوانە: علي حسن الحلبي کتێبێکی هەیە هەر ناوەکەی بیدعەیە، کە کێشەیەکی شەرعی وەکو تەکفیری بە(فیتنە)ناوزەدکردووە ! ! ئەوە خوانەخواستە ئێمە مانان بمانکردایە لێیان لە دەهۆڵ دەداین، بەڵام بزن هەمیشە عەورەتی دیارە کەس هوهای لێ ناکێشێت کەچی مەڕی داماو لە بازدانێکدا عەورەتی دەردەکەوێت لێی نابڕنەوە، کاکەی حەلەبی لە پێشەکی کتێبەکەیدا (التحذیر من فتنة التکفیر) دا دەڵێ : بە درۆخستنەوە، دەبێتە هۆی بەکافر بوون واتە: (التكذیب). نکوڵی لێ کردنیش (الجحود) لای ئەو (هو تكذیب باللسان) واتە بەوە دەبێت، کە بە زمان بەدرۆی بخاتەوە، بە حەڵاڵ دانانی حەرامیش، کە پێی دەوترێت (الاستحلال) ئەو لە پێناسەیدا دەڵێ : (هو تكذیب بالنص بتحریم الحرام) واتە : بە درۆخستنەوەی ئەو دەقەیە، کە حەرامی پێ حەرام کراوە ..

وایە فلان شتەکە نابێت، تا مەرجەکەی نەبو بێت. بۆیە پالانتەوانانی سەلەفی دەڵێن، ئەگەر کابرا هیچ کارێکی ئیسلامی ئەنجام نەدا باوەڕەکەی ـ کە بە قسە وتوێتی ـ هەر هەیە، چونکەکردار ( مەرجی هەبون ) نییە، بەڵکو( مەرجی تەواوێتی ) یە .. بۆیە مەرجی تەواوێتی باوەڕ لای سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپالانتەوانانی سەلەفی، بریتیە لە قەناعەتی دڵ و بڕیاری زمان (تصدیق القلب واقرار اللسان) واتە: (قول القلب واللسان) جا هەر کەس ـ لای سەلەفی ـ قەناعەتی بو وە بڕیاریشی بە زمانی دا، ئەوە موسوڵمانە، با هەر هیچ کردەوەیەکی ئیسلامیشی ئەنجام نەدابێت .

ئەم دژەوانی (تناقض)ەی کەوتونەتە ناوی، هەر هەمان دژەوانییە، کە خەڵکانی تر پێش ئەمان دەکەوتنە ناویەوە، مەبەستم مورجیئەیە، ئەوانەی، کە ئیمامی ئیبنو تەیمییەی رەحمەتی دەربارەیان دەڵێ: (هەر دوو تاقمەکە (ی مورجیئە) کەوتونەتە دژەوانی خۆیانەوە، چونکە دەڵێن: باوەڕ بڕیارو کردارە، کەچی دەشڵێن

بەلام باوەڕ بەنەمانی هەندێك کردار لەناو ناچێت. ـ با لەو کردەوانەش بن، کە ڕوکنی باوەڕن، وەکو پابەندی گشتی و نوێژ) مجموع الفتاوی چاپی١٣٨٢ ب ٥١١/٧.

ئەوی بە دووی دەرس و دیداری سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان و پالانتەوانانی سەلەفیدا بچێت، زو بۆی دەردەکەوێت ـ هەرچەندە بە ڕواڵەتیش وا نالێن ـ بەلام سورن لەسەر سەرخستنی مەزهەبی مورجیئەکانی پێشو (لە باسی باوەڕدا). با پێکەوە گوێ بدەینە هەندێك وتەکانیان :

ـ محمد ئیبراهیم شەقرە (ئیمامی سەلەفییەکانی ئەردەن) دەڵێ: (ئەگەر کەسێك شایەتمانی هێنا، لە دڵیشیدا بە راستی زانی و قەناعەتی پێی بو، باوەڕیشی بە هەمو داواکاریەکانی باوەڕ هەبو، ئەوە موسوڵمانە) کتێبی: هي السلفية/الشقرة ل١٢٢.

**باشە بابە شێخ گیان ئەمە (بڕیار)ە ئەدی كوا (كردار)؟**

**هەر ئـەم شەقرەیە لـە موناقەشـەی كابرایەكدا، كـە نـاوی سامی یـە دەڵێ: (العمل لیس شرطا في الایمان) واتە كردار مەرجی باوەڕ نییە. هـەر لـەو شوێن و كاتەشـدا، شـێخی ئـەلبانی رەحمـەتیش لایـەنگری دەكـات و بـە هـەردووكیان كۆمەڵێك گومان وەكو بەڵگەی راستی هەڵوێستی خۆیان دەهێننەوە[1].**

**شێخی ئەلبانیش هەر لـەو شـریتەدا كـە بەرپەرچی سـامی دەداتـەوە دەڵێ: ئەسـتەم (موسـتەحیل)ە كـوفری كـردار ببێتـە كوفرێـك، كـە خاوەنەكـەی لـە میللەتی ئیسلام بكاتە دەرەوە، مەگەر قەناعەتی دڵی لەگەڵدا بو بێت. پێویستە**

---

١ــ ئەمە شریتێكی تەسجیلە بە (كاسێتی سامی) بەناوبانگە! كە لە ئـەردەن موناقەشـەی شـێخی ئـەلبانی كـردووەو ئیـبراهیم شـەقرەی سـەلەفی ئـەردەنیش لـەوێ بـووەو جـار جـارە ئـەویش بـە شەقشەقەلێدان خۆی دەخاتە تەرەفی شێخی ئەلبانی، شریتەكە ناوی (الكفر كفران/سلسله الهدی والنـور رقم ١/٨٢١)ە ئەبومحمدی مەقدیسی بەرێز دەربارەی ئەم سامی ناوە لە پێشەكی كتێبەكەی مەراكیشی رەحمەتیدا نوسیوێتی: ئەمە دكتۆر سامی بن مەحمود العورێدی برامانـە خـوا بیپارێزێـت كـە ئـەو كاتـە خوێندكار بوو، ئەمە ئەوە كـە ئـەو سـەردەمە موناقەشـەی كـافربوونی حـاكم و حكومەتـەكانی لەگـەڵ شێخی ئەلبانی وشێخ محمد ئیبراهیم شەقرەدا كردوە. پێش ماوەیەكی لەمەوبەر دكتۆر سامی و بـاوكی كە ئـەمیش دكتـۆرای لـە قیرائاتـدا هەیـەو شـێخێكی قورئانـەوانی بەناوبانگـە چـوونە میوانـداری شـێخ ئەبومالك (شەقرە)، لەوێش ئەبو مالیك لەبەرچاوی بیستو پێنج كەسی تر كە لەوێ ئامادە بوون، شـێخ محمد ئیبراهیم شەقرە بە دكتۆر سـامی ووتـەوە كـە ئـەو هەڵوێسـتەی ئـەو كاتـە مـن لـەو مەسـەلەیەدا هەمبوو هەڵە بووم، منیش و شێخی ئەلبانیش هەڵە بووین.. ئەبو مالك دواتر كە زانی سامی كـوڕی ئـەو قورئانەوانیە بەناوبانگەیە زۆری پێ خۆش بوو، مەتحی خۆی و بـاوكی كـردو گـوتی: بـاوكی مامۆسـتام بووەو قورئانم لا خوێندووە، بۆیە بەردەوام، كە پێی دەگەم ناوچەوانی ماچ دەكەم، پاشـان دەربـارەی دكتۆر سامی كوڕیشی فەرمووی : (ئەمە سامی كوڕمانە كـە پـێش دە سـاڵ لەمەوبـەر كـۆڕێكی شـێخی ئەلبانی پێكیەوە كۆكردینەوە، ئێستا وا لێرەدا ئیعتیراف بەوە دەكەم كە مـن و شـێخی ئـەلبانی هەڵـە بووین وئەو لەسەر هەق بوو). مەقدیسی دەڵێ: پێم ووت: یا شێخ مەبەستتان شریتی (الكفـر كفـران)ە؟ گوتی: بەڵێ .. پاشان مەقدیسی دەڵێ : ئەوە بۆیە دەگێڕمەوە، چونكە ئێستا شێخ ئەبو مالیك (محمـد ئیبراهیم شەقرە) لەوەتای وازی لەو دیدو پێناسە مورجەئێتیـەی ئـەو گەزافانـەی سـەلەفییتی هێنـاوە، خستوویانەتە ژێر حەملەیەكی زۆر ستەمكارانەوەو جۆرەها تۆمەتی دەخەنە پاڵ، پێی دەڵێن: بە پیریی خەڵەفاوە! بووە بە قوتبی، كەوتۆتە دوای هەرزەوەرزە، دوای زانین كەوتۆتە دوای منداڵ وەزم، یان دەڵێن زانستیەكەی لێبۆتە كۆڵ و بەسەر شانوملی خۆیدا كـەوتووە.. زەمـانێكیش بـوو هـەر بـە (والـد) یەعنی باوك بانگیان دەكرد!

**جیاوازی بخرێتە نێوان کوفری کردارو کوفری باوەڕو قەناعەت، لای ئێمە[1] بە هیچ شێوەیەك لە شەریعەتی ئیسلامدا، دەقێکمان نییە بە راشکاوی بڵێت، یان بەڵگەیەکی ئاشکرا بێت بۆ ئەوەی، کە هەر کەس باوەڕی بەوە هێنا، کە خوای گەورە ناردوێتییە خوارەوە، بەڵام هیچی لەوە نەکرد، کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوە، کافر بێت) [2].**

**شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە شریتێکی تریدا، کە دەربارەی کردارو باوەڕ دەڵێ کە: (عَمَلُ الجَوارِحِ شَرْطُ كَمَالٍ لِلايمَان)[3] واتە کردار مەرجە بۆ تەواوێتی باوەڕ...**

---

١ـ لای ئێمە ! ئەگینا لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت، بەڵگە زۆر زۆرە. ان شاو الله لە داهاتووتردا هەندێکیان دەهێنمەوەو باسیان دەکەین ..

٢ـ الالباني: شريط الكفر كفران/ تسجيلات بيت المقدس / عمان لة ( ابو بصير عبدالمنعم مصطفى حليمة: الانتصار لاهل التوحيد ل ٥٩-٦٠) وەرگیراوە

٣ـ الالباني: شريط التحرير لاصول التكفير/سلسلة الهدى والنور رقم ٨٥٥/١ شێخی ئەلبانی و ئەوانەی لەخزمەتیدا بوون، رای خۆیان لەم شریتەدا روون دەکەنەوە، کە کردەوەی دڵ (وەکو ئومێدو تکاو ترس و ..هتد) ئەو مەرجی هەبوونی باوەڕە نەك کردەوەی ئەندامانی لەش (نوێژو رۆژوو حەج و.. هتد) ئەمە بە راستی خۆ گێلکردن وخەڵك ئیغفالکردنەو دادی کەس نادات. بەمە کەوتنە سێ هەڵدێرەوە: ١ـ ئەم کەرە سەلەفیانەش لە پێڕی (مورجیئە) ن و هەرچەند لاف و گەزاف لێدەن هەر لە ریزی ئەواندن، چونکە زۆرینەی تیپی مورجیئەکان دەڵێن کردەوەی دڵ بەشێکە لە باوەڕ. وەك ئیمامی ئیبنوتەیمییە باسی کردوون. (مجموع الفتاوى٧/١٩٤) .

٢ـ ئەگەر کەسێك بە سەلەفیەکی ووت باوەڕم بە ترس و خۆشەویستی ومەزنی خوای گەورەو خۆشەویستی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەیە دەبێ پێی بڵێ : تۆ موسوڵمانیت و باوەڕەکەشت تەواوو ساغ و سەلیمە، با هیچ کردەوەیەکیشت بە ئەندامانی تری لەشت نەکردبێت، چونکە کردەوەی لەش مەرجی تەواوێتی باوەڕە ... ئاشکرایە، کە ئەم قسەیە خراپترین قسەیەو لە هەموو هەڵوێستێك زیاتر دژایەتی شەریعەتی خوای پەروەردگارو ژیرێتی مرۆڤ دەکات! ئەمە قسەی نەرمڕەوە شلگیرەکانی جەهمییە.. دوایی ان شاو الله دێمە سەر فش کردنەوەی ئەم قسانەو بەتاڵ کردنەوەی بەڵگەکانیان.. دەبینیت قسەی پاڵانتەوانانی سەلەفی ئەمڕۆش، هەر قسەی ئەو جەهمیانەی پێشووە، بە موو جیاوازیان نییە !!

٣ـ ئەم سەلەفیانە بۆ ئەوەی خۆ لەو تەنگژەی خۆیان قوتار کەن، پێناسەیەکی تریان بۆ باوەڕ داهێناوە! کە کەس پێش ئەوان ـ نە لە سەلەف و نە لە خەلەف ـ نەیانوتووە! ئەویش ئەوەیە:

**یەکێك لە شێخ الالبانی دەپرسێت: ( ئەگەر کەسێك لەسەر یەکخواناسی (تەوحید) (!) مرد بێت، بەڵام هیچ شتێکی لە داواکاریەکانی تەوحید ئەنجام نەدا بێت، ئایا راستە کە بە کافر حسێبەو لەگەڵ کافرانی تردا بە نەمری لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە؟**

**شێخ لە وەڵامیدا دەڵێ: (سەلەف جیاوازیان خستۆتە نێوان باوەڕوکردەوە، کرداریان بە مەرجی تەواوێتی باوەڕ داناوە، نەك بە مەرجی هەبونی، بە پێچەوانەی خەواریجەکان) پاشان ئەوە باس دەکات کە (الایمانُ لا یستلزِمُ العملَ)[1] واتە باوەڕ ناچاری ئەنجامدانی کردار ناکات ..**

**بڕوانە چۆن قسە بەدەم سەلەفەوە هەڵ دەبەستن! شتێك، کە سەلەف نەیوتوە، ئەمان بۆ سەرخستنی مەزهەبەکەی خۆیان دەیدەنە پاڵیان! ببینە چۆن جیاوازی دەخەنە نێوان باوەڕوکرداروە (الایمان والعمل)، ئینجا دەشڵێن باوەڕ بڕیارو کردارە!**

---

(الایمان قول باللسان واعتقاد بالقلب وعمل بالقلب ) بچۆرەوە بۆ شریتی: التحریر لاصول التکفیر...واتە: باوەڕ بڕیاری زمان و قەناعەتی دڵ و کردەوەی دڵە !!

ئەم پێناسەیە لەگەڵ ئەوەشدا، کە بیدعەیەو گومڕاییە (کل بدعة ضلالة)، گەڕەلاوژێ و پشێویەکی زانستیانەشی بە دووی خۆیدا وەك چەڕە دوکەڵ راکێشاوە! باشە مەگەر قەناعەتی دڵ (اعتقاد) هەر بە راست زانینی دڵ و کردەوەی دڵ (تصدیق القلب وعملە)ەکەی پێشینی ئەهلی سوننەت وجەماعەت نیە؟!

توخوا بچن چەند جارێك گوێ لەو شریتە بگرن، تا بزانن ئەمانە چ پێناسەیەکی لاسەنگیان کردووە بە دارشەقی ناو لافاوو سەوڵی سەر ووشکانی!! خۆزگە شێخی ئەلبانی خۆی دوورەپەرێز بگرتایەو بە قسەی شەقرەو پەقرە خۆی نەخستایەتە ئەو گێژاوەوە! تۆ بڵێی ناچار بوو بێت؟

١ــ الالباني: شریتي من منهج الخوارج/ سلسلة الهدى والنور رقم ١/٨٣٠ .. بڕوانە باوەڕو رەفتاریان! بە خۆشیان دەڵێن (سەلەفی حەقیقی و سوننی فیرقەی ناجیە)! سوفیانی سەوری دەڵێ: ئەمە ناوو ناونیشانێکی بیدعەیە، ئەوانەی ئێمە بە خزمەتیان گەیشتین راو بۆچوونیان وا نەبوو .. ئیمامی ئەوزاعیش دەڵێ : ئەو ئەهلی سەلەفەی، کە پێش ئێمە بون جیاوازییان نەدەخستە نێوان باوەڕو کردەوەوە. (بڕوانە ابن رجب الحنبلی/جامع العلوم والحکم١/١٠٤ هەروەها ابن تیمیە: مجموع الفتاوی٧/١٨٦)

ئەمما كاكەی الحلبي ئەوە پێویست بە بەلگە ناكات، كە رای چییەو چۆنە ؟ چونكە لە هەمو كتێب و شریتەكانیدا هەر جەخت لەوە دەكاتەوە، كە كردار مەرجی تەواوێتی باوەڕە، بەوەندەش ناوەستێت، بەلكو لەو باوەڕەدایە، كە ئەوانەی دەڵێن كردار مەرجی هەبونی باوەڕە، ئەوە لەسەر رێڕەوی موعتەزیلەو خەواریجن!!

ئەمە سەیرە! چونكە ئاشكرایە، كە خەواریج ئەنجامدانی یەك گوناحیان بەلاوە كوفرە. موعتەزیلەش دەڵێن شایانی جێگەیەكە، نە دۆزەخەو نە بەهەشت. ئیمامی مروزی دەرهەقیان دەڵێ: باوەڕ لە لای موعتەزیلە تەوەری هەمو ملكەچی وپەرستنەكانە، هەر كەسێك كەمتەرخەمی لە باوەڕدا بكات فاسق دەبێت، نە موسوڵمان ماوە نەكافریش بوە.(ابن تیمیة/ الایمان ل ٣١٩_٣٢٠).

ئەهلی سوننەت و جەماعەت مام ناوەندین لە نێوان (مورجیئە)و (خەواریج و موعتەزیلە) دان بە پێچەوانەی مورجیئە، چونكە ئەو كەسە بە كافر دەزانن، كە بە یەكجاری كردار واز لێ دەهێنێت[1]، ئەو كەسەش بە كافر نازانن، كە هەندێك كردار واز لێ دەهێنێت، هەرچەندە لە ناو خۆشیاندا رایان جیاوازە لەسەر واز هێنان لە چوار روكنەكەی تر ( غەیری شایەتمان)..

ئەم عەلیل حەلەبیە لە هەمو (سەلەفی) یەكانی تر زۆرتر خۆی بە قسەكانی ئیبنو تەیمییەی رەحمەتیدا هەڵدەواسێ دەستی لە هەر قسەیەكی گیر بێت، دای دەبڕێت و بۆ خۆی دەكاتە پەلەبەلگە!! ماناشی بۆ دادەنێ!! بەلام

---

[1]- ئیمامی ئیبنو تەیمیە دەڵێ : (مەبەست لێرەدا كردەوەیەكی دیاری كراو نییە بەڵكو هەر كەسێك لە دڵەوە باوەڕی بە خواو پێغەمبەرەكەی هەبێت، ئایا وای لێ چاوەڕوان دەكرێت ئەگەر پێغەمبەری خوای بینی وا دوژمنەكانی بەرامبەری وەستاون و بەرامبەری دەجەنگن، ئەمیش سەیریان دەكات و دەشتوانێت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەرخات و خەڵكانی تریش بۆ سەرخستنی هان بدات، ئایا ئاساییە ئەگەر بۆ سەرخستنی پێغەمبەرەكەی هیچی نەكرد؟!) مجموع الفتاوی٧/٣٤٠.
دواتریش دەڵێ: (پێشتر باسمان كرد، كە توخمی كردەوە لە پێداویستیەكانی باوەڕە) مجموع الفتاوی ٣٧٥/٧ .

زۆریـش نابـات یـەکێکی ئـەهلی سـوننەتی لـێ زیـت دەبێتـەوەو ریسـەکەی لـێ دەکاتـەوە بـە خـوری و تەدلیسـەکەی کەشـف دەکـات... چـونکە خـۆ قسـەکانی ئیبنوتەیمییەو ئیمامە بەڕێزەکانی تری ئـەهلی سـوننەت وجەماعـەت لـە رۆژی رون ئاشـکرا تـرن، زۆر ئاسـانیش هـەزاران قوتـابی نیمچـەخوێندەواری وەکـو ئێمـەمانانیش دەتـوانین بیکەینـە گلـۆپ وعەقیدەکـەی عـەلیل حەلـەبی و هاوڕێیانی پێ دەرخەین.

جێـی سەرسوڕمانە، کـە چۆن کاکـەی عـەلیل حەلـەبی کڵاوی مورجیئـەی گردۆتە سەر ئیبنوتەیمییەی رەحمەتی؟! چۆن خستوێتیە رِیزی (ئەوانەی) کە باوەڕیـان وایـە (کـردار) مـەرجی تـەواوێتی بـاوەڕە، نـەك مـەرجی هـەبون و ناواخنی![1] لە هەموشی سەیرتر ئەوەیـە دەبـینی عـەلیل حەلـەبی، هەنـدێك راو بۆچونی ئیبنوتـەیمییەی هێناوەتەوە بۆ بـەهێز کردنـی بۆچـونی خـۆی، کەچـی دەقەکـەی ئیبنوتەیمییـە لـە عەقیـدەدا هـەر دژی بیدعەکـەی عـەلیل حەلـەبی خۆیەتی، ئەمە جگە لەوەی، کە هەمو کەس دەزانێت ڕاو بۆچون و فـەتواکانی ئیبنوتەیمییـە و هەڵوێسـتە عەمەلیـەکانی ژیانیشـی، هـەر پێچـەوانەو دژی مورجیئەو شوێن کەوتوەکانیانن...

**تێبینییەك**: ئەوە بزانە کە (کردار) لە پێناسەی شەرعدا مەبەست هەر لـە (کردن) ی داواکراوەکانی وەك نوێژو رۆژوو.. هتد نیـە، بـەڵکو (نـەکردن) یشـە، وەك شیرك وسیحرو ...هتـد. وەکو ئیمامی ئیبنوحەجەر لـە (فـتح البـاري) دا دەڵێ: نەکردن کردارە .. (فتح الباري ٣/٣٩٤) ..

سـەلەفیەکانی بـەر سـێبەرو مەدخەلیـەکان وپاڵانتـەوانانی سـەلەف، کـە باوەڕیان وایە: کردار مەرجی هەبونی باوەڕ نییە، مەبەستیان لەومیە، کە هـەر کـەس بـە دڵ بـاوەڕی کـردو بـە زمـان بڕیاریـدا، بـا هـیچ فـەرمانیش جێبـەجێ نەکات و بەرهەڵستیەکانیش ئەنجام بدات واتە: با (فعل مأمور) نـەکات و (ترك

١ـ بۆ نمونە بڕوانە: لاپەڕە ٢٧ـ٢٨ی صیحة نذیر/الحلبي.

محظور)یش بکات! هەر موسوڵمانە، بەڵام باوەڕی نوقسانە (مؤمن ناقص الایمان)ە و لە ئاگری دۆزەخدا بە نەمری نامێنێتەوە. بۆیە ئەم دوو جۆرە هەڵوێستەش (نەکردنی هەمو فەرمانەکان) و (کردنی هەمو ئەو کردارانەش، کە خەڵکی پێ کافر دەبێت) ئەگەر کەسێك هەردووکیشیان ئەنجام بدات، هەر کافر نابێت، بەڵکو دەکەوێتە (کوفری کردارەوە)! واش منجەمنج دەکەن، کە بکەری ئەم هەمو سەرپێچییە ـ ئەگەر گوناحەکان لە دڵ و دەرونیدا بە حەڵاڵ نەزانێت ـ کافر نابێت! بەمەش هەڵوێستی (مرجئة الفقهاء)و (مرجئة الغلاة) یان لە خۆ گرتوە..

شەقرە لە تەواو کردنی قسەکانی پێشوی دا دەڵێ: (ئەگەر کەسێك شایەتمانی هێناو بەدڵی قەناعەتی کردبو و باوەڕی بە داواکاریەکانی باوەڕ کرد بو، با هەرچی گوناحیش هەیە ـ ئەوی دیارەو ئەوی شاراوەیەـ بیکات هەر موسوڵمانە، مادام نکوڵی لەوانە ناکەن، کە زەروریاتی دینن...[1]

ئا ئەم قسەیەی شەقرەیە، کە لەم زەمانەی ئێمەدا ئاوا دەری دەپەڕێنێت، لە زەمانی ئیمامی ئیبنوتەیمییەشدا خاوەنی هەبو، ئیمامیش بە شمشێری حەقناسی روەوڕویان رادەوەستایەوە.. ئیمامی ئیبنوتەیمییە لە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە دەگێڕێتەوە ـ رەحمەتی خوای لێ بێت ـ کە مورجیئە زۆرجار بە راشکاوی وایان نەدەوت، چونکە ئەهلی سوننەت باوەڕو کرداریان بە لازم و مەلزومی یەکتر دەزانی، ئەمما ئەوەتا شەقرە هەر بە عالەمی ئاشکراو بە راشکاوی هاوار دەکات!!

ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ: (ئەحمەد دەیگوت: بابای مورجیئە کە دەڵێ: کابرا بە شایەتمانەکەی موسوڵمان دەبێت، باشە دەبێ حەتمەن ئیقرار بکات، کە زەکاتیش فەرزە، بەڵام ئەگەر پێنج درهەمی لە کۆی دوو سەد درهەم زەکات

[1]– الشقرة : هي السلفية ل ١٢٢.. تەماشاکە چۆن کابرا هەر بە موسوڵمان دەناسێنێت ئەگەرچی هەرچی گوناهیش هەیە بیکات! ! سەیری ئەم دیوارە تاریکانەی نەزانین کە چ ئەستوورن؟!

نـەدا (واتـە عەمـەلی بـە باوەڕەکـەی نـەکرد) هـەر موسـوڵمان دەمێنێـت؟ مورجیئەکـە هـەر دەڵـێ: بـەڵێ. باشـە ئەگـەر کـابرا زەننـاری بەسـت(قایشـە پانەکەی ناوقەدی قەشەی مەسیحی)و نوێژی بۆخاچ کردو چوە کڵێسای دیـان و بـەیعی جولەکـە (پەرسـتگای جولەکـە نـاوی بەیعـە)، ئینجـا هـەمو گوناهـە گەورەکانیشـی کـرد، حەتمـەن بابـای مورجیئـە هـەر دەبـێ بـە موسـوڵمانی بناسێنێت!! ئەمەش شورەییەکی گەورەیەو پێیانەوە دەلکێت..

منیش دەڵێم (ئیمامی ئیبنو تەیمییەیە خۆی دەڵێ منـیش دەڵـێم): ئەمـەی ئیمام ئەحمەد گوتویەتی باشترین بەلگەیـە بـۆ بەرپەرچدانەوەیان، چونکە لـە سوچێکیان دەپەستێوێت و ناتوانن خۆ قوتـار کـەن. ئـاخر بۆیـە کـە قسـەزان و ڕەوانبێـژو دەم هەراشـەکانی وەکـو جـەهم و ئـەوانی تریـان ناچـار بـون بڵـێن: ئەگەر کەسێك ئەوکردەوە ئاشکرایانەی ئەنجامدا لـە دڵـەوە کـافر نابێـت، بـەڵام دەبنە بەلگەی دنیایی بۆ کافر بونی) مجموع الفتاوی٧/٢٥٠.

بزانە ئەوەی ئەو ئیمامە بەرێزانەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەربـارەی جەهم و ئەوانی تر گوتویانە، کتومت دەڵێی بۆ (سەلەفی) یەکانی ئەم زەمانـەی ئێمەی دەڵین: تەنانەت ئەم سەلەفیانەی زەمانی ئێمە، هەر بۆری مورجیئـەی کۆنیان داوەتەوە، ئەمان دینداریەکـەیان لـە لۆکـەی نـاو ئـاو نـەرمتر کردۆتـەوە، نەتبینی دەیانوت: ئەگەر کەسێك هەمو گوناحەکان بکات هەر پێی کافر نابێت، نە لـە دنیـاو نـە لـە ئـەحکامی ڕۆژی دواییشـدا !! مـادام لـە نـاخی دڵـەوە کـافر نەبوە!!

قسـەی شـێخی ئـەلبانیمان هێنایـەوە، کـە ئـەو کەسـەش هەرچـی سەرپێچـی فەرمانی خوا هەیە بیکات، هەر کافر نابێت !!

# ڕێڕەوێکی پێویست بۆ باسی دووەم[1]

هـەر لەسـەردەمانی یـاوەران و تابعینـەوە، نـاكۆكی دەربـارەی پێناسـەو پێكهاتەی باوەڕ كەوتە ناو زانایانی ئیسلامەوە :

* **ئەهلی سوننەت و جەماعەت:** ئەمانیش بون بە دوو دەستەوە :

- **نوێنەرانی سەلەف:** ئەوانەی كە دەیانگوت: باوەڕ سێ شتە: قەناعەتی دڵ و بڕیاری زمان و ئەنجامدانی توخمی كردار .. ئەمەش بۆچونی جمهوری زانایانی ئیسلامە وەكو سێ پێشەوا مالیك و شافیعی و ئەحمەدو ئەو هەزارانەی دینیان لێوە وەرگیراوە، بەڵگەی ئـەمانیش بـەهێزترەو، بـە هـیچ كلۆجێك گومـان بـۆ بەهەڵەداچونیان ناچێت..

- **مورجیئەی شەرعناسان:** كە هەر لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت بون وەكو ئیمامی ئەبو حەنیفەو یاوەرانی و شەرعناسانی ئـەو سـەردەمەی كوفـە، ئـەمان دەیانگوت: باوەڕ بریتیە لە قەناعەتی دڵ و بڕیاری زمـان .. كـردەوە بەرهـەمی باوەڕەو تەواوكەرێتی نەك پێكهاتەی ..

- **گـروپ لـە بەرامبـەر ئـەهلی سـوننەت زۆر هـەبون،** لەوانـە: مورجیئـە: یـان ئـەهلی ئیرجـاو، واتـە ئەوانـەی كـردار دوادەخـەن و دەڵـێن كـردار بـە بـاوەڕەوە نـەلكاوە..ئەمانـە دەڵـێن: هـەر كەسـێك لـە نـاخی خۆیـدا بـاوەڕی هێنـابو، ئـیتر ئەگەر هیچ كردەوەیەكی چاكیش ئەنجام نەدات و، هەر هەمو كـردەوە بـەدەكان ئـەنجام بـدات، هـەر موسـوڵمانەو بـاوەڕی هـەر وەكـو بـاوەڕی پێغەمبـەران و

---

١ـ وەرگێڕ نوسیویەتی .

فریشتە وایە، چونکە هەمو ئەوانەی باوەڕ دێنن لە ئەسڵی باوەڕەکەیاندا، کە وا لە دڵیاندا وەکو یەکن، چونکە باوەڕ زیادو کەم ناکات .. نکوڵی لە ناوو سیفەتەکانی خوای گەورەش دەکەن .. ئیمامی ئیبنولقەییم دەڵێ پێنج سەد زانای ئەو سەردەمە بە کافری زانیون... دامەزرێنەری ئەم گروپە ناوی جەهمە (ئەبومیحرزی راسبیجەهمی کوڕی سەفوان) خۆراسانیەو لە کوفەوە سەری هەڵدا، یەکێکە لە زیت و وریاو زمانلوسانی مێژوی عەقیدەو فیکر، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر ئیعتیمادی دەکردە سەر ئەقڵی خۆی زو تێکەوت، تەنانەت بۆ ماوەی چل رۆژ وازی لە نوێژیش هێنا! ساڵی ١٢٨ ك یەکێك بو لەوانەی دژی دەسەڵاتی ئەمەویەکان شۆڕشی بەرپا کرد، بۆیە لە دوای شەرێك سیلمی کوڕی ئەحوەزی مازنی بە دیل گرتی و کوشتی .. سەیر ئەوەیە دەسەڵاتدارانی ئەمەوی لە دوای کوشتنی ئەوەوە کەوتنە رەواج پێدانی دیدو بۆچونی جەهم، چونکە لە بەرژەوەندی ئەوان بون، کە دەسەڵاتی سیاسییان زەوت کردبو .. بەڵام لە ١٣٢ دا کۆتاییان پێ هات .. ئیمامی ئەبوحەنیفەو ئیمامی ئەحمەد بە کافریان دادەنا [1]

---

١ـ سەرچاوە لەسەر جەهم زۆرە لەوانە دکتۆرا نامە هەیە، موناقەشەی شێوازی ژیان و دیدو بۆچوونی دەکات، هەروەها هەڵوێست و رێبازی سیاسی و چۆنیەتی کوشتنی.. دەشێت تەماشای (الذهبي: سير أعلام النبلاء ٦/٢٦/٢٧) و ابن كثير : البداية و النهاية ٩/٣٥١ و تاريخ بغداد ١٣/٣٨٢) بکرێت ..

# باسی دووەم

## مەدخەلی و پالأنتەوانانی سەلەفێتی لەسەر عەقیدەی (مُرجِئَة الفُقَهاء)ن!

### ئایا کردار مەرجی هەبونی باوەڕە یان تەنها مەرجی تەواوێتیەتی؟

ئیمامی شافیعی بەڕێزمان - ڕەحمەتی خوای لێ بێت - دەڵێ (کـان الاجماعُ مِن الصحابةِ والتابعينَ مِن بعدِهم وَمَنْ أدْرَكْنَاهُم يَقولون: الايمانُ قولٌ وَعمَلٌ ونيَّةٌ، لا يُجْزِئُ واحِدٌ مِن الثلاثةِ إلا بِالاخَرِ)[1] کۆڕای ئەسحابەو شوێن کەوتوانی دواتریان و ئەوانەی ئێمە پێیان گەیشتوین، هەمو هەر دەیانوت: باوەڕ: گوفتارو ڕەفتارو نییەتە، هیچ یەکێك لەم سیانە بە تەنها داد نادات ..

حەنبەل دەڵێ: (حدثنا الحميدي قال: وأُخبرتُ أنَّ أناسا يقولون: من أقرَّ بالصلاة والزكاة والصوم والحج ولم يفعل من ذلك شيئا حتى يموت، ويصلي مُستدْبِرَ القِبلةِ حتى يموت، فهو مؤمن ما لم يكن جاحدا إذا علم أن تركه ذلك فيه إيمانه اذا كان مقرا بالفرائض واستقبال القبلة. فقلت: ذاك الكفر الصراح وخلاف كتاب الله وسنة رسوله وعلماء المسلمين. قال الله تعالى ( وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّـهَ مُخْلِصِينَ لَـهُ الدِّينَ) البينة/٥ قال حنبل (سمعت ابا عبدالله احمد بن حنبل يقول: من قال هذا، فقد كفر بالله ورد على الله أمره وعلى الرسول ما جاء به)[2] واتە: حەمیدی (مامۆستای ئیمامی بوخارییە) قسەی بۆ کردین وتی: هەواڵم پێ گەیشتوە، کە

---

١. ابن تيمية، مجموع الفتاوى چاپی ساڵی ١٣٨٢ ب٧/ل٣٠٩ .
٢ـ ابن تيمية، الايمان ل ٢٠٨.

هەندێ کەس هەن (مەبەستی مورجیئەکان بو) دەڵێن: هەر کەس دان بەوەدا بنێت، کە نوێژو وەکات و ڕۆژوو حەج فەرزە، بەڵام هیچیشیانی تا مردن نەکرد، هەروەها تا مردنیشی هەر پشتی لە قیبلە بو (یەعنی ئاڕاستەو روی لەو شوێنە نەبو، کە موسوڵمانان هەیانە) هەر بە موسوڵمان حسێبە بەو مەرجەی لە ناخی خۆیدا نکوڵی لەو فەرزانە نەکات و باوەڕیشی وا بێت، کە واز هێنانەکەی هەر ئیمانداریيە! منیش دەڵێم (حەمیدی دەڵێت: منیش دەڵێم): ئەوە کوفری راشکاو رونە، ئەوە پێچەوانەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرو صلى الله عليه وسلم، بۆ چونی زانایانی موسوڵمانە. خوای گەورە دەفەرموێ: جەختی ئەوەیان لەسەر کراوەتەوە کە تەنها خوای گەورە بپەرستن و دینداری سەرڕاستانەش لەبەر خاتری ئەو بکەن.. حەنبەلیش دەڵێ: گوێم لە ئەبو عبدالله ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بو دەیگوت: هەر کەس وا بڵێت ئەوە کافر دەبێت، ئەوە دینەکەی خوای بۆ خوا رەت کردۆتەوەو ئەوی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هێناویەتی داوێتیەوە بەسەریدا !!

شەیخوالاسلام ئیبنوتەیمییەش دەڵێ: (قالَ محمد بنُ نصر المروزي فَمَنْ كانَ ظاهِرُهُ أعمالُ الاسلامِ ولا يَرجَعُ الى عُقُودِ الايمانِ بِالغيبِ فهو مُنافِقٌ نِفَاقَاً يُنْقِلُ عن الْمِلَّةِ، ومَنْ كَانَ عَقدُهُ الايمانُ بالغيبِ ولا يَعْمَلُ باحكامِ الايمانِ وشرائعِ الاسلامِ فهو كافِرٌ كُفْرَاً لا يَثْبُتُ معَهُ توحيدٌ )[١]واتە: محمدی کوڕی نەسری مەروزی دەڵێ: هەر کەسێك بەسەرزارەکی فەرزە ئیسلامییەکان جێبەجێ بکات، بەڵام لە ناخیدا خۆی پابەند نەکردبێت بە داواکارییەکانی باوەڕەوە ئەوە دووڕوە. هەر کەسێکیش لە ناخەوە پابەند بو بێت بە داواکارییەکانی باوەڕەوە، بەڵام بە فەرزەکان وشەریعەتە ئیسلامییە دەرەکییەکانەوە پابەند نابێت ئەوە کافرە، کوفرێکی واشە کە خوابەیەکناسی پێوە نامێنێت.

١ـ هەمان سەرچاوە: لاپەڕە ٣٢٢ .

ئیمامی ئیبنوتەیمییـە خۆشی، کـە باسـی کـردار دەکـات ـ کـە دەبێـت لەگـەڵ باوەڕدا ئەنجام بدرێت ـ وای باس دەکات، کە هەر کەسێك بـە دیـاردەو رواڵـەتی فەرزە ئیسلامیەکانەوە پابەند نەبو، بە کافر دەژمێررێت. بۆیە دەڵێ: (فإن الله لما بعث محمدا رسولا الى الخلق، كان الواجب على الخلق تصديقه في ما أخبر، وطاعتـه في ما أمر، ولم يأمرهم حينئذ بالصلوات الخمس، ولا صـيام شـهر رمضـان، ولا حـج البيت، ولا حرم عليهم الخمر والربا، ونحو ذلك، ولا كان أكثر القـران قـد نـزل، فمـن صدقه حينئذ فيما نزل من القران وأقر بما أمر به من الشهادتين وتوابـع ذلـك، كـان الشخص حينئذ مؤمنا تام الايمان الذي وجب عليه، وإن كان مثل ذلك الايمـان، لـو أتى به بعد الهجرة لم يقبل منه ولو اقتصر عليه كان كافرا)[1] واتە: کاتێك کە خوای پەروەردگار محمدی بە نێرراوی خۆی نـارد بـۆ خـەڵکی، ئـەوە فـەرز بـو لەسـەر خەڵکەکە، کە هەرچی ئەو دەیفەرموێ، دەبێت ئەمان بەراسـتی بـزانن، دەبێـت گوێ رایەڵی ئەو فەرمانانە بن، کە ئەو دەریان دەکات، ئەو زەمانە هێشتا پێـنج فەرزی نوێژو رۆژووی رەمەزان وحەجی ماڵی خوایـان لەسـەر فـەرز نـەکرا بـو، هێشـتا شـەراب و سـو(ریبـا)و شـتی تـری وایـان لـێ حـەرام نـەکرا بـو، هێشـتا زۆرینەی قورئانیش نـەهاتبوە خـوارەوە، جـا لـەو زەمانـەدا هـەر کـەس بـاوەڕی بەوەندە قورئانـە هێنابـا، کـە هـاتبوە خـوارەوەو شـایەتمانەکەی هێنـا بـاو بـەو ئەرك و فەرزانەش هەستا با، کە شایەتمانەکەی داوای کرد بو، ئەوە موسوڵمانی تەواو ئیمانداری کامل بو، چونکە هەرچی لەسـەری فـەرز بـوە بـەجێی هێنـاوە، بەڵام ئەگەر دوای کۆچی پێغەمبـەر صلى الله عليه وسـلم بـۆ مەدینـە هـەر ئـەو ئەندازە باوەڕەی بهێنایە (واتە قەناعەتی دڵ و بڕیاری زمـان) وبیوتایـە بەسـە، لێـی وەرنـەدەگیرا. گـەر بیشـیوتایە ئیسـلامەتی هـەر ئەوەندەیـە بـە کـافریش حسێب دەکرا..

١ـ ابن تيمية، مجموع الفتاوى ٧/٣١٦ـ٣١٧.

**ئیمامی ئیبنوتەیمییە هەمیشە ولە هەمو کتێبەکانی خۆیدا ـ وەکو هەمو زانایانی پێشین ـ جەخت لەوە دەکاتەوە، کە حوکمی هەر کەس کردارو باوەڕ بە لازم و مەلزومی یەکتر نەزانێت، حوکمی وەکو حوکمی مورجیئەیە [1]، چونکە کردار مەرجی هەبون و سەلامەتی و دروستی باوەڕە، نەك مەرجی تەواوێتی، واتە ئەوە نییە ئەگەر کەسێك کردەوەکانی ئیسلامەتی ئەنجام نەدا بە موسوڵمانی باوەڕ ناتەواو حسێب ببێت، نا، ئەوە ـ ئیمامی ئیبنوتەیمییەو زانایانی تری پێشین ـ بە موسوڵمانی دانانێن. چونکە باوەڕەکەی دانەمەزراوە.. لەوەی سەرەوەشدا، کە گوت:ی حوکمی ئەو کەسە وەکو حوکمی مورجیئە وایە یەعنی: ئەو کەسەی باوەڕی لە ناخی دڵیدا هێناوە، بەڵام کردەوەی پێ ناکات وەکو مورجیئەکانە، کە دەڵێن: (إن العبد قد يكون مؤمنا تام الايمان، إيمانه مثل إيمان الانبياء والصديقين، ولو لم يعمل خيرالا صلاة ولا صلة ولا صدق حديث، ولم يدع كبيرة إلا ركبها، فيكون الرجل عندهم إذا حدث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا أؤتمن خان، وهو مصر على دوام الكذب والخيانة ونقض العهود، لا يسجد لله سجدة، ولا يحسن الى أحد حسنة، ولا يؤدي الامانة، ولا يدع ما يقدر عليه من كذب وظلم وفاحشة إلا فعلها، وهو مع ذلك مؤمن تام الايمان، إيمانه مثل إيمان الانبياء .. وهذا يلزم كل من لم يقل إن الاعمال الظاهرة من لوازم الايمان الباطن )[2] واتە: لەوانەیە کەسێك باوەڕەکەی ئەوەندە تەواو بێت وەکو باوەڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان**

١ـ لازم و مەلزوم: لازم یەعنی ئەوەی کە بۆ بوونی شتێك پێویستە وەکو دەستنوێژ بۆ نوێژ، مەلزوم: یەعنی ئەوەی کە پێویستی بە شتێکی ترە کە لازمێتی، وەکو نوێژ کە پێویستی بە دەستنوێژە. ئیمامی ئیبنو تەیمەییە دەڵێ کردەوەش لازمی باوەڕە، باوەڕ بێ کردەوە نایەتە هەبوونەوە، باوەڕیش، کە مەلزوومە پێویستی بە کردەوەیە، تا پێی دەرکەوێت و بسەلمێت. بۆیە دەفەرموێ: (متى وُجِدَ الملزومُ وُجِدَ اللازِمُ، وَمَتى انْتَفى اللازِمُ انتَفَى المَلزومُ، واذا انتفى لازِمُ الشَّئِ عُلِمَ انَّهُ مُنْتَفٍ ) بڕوانە: ( موافقة صحيح المنقول لصريح المعقول ٥٣/١) واتە: هەر مەلزومێك هاتە دی بەلگەنەویستە، کە لازمەکەشی هاتۆتە دی، لازمی هەر شتێکیش نەهاتە دی مەلزومەکەشی نایەتە دی، لازمی هەر شتێك نەما، یەعنی ئەو شتە خۆشی نەماوە..

٢ـ ابن تيمية، مجموع الفتاوى ٣٥٦/٧.

بێت، یا نوێژیش نەکات، یا سیلەی روحم و خزمایەتیش بەجێ نەهێنێت، یا راستگۆش نەبێت، یا هەرچی گوناحی گەورەش هەیە بیکات، یا هەمو قسەیەك، کە دەیکات درۆ بێت و هیچ بەڵێنێکی نەباتە سەرو دەست پیسی ئەمانەتیش بێت.. یا بەردەوام درۆ بکات و سور بێت لەسەر خیانەت و پەیمان شکاندن.. یا هەر سوجدەیەکیشی بۆ خوای گەورە نەبرد بێت وچاکەی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکردبێت.. یا هەرچەند لە توانایدا بوبێت درۆو دەستدرێژی و زوڵم و ستەمو خراپەکاری و داوێن پیسیشی کرد بێت، هەرچییەك بکات هەر موسوڵمانەو باوەڕەکەشی هەر وەکو باوەڕی پێغەمبەران وایە!

قسەی ئەو کەسەی کە دەڵێت کرداری دەرەکی بەشی هەبونی باوەڕو قەناعەتی ناخ نییە، وەکو ئەم قسەیە وایە ..

ئیمام محمد بن عبدالوهاب رحمەالله دەڵێ: (لا خلاف أن التوحید لابد ان یکون بالقلب واللسان والعمل، فإن اختل شئ من هذا لم یکن الرجل مسلما، فإن عرف التوحید ولم یعمل به فهو کافر معاند ککفر فرعون وإبلیس وأمثالهما)[١]واتە: هیچ رایەکی جیاواز لەسەر ئەوە نییە، کە یەکخواپەرستی دەبێت بە دڵ و زمانو کردار بێت، هەر کەس نوقسانییەکی خستە ناو ئەمانەوە، بە موسوڵمان ناژمێررێت ئەگەر کابرایەك خوابەیەك بناسێت، بەڵام کار بەو تەوحیدەی نەکات، ئەوەکافرێکی سەرسەخت وعینادە، کوفرەکەشی وەکو کوفری فیرعەونو شەیتان و ئەوانی تر وایە...

---

١ـ محمد بن عبدالوهاب، کشف الشبهات ل ٤٠

# باسی سێیەم

## ئەگەر راست دەکەن با ئیمامی ئیبنوتەیمییە حەکەم بێت!

وتمان، کە سەلەفییەکان بۆ بەرگری لە کافرێتی حاکمەکان و خۆ لێسانەوەی بەر سێبەری خۆیان، بە کوڵ و دڵ هەوڵی ئەوە دەدەن، کە کردار لە پێکهاتەی باوەڕ بهێننە دەرەوە، بۆیە دەڵێن: کردار مەرجی باوەڕ نییە.. جا چونکە زۆریش ناوی ئیمامی ئیبنوتەیمییە دێنن، با ئەمجارە بیانبەینە لای شێخوئیسلام وئەو داوەریمان بکات، بەڵکو خوا بکات ئەمانەمان بۆ بگێڕێتەوە ناو ئەهلی سوننەت و جەماعەت..

ئیمامی ئیبنوتەیمیەی رەحمەتی دەڵێ: (خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾﴾ القيامة، واتە: نە بە راستی زانی نە نوێژی کرد، بەڵکو بە درۆی خستەوەو پشتی هەڵکرد. ئەمە ئەوە دەگەیێنێت، کە پشت هەڵکردن بە درۆخستنەوە نییە! بەڵکو پشت هەڵکردنە لە ملکەچی و گوێڕایەڵی. فەرزە لەسەر خەڵکی، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە هەموو ئەوانەدا کە دەیانفەرموێت بە راست بزانن، ئینجا فەرزێکی تریشیان لەسەرە، کە ملکەچی کردنی فەرمانەکانی و گوێڕایەڵی کردنێتی. پێچەوانەی بە راستگۆزانینیش بە درۆزن دانانە، پێچەوانەی ملکەچی و گوێڕایەڵیش پشت هەڵکردن و یاخی بونە بۆیە خوای گەورە ئاوا فەرموی: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾﴾. مەگەر نابینیت نەفی باوەڕ وا لەو کەسانە دەکات، کە لافی باوەڕ هێنانەکە لێدەدەن و دەشڵێن ملکەچی دەردەبڕین، بەڵام بە کردار وا ناکەن، دەرهەقیان دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ النور/٤٧ واتە: دەڵێن باوەڕمان بە خواو بە پێغەمبەر هێناوەو ملکەچیش دەردەبڕین، بەڵام دواتر کۆمەڵێکیان

پشت هەڵدەکەن و گوێ نادەنە ئەوەی دەیانوت! ئەوانە موسوڵمان نین.. خۆ لە زۆر جێگای قورئان وسوننەتدا نەفی باوەڕ لەو کەسانە کراوە، کە باوەڕ هێنان هەر بە قسە ئاشکرا دەکەن وکردار بە باوەڕەکەیان ناکەن، هەر وەکو کە دەبینی نەفی باوەڕ لە دووڕووەکان دەکات (ابن تیمیة: الایمان لا ١٤٥ــ١٤٦). یەعنی دووڕووەکان، کە سەرزارەکی کردەوەکانیان ئەنجام دەدا، هەر نەیخستنە بازنەی موسوڵمانێتییەوە، ئەوانە کە کرداریشیان دەکرد! ئەدی ئەوانەی کردار ئەنجام نادەن چۆن ؟!

هەروەها لە جێیەکی تردا دەفەرموێ: ( گەر وا دانێین کە خەڵکێك بهاتنایەتە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و بیانوتایە: ئێمە لە ناخی دڵمانەوە - بێ هیچ گومانێك - باوەڕمان بەوە هەیە، کە تۆ هێناوتە، بە زمانیش بڕیار دەدەین، بەلاّم لەو فەرمانانەی، کە دەری دەکەیت، یان لەو بەرهەڵستیانەی دەیگریتەبەر بە قسەت ناکەین و گوێڕایەڵت نابین! نوێژەکان ناکەین، بەڕۆژوو نابین، حەج ناکەین، قسەی راست ناکەین، راسپاردە نادەینەوە خاوەنی، بەڵێن نابەینە سەر، سیلەی روحمی خزمایەتی لەگەڵ یەکتر دەپسێنین، هیچ کارو کردارێکی چاکە لەوەی تۆ فەرمانت پێکردوە نایکەین (واتە سورن لەسەر ئەوەی کە توخمی کردار، کە لە پێکهاتەی باوەڕە واز لێبهێنن) شەراب دەخۆینەوەو لەگەڵ ئافرەتی مەحرەمی خۆمان بە ئاشکرا زینا دەکەین وهەر کەسێکیشمان لە ئوممەت ویاوەرانی تۆ بەردەست کەوت دەیکوژین و سامان وماڵیان تالاّن دەکەین وتەنانەت تۆ خۆشت دەتکوژین و دەچینە بەرەی دوژمنەکانت بۆ شەڕ کردن دژت (واتە: هەمو کارە حەرام کراوەکان و ئەوانەش کە خەڵکی پێیان کافر دەبن) ئاخر لە حاڵەتێکی وادا ئاقڵێك هەیە وا بزانێت، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێیان دەفەرموێ: دەی ئێوە موسوڵمانن و باوەڕەکەشتان کۆتا پلەی تەواوێتییەو ئێوە شایانی شەفاعەتەکەی قیامەتی منن و، ئومێدم وایە کەستان نەخرێنە ئاگری دۆزەخەوە.. کەسی ژیر بە بیریدا دێت وا بزانێت، کە پێغەمبەر صلی الله علیه

وسلم ئاوایان پێ دەفەرموێ ؟! یان پێیان دەفەرموێ: ئێوە لە هەمو كەس كافرترن، باوەڕتان بە هیچ شتێكی ئەو پەیامە نییە كە من هێناومە حەتمەن ئەگەر تۆبە نەكەن و لەوە پەشیمان نەبنەوە، كە وتویانە لە گەردنیشیان دەدات)[١] لە(مجموع الفتاوی ب٧ /ل٣٧٢) شدا دەفەرموێ: شتێكی نامومكینە كەسێك بە موسوڵمانی خاوەن باوەڕ بژمێررێت، لە كاتێكدا كە لە تەمەنیدا سوجدەیەك بۆ خوا نابات ور ۆژوی رەمەزان ناگرێ و زەكات نادات و حەج ناكات.. ئەمە هەر دووڕویی و كافر بونە، ئەمە باوەڕی راستی لە دڵدا نییە، چونكە خوای پەروەردگار سوجدەبۆخوانەبردنی بە سیفەتی كافران داناوە، وەكو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾﴾القلم/واتە: ئەو رۆژەی لاق دەردەخرێت، داوایان لێ دەكرێت سوجدە بۆ خوا ببەن، ناتوانن. چاویان زەق كردۆتەوەو زەلیلی ماندوی كردون، ئاخر كە لە دنیادا كە ساغ و سەلیم بون داوایان لێ دەكرا سوجدە ببەن، نەیاندەبرد!!

ئیمامی ئیبنوتەیمیە، كە پێناسەكانی سەلەف دەربارەی باوەڕ دەهێنێتەوە، ئینجا باسی ئەوە دەكات، كە بۆچی ئەوان لە پێناسەكەیدا جیاواز بون. دەڵێ: (هەمویان هەر مەبەستیان ئەوە بوە كە لە پێناسەی باوەڕدا رەدد لە مورجیئەكان بدەنەوە، كە دەیانوت: باوەڕ هەر گوفتارە! واتە هەر قسەیە و بەس! ئەمانیش دەیانفەرمو: نەخێر (قول وعمل) واتە گوفتارو كردارە. ئەوانەشیان، كە باوەڕیان دەكردە چوار بەشەوە، هەر خۆشیان راقەی پێناسەكەی خۆیانیان دەكرد سەهلی كوڕی عبداللەی توستری گوتی: باوەڕ چییە ؟ (الایمان: قول وعمل ونیة وسنة) واتە: باوەڕ: گوفتارو كردارو قەناعەتی

---

١ـ ابن تیمیة: الایمان ل٢٧٩ هۆی ئەوەش كە شایانی كوشتنن ئەوەیە كە لە حوكمی پاشگەز بووەوە (مورتەدد)ان، چونكە بە (بەراستگۆ زانین و شایەتمانەكەیان) چونەتە بازنەی ئیسلامەوە، بەڵام لەسەری نەماونەتەوەو پێوەی پابەند نەبوون، واتە سیفەتی ئیسلامەتیەكەی یەكەمجاریان پێوە نامێنێت، چونكە رەفزیان كردوە كردەوە ئەنجام بدەن، چ كردن بێت چ نەكردن و واز هێنان ) .

دڵ و شوێن کەوتنی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم. چونکە ئەگەر بوترێت: باوەڕ گوفتاری بێ کردارە، ئەوە هەر کوفرە، ئەگەر بشوترێت: گوفتارو کردارە بێ قەناعەتی دڵ، ئەوە دووڕوییە، ئەگەر بشوترێت: گوفتارو کردارو قەناعەتی دڵە بەڵام بێ شوێنکەوتنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، ئەوە بیدعەیە ..(ابن تيمية: الايمان لا ١٧٢) .

هەروەها شێخولئیسلام دەڵێ: (ئەوە رون بوەوە، کە حەتمەن دەبێت دین گوفتارو کردار بێت، چونکە مومکین نییە کابرایەك هەر بە دڵ، یان بە دڵ و زمان، باوەڕی بە خواو بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەبێت، بەکردەوەش فەرزێك ئەنجام نەدا، نە نوێژێك بکات، نەزەکات و رۆژوو، نە فەرزەکانی تر! بە تەئکید کابریەك هەر بەوەندەی دەڵێت باوەڕم بە خواو پێغەمبەری خوا هێناوە، بەڵام هیچ فەرزێکی ئیسلامەتی جێبەجێ ناکات لەوەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەیانی فەرموە، حەتمەن بە موسوڵمان حسێب ناکرێت.. (ابن تيمية: مجموع الفتاوى ٧/٣٧٨).

دەرهەق حوکمی شەرعی ئەم جۆرە کەسانە دەڵێ: (پێشەوایانی دین حوکمی کوفری ئەم کەسەیان داوە، هەر چەندە ئەمە گریمانێکەو ڕەنگە ڕوبدات! چونکە ناشێت کابرا خۆی بە موسوڵمان حساب بکات و سەریش بە فەرزی خوادا نەدات! نوێژێك، رۆژویەك، زەکاتێك، حەجێك (ئەوانەی فەرزەو دەبێت ئەنجام بدرێن) لەولاوەش هەرچی خوا پێی ناخۆشە بیانکات!! یان نوێژی بێ دەستنوێژبکات، یان رو نەکاتە قیبلە! یان دایکی خۆی مارە کاتەوە! (واتە کوفری کردار بکات) لەگەڵ ئەمەشدا بە موسوڵمان بژمێررێت ؟! نا، حەتمەن کەسێك ئەمانەی لێبوەشێتەوە لە ناخیدا هەر باوەڕی نییە، گەر بیبوایە فەرزێکی پێدەکرد، یان لە حەرامێك دەیگێڕایەوە.. ( ابن تيمية: الايمان لا ٢١٧).

ئیمامی ئیبنولقەییم رحمه الله دەڵێ: لقەكانی باوەڕ دوو بەشن: ئەوانەی گوفتارن و ئەوانەی كردارن. هەروەها لقەكانی كوفریش دوو جۆرن: ئەوانەی گوفتارن و ئەوانەی كردارن. لقە گوفتاریەكانی باوەڕ هی وایان هەیە، گەر لە كەسێكدا نەهاتە دی، باوەڕیشی تێدا نایەتە دی، هەروەها لقەكرداریيەكانیشی ،كرداری وا هەیە لقێكە لە باوەڕ، بەلام ئەگەر نەما باوەڕیش بە دوایدا نامێنێت. لقەكانی كوفریش چ گوفتارەكانی بن، چ كردەوەكانی هەر وان، هەندێ گوفتاری كوفرین هەیە، ئەگەر كەسێك بە ئازادی و سەربەستی خۆی بیانڵێت، پێی كافر دەبێت، هەروەها هەندێك كردار هەیە جۆرێكە لە كوفر. هەر كەس سەربەستانە بێ ناچاركردن كردی پێی كافر دەبێت. وەكو سوجدە بردن بۆ بت، یان ئیهانە كردنی قورئان.. ئەمە بنچینە باسێكە .

بنچینەیەكی تریش هەیە، ئەویش ئەوەیە، كە حەقیقەتی باوەڕ لە گوفتارو كردار پێك دێت:

- گوفتاریش دوو بەشە:

* گوفتاری دڵ: كە بریتییە لە قەناعەت كردن.

* گوفتاری زمان: كە بریتییە لە: وتنی شایەتمان و بڕیاری ئیسلامەتی.

- كرداریش هەر وایە، ئەویش دوو جۆرە :

* كرداری دڵ: بریتییە لە نییەتی خواویستی ونیازپاكی بۆ خوا.

* كرداری ئەندامانی لەش (الجوارح).

ئەگەر ئەم چوارە نەمێنن، ئەوا باوەڕیش بە یەكجاری نامێنێت، ئەگەر قەناعەتی دڵەكە نەما، بەشەكانی تر سودیان نابێت، بە دەرد ناخۆن!

ئەمما ئەگەر قەناعەتی دڵەكە مابو، بەلام بۆ خوا سوڵحانی تێدا نەبو، ئا ئەم خاڵەیە كە جێی مشت ومڕی مورجیئەو ئەهلی سوننەتە. ئەهلی سوننەت دەڵێن: ئەو قەناعەتە هیچ نرخێكی نامێنێت و كابرا باوەڕی نەماوە، قەناعەتی دڵ كامەیە ئەگەر بۆ خوا سوڵحانی پێ نەهاتبێتە دی؟ باوەڕ بون بە خوا چییە ئەگەر خوا خۆشویستن و ملكەچی و گوێڕایەڵی فەرمانەكانی

نەهێنێتـە دی، ئەگـەر کـابرای خـاوەنی بـە شـەرعی خـواوە پابەنـد نـەکات ؟! باوەڕی ئیبلیس و فیرعەون وگەلەکەی وجولەکەوموشریکەکان سودی چی بـو؟! خۆ هەمو ئەمانە دەیانزانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم راستگۆیەو نێرراوی خوایـە! کـافرو جولەکـەکان خـۆ بـەنهێنی و ئاشـکرا ئیعتیرافیـان بـەوە دەکـرد! دەیـانوت: راسـتگۆیەو درۆ ناکـات، بـەڵام نابێـت شـوێنی بکـەوین وبـاوەڕی پێبهێنین! جا ئەگەر باوەڕ بە کرداری دڵ نەمێنێت، جێی نکوڵیش نییە، کە بـە نـەکردنی گـەورەترین کـرداری، کـە بـە ئەنـدامانی لـەش (الجـوارح) ئـەنجام دەدرێت (مەبەستی ئیمام: نوێژ نەکردنە) نەفەوتێت.. چونکە تەسلیم نـەبونی لـەش بەڵگەیـە لەسـەر تەسـلیم نـەبونی دڵ. ئەگـەر راسـتەو دڵ قەناعـەتی بـە ئیسلامەتی کردوە، ئەدی چۆن لەش گوێرایـەڵی ناکات و تـەسلیم نابێـت؟! خـۆ باوەڕ ـ هەر وەکو زوتر رونمان کردەوە ـ هـەر بـە راسـتگۆزانین و قەناعـەتی دڵ نییە، بەڵکو قەناعەت و خۆتەسلیم کردنی دڵـە بـەو شـێوەیەی، کـە ملکەچـی و گوێڕایەڵی و تەسلیم بون بە فەرمانەکانی خـوا بهێنێتـەدی.(ابـن القـیم: کتـاب الصلاة لا ٢٥). پێشتریش لە لاپەڕە(١٩)دا گوتی: (لەئەستەم مەحاڵ تـرە، کـە لـە دڵی کەسێکدا، باوەڕی ڕاست و یەقینی هەبێت، بەڵام ئەوەنـدە کاریگـەر نـەبێت خاوەنەکـەی وا لـێ بکـات فـەرزێك جێبـەجێ بکـات، یـان لـە گوناحێـك دور کەوێتەوە!).

ئیمامی ئیبنوتەیمییـەی رەحمـەتی دێتـەوە سـەر باسـی دڵ و قەناعەتەکـەی نـاخی و دەڵـێ: (دڵ یەکـەم بناغەیـە، ئەگـەر زانـین و ویسـتی تێـدا روا، ئیـدی بەڵگەنەویستە کـە پـەل وپـۆی دەگاتـە هـەمو بـەدەن، چـونکە مـومکین نییـە بەدەن نەیەت بە دەنگ فەرمانی دڵەوە، بۆیە پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێ: ( ألا وإنَّ في الجَسَدِ مُضْـغَةً، إذا صَـلُحَتْ صَـلُحَ لهـا سـائِرُ الجَسَـدِ، وإذا فَسَدَتْ فَسَدَ لها سائِرُ الجَسدِ ألا وهي القَلْـبُ)[1] واتـە: پارچـە گۆشـتێك لـە بەدەنـدا

١ـ ئیمامی بوخاری لە کتاب الایمان ژمارە٥٢ گێڕاوێتیەوە، ئیمـامی موسـلیمیش لـە (المسـاقاه) دا، ئیبنو ماجەش لە کتاب الفتن ژمارە ٣٩٦٤.

هەیە، ئەگەر ئەو چاك بێت، هەمو بەدەنیش بۆی چاك دەبن، ئەگەر ئەویش خراپ بو، هەمو بەدەن بۆی خراپ دەبن، ئەویش دڵە، جا ئەگەر دڵ به باوەڕو کرداری چاك ئاوەدان بۆوە، چاك بونی هەمو بەدەنیش دەخوازێت، دەیەوێت کە گوفتارو رەفتاری چاك بەو باوەڕە گشتیەوە ئەنجام بدات. پێشەوایانی زانستی فەرمودە دەڵێن: (گوفتارو کردار: گوفتاری ناوەو دەرەوە، کرداریش هی ناوەو دەرەوە، دەرەوە شوێنکەوتوی ناوەوەیە هەر کاتێك ناوەوە چاك ببێت، دەرەوەشی بۆ دەرەخسێت و بۆی چاك دەبێت، ئەگەر ئەویان چاك نەبو ئەمیش هیچ .. (مجموع الفتاوی٧/١١٩ـ١٢٠).

هەروەها دەڵێ: (لە قورئاندا لەوەی دەبێتە بەڵگەی ئەوە، کە باوەڕ کردەوەکان دەخوازێت، ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾ السجدة/١٥ واتە: ئەو کەسانە باوەڕیان بە نیشانەو ئایاتی ئێمە هەیە، کە دەخرێتەوە یادیان، یەکسەر دەچنە سوجدە وزیکری خوا بە سوپاسەوە دەکەن و خۆبەزلنازانن.... یەعنی غەیری ئەو کەسانە باوەڕیان نییە، چونکە هەر کەسێك خوای بەم قورئانە خرایەوە یادو پێی وترا ئەمە فەرزی خوایە سوجدە ببەو نەیبرد، ئەوە لە ریزی موسوڵمانان نییە.(ابن تيمية: الايمان لا ١٦١).

کەوا بو خوای پەروەردگار نەفی باوەڕ لەو کەسانە دەکات، کە داواکاریەکانی ئەو باوەڕ هێنانەیان نەهێناوەتە دی، چونکە ئەگەر لازم نەما (کردارو پابەند بون) مەلزومیش (باوەڕەکە) نامێنێت. وەکو کە خوای گەورە ئەوەی رون کردۆتەوە: ﴿ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ ﴾ المائدة/٨١ واتە: ئەگەر باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرەکەی و ئەوەی، کە بۆی هاتۆتە خوارەوە ببوایە، دەبو ئەو ئەوانە نەکەن بە سەرپەرشتیاری

خۆیان (ابن تیمیة / الفتاوی ١٨/١٥٣). ئیمامی ئیبنوتەیمییە دیسان لە کتێبی (الایمان)ەکەیدا لاپەڕە (٣٧٥) دوای ئەوەی بە بەڵگەو هەنجەتەکانی ئیمامی ئەبو ثور مورجیئەکان لە کونێك دەپەستێوێت، دەڵێ دەڵێم: (ئیمام ئەبو سەور دەڵێ: دەڵێم) تا دوای بڕیارو شایەتمان و ئیقرار کردنەکەی، بە کردەوەکانەوە پابەند نەبێت بە موسوڵمان حسێب ناکرێت، چونکە ئەگەر کەسێك ئیقرار بکات، واتە شایەتمان بهێنێت و بڕیار بدات، بەڵام بە کردەوەکانی ئیسلامەوە پابەند نەبێت، بە ئەهلی باوەڕ حسێب ناکرێت.

ئیمامی لالەکائی بە سەنەدەوە لە الوەلیدی کوڕی موسلیمەوە دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: (لە ئەوزاعی و مالیکی کوڕی ئەنەس و سەعیدی کوڕی عبدالعزیزم بیستوە، کە دژی ئەو کەسە بون، کە بیوتایە: باوەڕ هەر بە گوفتارەو کرداری لەگەڵدا نییە! ئەمان دەیانگوت: باوەڕ بەبێ کردار نابێت، کرداریش بەبێ باوەڕ نابێت. (اللالکائي/ شرح اصول اعتقاد اهل السنة والجماعة٢/٨٤٨ ).

باوەڕ بەبێ کردار کاری کافرەکانە، کرداری بێ باوەڕیش کاری دووڕوەکانە.. ئەوەی لێرەشدا ئەو زاناو پێشەوایانە تەئکیدی لێ دەکەنەوە، هەبونی باوەڕەکەیە بە کردارەوە، نەك تەواوێتیەکەی. واتە ئەوان ئەوەیان نەگوتوە: کە کەسێك ئەگەرکرداری نەبو ئیمانداره، بەڵام ئیمانەکەی تەواو نییە! نا، ئەوان گوتویانە: مادام کرداری لەگەڵدا ناکات ئیمانی نییە..

ئیمام محمدی کوڕی عبدالوهاب رحمه الله دەڵێ: (ئەگەر موسوڵمان پەی بە مەزنی و گرنگی تەوحید برد، ئیدی پابەندیش دەبێت بە داواکاریەکانیەوە، چونکە باوەڕ قەناعەتی دڵ و بڕیاری زمان و کرداری بەدەنە، ئەگەر یەکێك لەمانە نەما، ئەوە خاوەنەکەی باوەڕی نەماوەو موسوڵمان نییە، هەر وەکو خوای گەورە لە کتێبەکەی خۆیدا بەیانی فەرموە.. (محمد بن عبدالوهاب: اسباب نجاة المسؤل من السيف المسؤول مجموع التوحيد١/١٨٢).

# باسی چوارەم

## حوکمی ئەو کەسە چییە کە دەڵێت: کردار مەرجی هەبونی باوەڕ نییە؟

**وەڵام: ئـەبو بەکرلخـەللال بـە سـەنەدەوە لـە حەمـدانی کـوڕی عـەلی ئەلومڕاقـەوە دەگێڕێتـەوە، کـە گوتویـەتی: کـە لـە خزمـەت ئیمـامی ئەحمـەدی کوڕی حەنبەلـدا بـوم، باسـی مورجیئـە کـرا، پرسـیارم دەربارەیـان لێکـرد وتم: ئەرێ ئەوانە دەڵێن: ئەگەر کەسێك خوای بە دڵ ناسی، ئەوە ئیدی موسـوڵمانە، گوتی: مورجیئەکان (واتـە مرجئة الفقهاء) وا نـاڵێن، ئـەوە قـەولی جەهمیەکانـە (واتـە غـلاة المرجئـة) ئـەوان وا دەڵـێن، ئـەمما مورجیئـەکان دەڵـێن: دەبێـت بـە زمـانیش ئـەوە دەرببڕێـت، بـا هـیچ کـرداریکیش ئـەنجام نـەدات. قسـەی جەهمیـەکان، کـە دەڵـێن: هـەر کـەس بـە دڵ خـوای ناسـی، بـاکردەوەش ئـەنجام نەدات، کوفرە )[1] .**

**عبداللەی کوڕی ئیمـام ئەحمـەد دەڵـێ: (سـوەیدی کـوڕی سـەعیدی هـورەوی پێی وتین، کە لـە سـوفیانی سـەوریيان دەربـارەی دیـدو پێناسـەی مورجیئـە بـۆ باوەڕ پرسی، گوتی: دەڵێن: باوەڕ گوفتارو کردارە، بەڵام مورجیئـە دەڵـێن: هـەر**

---

١ الخلال : كتاب السنة لا ٩٦، لە سفر الحوالي: ظاهرة الارجاء وەرگیراوە ب٢/لا٣١٨ .

لێرەدا ئاگاداریيـەك هەیـە پێویسـتە باسـی بکـەین: کـە دەوترێـت ( مرجئـة الفقهـاء ) واتـە ئـەو شەرعناسـانەی لەسـەر عەقیـدەی مورجیئـە بـوون، ئەوانـەن، کـە سـەلەفییەکانی ئـەمڕۆ بـوون بـە میراتگریان، و لە باب الایمان دا - لەگەڵ کەمێك گۆڕینی لەفز - وەکو ئەوان دەڵێنـەوە، ئەمانە گروپێك بوون سەرمەشقەکەیان حەممادی کوڕی ئەبو سولەیمانە، کە شێخی ئیمامی ئەبو حەنیفەیە - ڕەحمەتی خوایان لێ بێت - لە دوای ئەمانیش ئاڵای دیدو بۆچوونەکەیان کەوتە دەست هەردوو گرووپی ئەشعەری وماتوریدییەکان، ئیدی بە داخەوە زۆر لە شەرعناسان و زانایانی دوایـین کەوتنـە ژێر کاریگـەری دیـدی ئەمانەوە ..

کەس بڕیاری لا الـه الا الله بدات، یا لە دڵ ودەرونیدا سوریش بێت لەسەر نەکردنی فەرزەکان، هەر ئەهلی بەهەشتە) [١].

حەنبەلیش دەڵێ: (حەمیدی بۆی باس کردین گوتی: هەواڵم هەیە، کە خەڵکێك هەن دەڵێن: هەر کەس دانی بە فەرزبونی نوێژو زەکات وڕۆژوو حەجدا هێناو وتی فەرزن، ئەگەر تا مردنیشی هیچ یەکێك لەم فەرزانەش نەکات، یان پشت بکاتە قیبلەو نوێژ بکات، تا مردنیشی هەر لەسەر ئەو حاڵەی بێت، مادام نکوڵی لە باوەڕەکە نەکردبێت، هەر موسوڵمانە.. دەڵێم بەراستی ئەمە کوفرێکی راشکاو زەقە، ئەمە پێچەوانەی کیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەرو صلی الله علیه وسلم شەرعناسی زانایانی موسوڵمانە! حەنبەل دەڵێ گوێم لێبو عبداللەی کوڕی ئیمام ئەحمەد بن حەنبەل دەیگوت: هەر کەس وا بڵێت: ئەوە کافر بوەو فەرمانی خواو پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم رەت کردۆتەوە) [٢].

ئیمامی ئاجوری ـ رحمەالله ـ دەڵێ: (ئەنجامدانی کاروکردار بەڵگەیە لەسەر بە قەناعەتی دڵ ودەرون و بەراست زانین و باوەڕی ناخ، بۆیە بە ڕاستی هەر کەس باوەڕەکەی بە ئەنجامدانی کرداری وەکو پاکژی ودەسنوێژو نوێژو زەکاتو رۆژوو حەج و جیهاد و ئەوانە نەسەلمێند هەر بەوەندە رازی بو، کە تەنها باوەڕی لە دڵ و دەروندا هەبێت و هیچ کردار نەکات ئەوە کەی موسوڵمانە؟! ئەوە هەر موسوڵمان نییە، ئەو زانین و ئیعتیراف کردنەشی بەو فەرزانەی ئیسلام، هیچ سودێکیان بۆی نابێت، چونکە وازهێنان و ئەنجام نەدانی ئەو کردارانەی خۆی لە خۆیدا بەدرۆ خستنەوەی باوەڕێتی. کردار بەڵگەی هەبونی باوەڕە، جا باش لەمە حاڵی بە، بشزانە کە ئەمە دیدو بۆچون و مەزهەبی زانایانی کۆن و نوێی موسوڵمانانە، هەر کەسێکیش غەیری ئەمەی

---

١ـ عبد الله بن احمد: السُنّة لە سفر الحوالي : ظاهرة الارجاء ٢/٧٠٤ وەرگیراوە

٢ـ ابن تیمیة: الایمان ل ٢٠٨.

بۆ باس کردیت ئەوە بزانە، کە مورجیئەیەکی پیسەو لێی بە حەزەر بەو ئاگات لە دینی خۆت بێت لێی. بەلگەش لەسەر ئەوە فەرمایشتەکەی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴾ البينة/٥ واتە: فەرمانیان بە غەیری ئەوە پێ نەکرابو، کە خواویستانەو سەرڕاستانە خوا بپەرستن و رویان هەر لەو بێت و نوێژەکان بکەن و زەکات بدەن، ئا ئەوەشە بەرنامەو دینی چاك و گونجاو ...[1]

١ـ الاجری: أخلاق العلماو لا٢٨له سفر الحوالی:ڤاهره الارجاو ق الفكر الاسلامیب٢/ ٦٤٧ وەرگیراوە.

## دیسان ڕێڕەو بۆ

## شیکاریی گومانی سەلەفیەکان کان لە باب الایمان و باب الکفردا

پێشتر وتمان، کە باوەڕ بون بەوەی، کە باوەڕ ئەوە دەخوازێت، کە قەناعەتت بەوە هەبێت، کە باوەڕ (گوفتاروکردار)ە، ئەمەش دوو باس لە خۆ دەگرێت:

یەکەم ئەوەیە کە توخمی کردار مەرجێکە بۆ دروستی باوەڕ، ئەگەر کەسێك موسوڵمان بو بەوەی، کە لە ناخیدا باوەڕی قەناعەتی کردو بە زمان ئیقراری کرد، ئەگەر بە یەکجاریی واز لە کردارە ئیسلامیەکان بهێنێت و هیچیان ئەنجام نەدا، سیفەتی ئیسلامەتی وەرناگرێت و موسوڵمانێتی پێوە بەردەوام نامێنێت..

دووەم: مرۆڤ بە گوفتاری دڵ و کرداری دڵ کافر دەبێت (واتە بە قەناعەتی دڵ) هەروەها بە گوفتاری زمان و کرداری ئەندامانی لەش (واتە ئەنجامدانی کرداری کوفرین).. جا چۆن هەندێك قەناعەت هەیە، کە کوفرینن و هەر کاتێك لە ناخدا دروست بون خاوەنەکانیان کافر دەکەن، بێ ئەوەی سەیری ئاسەواری دەرەکی کرداری بکرێت، کە کردویێتی یان نا، هەر بەو شێوەیەش هەندێك کرداری کوفرین هەن کە نیشانەی کوفرو کافر بونن، ئیدی قەناعەتی ناخیان لەگەڵدا بێت، یان نا..

ئەمانە لازم و مەلزومن، هەر کاتێك لازمی یەکێکیان هات، مەلزومەکەی نامێنێت. لێرەوەیە، کە هەر کەسێك لاف ئەوە لێدات، کە ئیلتیزامی هەیە بێ ئەوەی بە راستی بە داواکاریەکانی باوەڕەوە پابەند بێت، هەر خۆی خۆی بە درۆ دەخاتەوە، ئەوەش رادەگەیێنێت ـ بیەوێت یان نەیەوێت ـ کە باوەڕ تەنها قسەیەو بەس، واتە گوفتار بەسە.. ئەمەش ئەو چاڵەیە، کە سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەف تێ کەوتون.

بەڵام (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی) لەو لایەنەوە تێکەوتون، کە (مەرجیئەکانی سەرەتا)ی تێکەوتن، چونکە ئەوانیش وەکو ئیمامی ئیبنوتەیمییە لێیانەوە دەگێڕێتەوە، کەوتبونە ئەو لاف لێدانەوە، کە گوایە بەڵگەی شەرعییان هەیە، بێ ئەوەی بزانن سەریان لێ شێواوە! (الایمـان ل١٩٣) بۆیە نە بۆ ئەوان و نە بۆ سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی ئەوە نەبوە تەختەی سەر ئاوێ، تا خۆیانی پێ لەم بیدعە گومڕاییە رزگار کەن، چونکە: (زۆر لە نەوەکانی دوایین نازانن چۆن دیدو رای سەلەف لە دیدورای مورجیئەو جەهمییە هەڵاوێرن، چونکە ئەم باسانە لە قسەی زۆریاندا تێکەڵە! هەیانە لە ناخیەوە پێناسەی باوەڕی لا وەکو پێناسەی جەهمی و مورجیئەکانە! وەك زۆرینەی ئەهلی فەرمودە، کە هەیانە وا دەزانێت سازاندنێکی لەو نێوانەدا ئەنجامداوە، یان وا دەزانێت قسەکەی ئەو دیدو ڕای سەلەف یەکن ..! (ابن تیمیة: الایمان ل ٣٥٢)..

سەیری ئەو وەسفە وردەی ئیمامی ئیبنوتەیمییەی رەحمەتی، چەند جوان بۆی چوە، دەڵێی وەسفی (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان و پاڵانتەوانانی سەلەفی) ی ئەمڕۆی سەردەمی ئێمە دەکات ..

ئێمە لێرەدا هەرچەندە ویستمان چەند لاپەڕەیەك بۆ ئەو گومانانە تەرخان بکەین، کە سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی پێوەی گرفتاربون، کە قسەکانیان زو ڕون دەبێتەوە، کە لە دیدو ڕای ئەهلی سوننەت بەدەرە... ئەوەی ئێمە لێرەدا دەیهێنینەوە هەمو دیدوراو پێناسەکانیان نیە، بەڵکو هەندێکە لەو بەڵگانەن، کە ئەوان خۆیان پێوە ماندو کردوەو، وا دەزانن بەڵگەی شەرعین و دەشێن بیکەنە پشتیوانی خۆیان.. جا ئەگەر ئێمە بەرپەرچمان دایەوە، ئەوا ئیتر ئاوەڕوت دەبن و هەر لە هەنگاوی یەکەمی ڕێوە دەبێ لا کەون!

نوسـینێکی دیمـان لەسـەر بۆچـون و بەڵگـەکانی (عـەلیل حەلـەبی) بـە دەستەوەیە، کە چەواشـەکارییەکی سەرسوڕ هێنـەری دیکەی ئـەو پیاوەیـە، کـە لـەو خەڵکـەی دەکـات!! دەمـەوێت ئـەو نوسـینەی دی سـەربەخۆ دەرچـێت و بکەوێتە بەر دەست، تا هۆشدارییەك بێت بۆ موسوڵمانان، کـە نەکـەن وا بـزانن ئـەو قسـانەی عـەلیل حەلـەبی دەیانهێنێتـەوە، بەڵگـەی دروسـتیی هەڵوێسـتی سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتـەوانانی سـەلەفی بێـت.. خـواش ئیخلاسمان پێ ببەخشێت!

بـا پـێش ئـەوەش بێمـە سـەر گومـانی سـەلەفیەکانی بـەر سـێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی، دوو خاڵی گرنگ یاد بخەمەوە، یەکێکیان رون کردنـەوەی شـێوازو چۆنیەتی بەڵگە هێنانـەوەی بیدعەچییەکانە، ئـەوی دیکە شێوازو چۆنیەتی موناقەشەو مونازەرەی خاوەن دیدو رای جیاوازە:

١. شێوازو چۆنیەتی بەڵگە هێنانەوەی بیدعەچییەکان: ئەوەی کـە دەگـەڕێن لـە هـەر جێیـەك دەقێـك، یـان دێرێکیـان بـەر دەست کـەوت، کـە بـۆ پشت پـێ بەستنی خۆیان بشێت، دەیکەنە قەڵغانی خۆیان و لە پێش خۆیانی رادەگرن! تا بیدعەکەی خۆیانی پێ سەرخەن! ئەمە لە کاتێکدایە، کە هەمو کەس دەزانێت، کە هەقخوایی ئەوە دەخوازێت، کە هـەمو دەقـەکان و لێکدانـەوەو شـیکاریەکانی بابـەت هـەموی پێکـەوە بهێنرێنـە بەردەسـت! چـونکە لەوانەیـە دەقێـك لـە شـوێنێکدا کورتـە بێـت و لـە شـوێنێکی دیکـەدا تەفسـیلاتێکی درابـێتێ! یـان دەقێکیان تایبەتمەندێتی جێ و کاتی خۆی پێوەیـەو دەقێکی دیکـەی وەك ئـەو گشتگیریی پێوەیـە، یـان دەقێکی پەیوەسـتە بـە مەرجێکـەوەو دەقێکـی دیکـەی وەك ئەو رەهایەو هیچ شتێك بۆی نەبۆتە مەرج.. بۆیە لە بەڵگەیەکیاندا هـەق بـە تـەواوەتی دەرناکـەوێت، تـا هـەمو دەقـەکان نەهێنرێنـەوەو لێـك نزیـك نەکرێنـەوە.. هـەمو جارێـك و بـۆ هـەمو بابـەتێك هـەر وایـە، بـە توێژینـەوەی هەمو دەقەکان وێناکە بە تەواوی رۆشن ببێتەوە..

ئیمامی ئەبو ئیسحاقی شاتبی رحمه الله لە (باب في مأخذ أخل البدع في الاستدلال) دا دەڵێ: (ئەو کەسانەی لە دینداریدا جێگیرن یەك وێنە بۆ شەریعەت دەکێشن، کە هەمو لایەکانی خزمەتی یەکتریی دەکەن، هەر وەکو ئەندامانی لەشی مرۆڤ دەبن، یەك یەك دەناسرێن، هەموشیان پێکەوە یەکتریی تەواو دەکەن... بەڵام ئەو کەسانەی راڕاو دوودڵن و دینداریتییان قایم دانەمەزراوە بە دووی گومان فال و فیلێکدا، یان بەلگەیەکی جوزئیدا دەڕۆن و بەسادەیی وەریدەگرن و دەیکەنە بەلگە! هەر بەومندەی دەرکەوت، کە پێچەوانەی بەلگە شەرعیە نەگۆڕەکانەو ناشێت بکرێتە هەنجەتی شەرعی، دەکەونە توانج گرتنە شەرع.. ئەمە پیشەی ئەو کەسانەیە، کە دڵیان ئینحیراف تێکەوتوە، ئەگینا کێ لە خوای گەورە ڕاستگۆترە ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا﴾النساء/١٢٢.

ئەوانەی لە ئەهلی هەواو هەوەسن، شتە گشتییەکان (عمومیات) وەردەگرن، سەرنج لە پێشەکیەکان نادەن، موراعاتی ئەوە ناکەن، کە ئەم باسە گشتیانە تایبەتمەندی (خسوسییات) خۆیان هەیە، هەمو شتێکی ڕەها، ڕەنگە شتێکی سنورکاریی هەبێت، بۆیە دەبێ تایبەتمەندیەکان لەبەر رۆشنایی ڕێسا گشتیەکاندا لێکدرێنەوە.. دەقی وا هەیە تایبەتە، بەڵام هەواوهەوەسبازان دەیکەنە گشتی، یان گشتیە ئەوان دەیکەنە تایبەتی، حوکمێك لەسەر روداوێك یان کەسێکە ئەوان بە بێ بەلگەی شەرعی، هەر بە رای خۆیان دەیکەنە حوکمێکی گشتی، بەو شێوەیە رایەك دەچێتە شوێنی بەلگەیەك، ئەمەش دیارە هاویشتنی کوێرانەی تیرە و شوێن کەوتنی ئاشکرای هەواو هەوەسە، نەك وەرگرتنی بەلگەی شەرعی .. (الاعتصام ١/١٧٨).

٢ ـ گفتوگۆو دایەلۆگ کردن: خاوەن بیدعە پەنا دەباتە بەر ئەو بەلگانەی لاوازان و ناکۆکیان لەسەرە، لەمانە هەرچیەکیان لە سالحی خۆی بو دەیانهێنێتەوە! دەڕوانێتە ئەقوالی زانایان ئەو قەولەیان دێنێتەوە، کە پێی

وایە رای خۆی پێ بەهێز دەکات و خزمەتی بیدعەکەی دەکات، کە دەڕوانێتە بەرامبەرەکەی هەمو ئەو قسانەی دێنێتەوە کە پێی وایە هەڵوێستی ئەو لاواز دەکات! کە بەڵگەی بەرامبەرەکەی رەت دەکاتەوە، هەر بە ناو را دەیهێنێتەوە و قسەی وایان دەخاتە سەر، کە لە بەڵگەکانی بەرامبەردا نەوتراون، ناچێتەوە سەرچاوەی باسەکانی بەرامبەر، تا لەوێ بەڵگەکان وەك خۆیان ببینێت!! ئەمە رەفتاری هەمو بیدعەچیەکە..

خوێنەر مافی خۆیەتی، کە را پێچەوانەکان لەو مەسەلانەدا ببینێت، کە راجوێیی لەسەرە، پێویستە بەڵگەی هەمو لایەنەکان ببینێت، تا بزانێت ئەو رایەی لایەنێك لەسەریێتی، بۆچی پەسەندی کردوە، تا گومانەکانی بڕەونەوەو حەقی بۆ رون بێتەوەو رای راستی دەست کەوێت.. بەڵام بیدعەچی ناوێرێت هەمو بەڵگەو ئەقوالی بەرامبەرەکەی بهێنێتەوە، نەبادا لاوازی مەزهەبەکەی خۆی بۆ خەڵکی دەرکەوێت و، خەڵکەکە بزانن بۆچی بەرامبەر ئەو رایەیان پەسەندتر بینیوە، ئەوسا کۆشکی لی بیدعەکەی ئەم دادەڕمێت، لەبەر ئەمەیە دەیبینیت منجەمنجێتی، بە ناو ئەقوالی زانایاندا دەگەڕێت، تا کۆلکە بەڵگەیەکی دەست کەوێت، لەملاوەش دەم هەراشانە دەدوێت، کەچی خۆی لە موناقەشەی زانستیانە دەدزێتەوە، هەزارو یەك قسەی خۆی و هاوبیرانی ڕیز دەکات، بێ ئەوەی بەڵگەیەکی بەرامبەرەکەی وەکو خۆی باس کاتەوە! راوبۆچونیان وەکو خۆی ناناسێنێت، بەڵگەکانیان وەکو خۆیان ناهێنێتەوە، بە لاقرتێوە ئاماژە بە ئیستیدلالە ئوسوڵیەکانیان دەکات! بەو ئومێدەش، کە لەبەرچاوی خەڵکیان بخات خۆیان و مێژویان بە کەم و کورت دەنرخێنێت! کە بۆشی نەچوە سەر کۆڵ نادات، بە خۆیدا ناچێتەوە، سەر لە نوێ وەك شەرەشۆق تێ هەڵدەچێتەوە!!

خوێنەری ئەم بیدعەچییانە وا دێتە مێشکی، کە ئەوی لەو بەری ئەمان وەستاوە، هیچ قسەیەکی نیە، هیچ بەڵگەیەکی شەرعی بەدەستەوە نیە بیخاتە

ڕو، تەنانەت لە سەرەتای هاوڕێیەتیاندا گومانێکیشی لە ڕاوبۆچونی ئەم بیدعەچییانە لا دروست نابێت!! هەر وا دەزانێت ئەمان ڕاست دەکەن و ڕێبازی سەلەفیان گرتوەو، هەرچی دەیڵێن بەڵگەی هەیە، کە دیدو بۆچونی سەلەفە، تا وای لێ دێت هەر دیدو پێناسەو ڕێی ئەمانی پێ ڕاست دەبێت، ئیتر هەر خوا خۆی دەزانێت چەند گێل دەکرێت و چۆن بەکار دەهێنرێت؟!!

ئیمامی وەکیعی کوڕی جەڕاح ڕەحمەتی خوای لێ بێت، هۆشداریی لەسەر ئەم چەواشەکارییە دەداتە موسوڵمانان و دڵسۆزانە باس دەکات، کە ئەوی شەرع خوازو هەقپەروەر بێت شتی وا ناکات، چونکە ئەمە هەواو هەوەس پەرستی و خۆبەزلزانینیە، بۆیە دەفەرموێ: ئەهلی زانستی شەرعیی هەرچی ماڤ خۆیانەو هەرچی لەسەریانە دەینوسن، بەڵام ئەهلی هەواوهەوەس، تەنها ئەوە دەنوسن، کە لەگەڵ خۆیاندا یەك دەگرێتەوە .. (الدارقطني/السنن ١/٢٦).

ئەگەر دەتەوێت بە واقیعی و دووچاوی سەری خۆت ئەم ڕاستیانە ببینیت، بڕۆ کتێبەکانی (حەلەبی) بخوێنەرەوە ،کە هەمو شتێك دەڵێ و دەنوسێت، جگە لەوەی پەیوەندی بە بەرامبەرەکانیەوە هەیە، کە ناوی ئەوانیش دەهێنێت وشەی وایان بۆ بەکار دەهێنێت، کە نەك هەر کەسایەتی ئەوان، بەڵکو هەستی خوێنەرو بیسەرەکانی خۆشی بریندار دەکات، وشەی وا کە لە کۆڕی فەقێشدا ناوترێت! هەمو شتێك بۆ سەرخستنی مەزهەبەکەی خۆی دێنێتەوە، کەچی دەقی بەڵگەی بەرامبەرەکانی، کە هی زانایان و شەرعناسان و پێشەوایانی سەلەفن ئیهمالیان دەکات، چونکە دڵنیایە ئەو بەڵگانەی ئەمان مەزهەبەکەی ئەو هەڵدەوەشێنێتەوەو ڕوت و ڕەجاڵی عەقیدەو چەوتی ڕێبازەکەی ئاشکرا دەبێت.. ئەمە جگە لەوەی شێوەی نیشاندانی بۆچونەکانی خۆشی وایە، کە گاڵتەکردنێکی بە ئەقڵی خوێنەرانی خۆی تێدایە، وەك ئەوەی زۆر بە ساویلکە سەیریان دەکات و پێی وایە ئەوەندە خۆشباوەڕن هەمو قسەیەکیان بە مێشکدا دەچێت، ئەمە وا لە حەلەبی دەکات، کە لە لایەکەوە وا بزانێت زانای یەکەمینی

ئوممەتەو، هەر ڕێبازەکەی ئەم (سەلەف)انە تەواوە، لە لایەکی دیکەشەوە، کە ئێمە مانانی لێ ڕاست دەبینەوەو پێمان وا نابێت دیدو ڕێبازەکەی ڕاستە، بێ ئەدەبی بەرامبەر ئێمە دەکات و دەیەوێت بە قسەی ناشیرین پەڕاوێزمان بکات، تا ساحەکەی بۆ چۆڵ کەین!!

دوای ڕون بونەوەی ئەم دوو تێبینیە، دەتوانین بچینە سەر ئەو گومانەی (سەلەف) یەکان ڤیتیان کردۆتەوە، کە گوایە ئەوان تاکە هۆکاری ڕەسەنکردنەوەی عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتیان لە مەسەلەکانی (باوەڕو تەکفیر)دا کە گرتۆتە بەر، کە هەر لای ئەمانیش پەیدا دەبێت و بەس!

# باسی یەکەم

## جێ و ڕێی کردار لە پێناسەی باوەڕدا

حوزەیفەی کوڕی یەمان خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموی: (يَدْرُسُ الْإِسْلَامُ كَمَا يَدْرُسُ وَشْيُ الثَّوْبِ، حَتَّى لَا يُدْرَى مَا صِيَامٌ وَلَا صَدَقَةٌ وَلَا نُسُكٌ، وَيُسْرَى عَلَى كِتَابِ اللَّهِ فِي لَيْلَةٍ فَلَا يَبْقَى فِي الْأَرْضِ مِنْهُ آيَةٌ، وَيَبْقَى طَوَائِفُ مِنَ النَّاسِ الشَّيْخُ الْكَبِيرُ وَالْعَجُوزُ الْكَبِيرَةُ، يَقُولُونَ: أَدْرَكْنَا آبَاءَنَا عَلَى هَذِهِ الْكَلِمَةِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَنَحْنُ نَقُولُهَا)[١] واتە: ئیسلام کۆن و کاڵ دەبێت و هەڵدەوەشێتەوە، هەر وەکو کە پۆشاکێك کۆن و کاڵ دەبێت و هەڵدەوشێتەوە، تا وای لێ دێت نازانرێت نوێژ چیەو ڕۆژوو چیە و خێرو خێرات چیەو خواپەرستی چیە! لە شەوێکدا قورئانیان هەڵدەگیرێتەوەو بەرز دەبێتەوە، تەنانەت ئایەتێکیشی لەسەر زەمین نامێنێت، هەر کۆمەڵە خەڵکانێك لە پیرەپیاو پیرەژن دەمێنن، کە دەڵێن: بیرمان دێت باپیرانمان ئەم وشەی (لا اله الا الله) یەیان دەوت، بۆیە ئێمەش وا دەیڵێینەوە..

سەرەتا شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی تەواوکەری فەرمودەکە دێنێتەوە، کە دەڵێ: سیلەی کوڕی زوفەر بە حوزەیفەی گوت: جا (لا اله الا الله) سودی چی دەبێت بۆیان، کە ئەوانە نەدەزانن نوێژ چیەو، نە ڕۆژوو چیەو نە خواپەرستی و خێرو خێرات چیە؟! حوزەیفە ڕوی خۆی لێ وەرگێڕا، سیلە دیسان لێی پرسیەوەو هەر وەڵامی نەدایەوە، کە کردی بە سێ جار، حوزەیفە لە وەڵامیدا فەرموی: هۆ سیلە، ئەو (لا اله الا الله)یە لە ئاگری دۆزەخ قوتاریان دەکات..

ئەلبانی دوای ئەمە دەڵێ: خاڵێکی شەرعناسیی گرنگ لە فەرمودەکەوە

---

١. نوسەری بەڕێز رحمه الله نوسیوێتی (الصحيحة ١٢٧/١ ژمارە ٨٧) بۆ باسی زیاتری سەنەدو مانای فەرموودەکە بڕوانە (سنن ابن ماجه ب ٢ / ل ١٣٤٤) و (فتح الباري ب ١٣ / ل ١٦ ) و (المستدرك على الصحيحين ب ٤ / ل ٥٢٠ و ب ٤ / ل٥٨٧) شێخی ئەلبانیش بە سەحیحی داناوە، بڕوانە: (السلسلة الصحيحة ١٢٧/١ ژمارە ٨٧) هەروەها (صحيح الجامع ژمارە ٧٩٣٣) (وەرگێڕ) .

وەردەگیرێت، ئەویش ئەوەیە کە ئەو کەسەی دەڵێ: (لا الـه الا الله) با هیچ شتێکیشی لە پێنج ئەرکانی تری ئیسلام بەجێ نەهێنابێت، هەر لە مانەوەی هەتاهەتایی ناو ئاگری دۆزەخ قوتاری دەبێت[1] ..

* لە چەند لایەکەوەیە رەد لە تێگەیشتنەکەی شێخی ئەلبانی دەدەینەوە:

یەکەم: ئەمە وەکو لە بەشی یەکەمدا رونمان کردەوە پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە..

دووەم: شێخی ئەلبانی چۆن وا تێگەیشتوە، کە ئەو کەسەی رەفتار بە شایەتمانەکەی ناکات موسوڵمانەو لە نەمریی و مانەوەی لە سزای دۆزەخ قوتاری دەبێت؟! لە کاتێکدا کە فەرمودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ئەو کەسانە لە ئاگری دۆزەخ قوتار دەبن (نەک لە نەمریی ومانەوەیان لەوێدا) چونکە خاوەن عوزری نەزانینن، نەیانزانیوە گوفتارو رەفتارێك، کە لەسەر باوەڕ هێنان بینا دەکرێت چیە تا بیکەن، بۆیە لە سزای نەمریی دۆزەخ قوتار دەبن؟! خوای گەورەش دەفەرموێ: (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً) الاسراء/١٥ واتە: مومکین نیە سزادەر بین، پێش ئەوەی نێرراوێك بنێرین.. حوزەیفەش دەڵێ: هۆ سیلە (ناوی یاوەرەکەی هاوڕێیەتی) ئەو باوەڕەیان لە ئاگری دۆزەخ قوتاریان دەکات..

ئەمە چ تێگەیشتنێکە بابە شێخ؟!

کەوابو هیچ بەڵگەیەك لە فەرمودەکە نافامرێتەوە ئەوە بسەلمێنێت، کە ئەو کەسەی رەفتار بە باوەڕەکەی ناکات وکرداری نیە ـ جگە لەوانەی عوزری نەزانین دەیانگرێتەوە ـ لە ئاگری دۆزەخ قوتاری ببن؟ ئەوەی کە فەرمودەکە دەیگەیێنێت لەگەڵ ئەوەی شێخ لە (باب الایمان) دا باوەڕی پێیەتی جودان، چونکە ئەوەی شێخی ئەلبانی بە قەناعەتەوە دەیڵێ، عەقیدەی توندڕەوەکانی مورجیئەیە، نەك شەرعناسانی مورجیئە! چونکە توندڕەوەکانی مورجیئە

---

١ـ الالبانی / سلسله الاحادیث الصحیحه ١ / ١٣٠.

باوەڕیـان وایـە كـە هـەر كەسـێك بـاوەڕی بـە زمـان ڕاگەیانـد - جگـە لەوانـەی نەزانین بۆیان دەبێتە عوزر. بـا هـیچ جۆرە گوفتـارو ڕەفتـارێكی ئیسلامەتیش نەكات، هەر موسوڵمانەو لە سزای دۆزەخ قوتاری دەبێت، هـەر لەسـەرەتاوە بـێ ئەوەی سزا بدرێت دەچێتە بەهەشتەوە!!

بـەراوردی ئـەم تێگەیشـتنەی شـێخی ئـەلبانی و واتـای پرسـیارەكەی سـیلەی كوڕی زوفەر بكە خوا لێی ڕازی بێت، كە لە حوزەیفـەی پرسـی: جـا (لا الـە الا الله) سودی چی دەبێت بۆیان، كە ئەوانە نەدەزانن نوێژ چیەو نە ڕۆژوو چیەو نـە خواپەرسـتی و خێـرو خێـرات چـیە؟! ئـەوە ڕون دەبێتـەوە، كـە یـاوەران دەیـانزانی وتـنی شـایەتمانەكە بـە تـاقی تـەنیا، بـێ ئەنجامـدانی داواكاریـەكانی باوەڕ لە گوفتارو ڕەفتار، هیچ نرخێكی نابێت و كـابرای بێـژەری ناهێنێتـە نـاو ئیسلامەوە! جا ئاگات لە ڕاستی پێناسەو داواكراوی بـاوەڕ بێـت و گـوێ نـەدەیت بە تێگەیشتنە نوقسانەكەی شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی..

سێیەم: ئەگەر هەنجەتی نـەتوانینی ئەنجامـدانی كـار لەبـەر نـەزانین ببێتـە بەڵگەی ئەوە، كـە كـردارو ڕەفتـار مـەرجی دروسـتی بـاوەڕ نیـە، كـەوابو لاڵـیش خـاوەن عـوزرە لـە نـەهێنانی شـایەتماندا! چـونكە ناتوانێـت بیلێـت! بـەم ڕێسـا لاسەنگەش ئەوە دێتە پێش، كە شایەتمان هێنـان مـەرجی دروسـتی بـاوەڕ نیـە، بەڵكو مەرجی تەواوێتیەتی!

ئەمە چ حاڵی بونێكە بابەشێخ؟!

ئەمە دەقاودەق دیـدو پێناسـەی مورجیئـە كۆنەكانـەو، هەنجـەت و پاڵنـەری سـەلەفیەكانی بـەر سـێبەرو مەدخەلیـەكان وپاڵانتـەوانانی سـەلەفی ئـەم سەردەمەش، هەر هەمان هەنجەت و پاڵنەری مورجیئەكانی دوێنێیە، كە ئیمامی ئیبنوتەیمییـە دەربارەیـان نوسـیویەتی: جەهمیـەكان دەڵێن: بەڕاسـت زانـین بـە زمـان لەوانەیـە مـەرج نـەمێنێت، وەك بـۆ لاڵ و ناچـاركراو، بۆیـە ئـەوەی لـە باوەڕدا داواكراوەو مەرجە قەناعەتی دڵەو بەس! (مجموع الفتاوی ۱۳/۳۰).

باشە كابرای بەدگومان كە باوەڕی بە تواناو لێهاتویی خوای گەورە نەبو، ئەوی بە كوڕەكانی وت كە دوای مردنی لاشەكەی بسوتێنن و لە ڕۆژێكی ڕەشەبادا بەربای دەن و هەر تۆزەی بچێتە شوێنێك، تا خوای گەورە نەتوانێت كۆی كاتەوە! ئەمە قەناعەتی ئاوای هەبوەو دەریشی بڕیوە، بەڵام خوای گەورە لێی نەگرتوە ئایا ئەمە دەبێتە بەڵگەی ئەوەی، كە باوەڕ هێنان بە توانای ڕەهاو دەسەڵاتی بێسنوری خوای گەورە، مەرجی تەواوێتی باوەڕەو بە نەمانی ئەویش نامێنێت؟!

چوارەم: ئەم گومانە بەقەدەر دیدوبۆچونی مورجیئەكان كۆنە، مورجیئەی هەمو كات و شوێنێك، ئەمەیان كردوە بە بەهانەی خۆیان! ئیمامی ئیبنوتەیمییە لە باسیاندا دەڵێ: باوەڕی ئەو كەسەی، كە بە تەفسیل ئەوەی زانیوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم باسی لێوە فەرموە، وەكو باوەڕی ئەو كەسە نیە، كە بە شێوەیەكی گشتی زانیوێتی پەیامی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چی تێدایە.. ئەوەی كە دەبێت لە باوەڕەكەدا تەوەر بێت بە ڕاستگۆ زانینی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم لە هەمو ئەوانەدا، كە باسی لێوە كردون، بۆیە ئەگەر كەسێك باوەڕی هێناو مرد لەوەندەی زیاتر داوا لێ ناكرێت، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە ڕاستگۆ بزانێت .. (ابن تیمیة: الایمان ل ١٩٥).

لە لاپەڕەی دوای ئەمیش دەفەرموێ: ئەو قسەیان كە دەڵێن ئەگەر كەسێك دوای شایەتمان هێنانەكەی بمرێت هیچی لەسەرنیە، ڕاستە چونكە باوەڕی پێویستی هێناوەو هێشتا ڕەفتاری ئیسلامەتی لەسەر فەرز نەبوە.. ئەم خاڵە دەبێت ڕون و ئاشكرا بێت، تا گومانی هەردوو لایەن بڕەوێنێتەوە..

لە شوێنێكی تریشدا دەڵێ: بە دوو شت هەنجەتی شەرع و ئیقامە حوججە لەسەر كەسێك دێتە دی: هەبونی توانای فێربونی ئەوەی، كە خوای گەورە ناردوێتیە خوارەوە، لەگەڵ هەبونی توانای جێبەجێ كردن.. ئەمما كەسێكی شێت، كە توانای وەرگرتن و فێربونی نیە، یان ئەو كەسەی توانای جێبەجێ

کردنـی داواکاریـەکانی ئیسـلامی نیـە، تـەکلیفی لەسـەر نامێنێـت، نـە فـەرمان دەیگرێتەوە، نەبەرهەڵستیی. ئەگەر کەسێك لە دین حاڵیی بونی لێ گیرایەوە، یان رێ نەدرا لایەنێکی ئیسلامەتی جێبەجێ بکات، حوکمی وەکو ئەو کەسەیە، کە رێـی شارەزایی بەشێك لـە دینەکەی لێگیرا بێت یـان نـەهێڵرا بێـت هـەمو دینەکە وەرگرێت.. (ابن تیمیة: مجموع الفتاوی ٢٠/٣٦).

شێخی ئیسلام ئیبنوتەیمییە رەحمـەتی خـوای لێ بێـت زو ئـەم گومانـەی کەشـف کـردوەو، وردەکارانـە بەرپەرچـی داوەتـەوە، لـە حاڵەتێکدایـە زۆر لـەو حاڵەتە دەچێت، کە فەرمودەکە باسیان لێوە دەفەرموێت.. ئیبنوتەیمییە دەڵێ: کاتێك خوای گەورە پێغەمبەری پێشەوای صلی الله علیه وسـلم بـەم پەیامـەوە بـۆ هیدایـەتی خـەڵکی نـارد، ئـەرکی سەرشـانی ئـەو خەڵکـە ئـەوە بـو، کـە بـە راستگۆی بزانن و باوەڕی پێ بهێنن و ملکەچی فەرمانەکانی بن.. سـەرەتا هـەر ئەوەندە بو، هێشتا فـەرمانی پێـنج فـەرزەی نوێـژو رۆژووی رەمـەزان وحـەجی لەسـەر فـەرز نـەکردبون، هێشـتا شـەراب و سوی لـێ حـەرام نـەکردبون، هێشـتا زۆرینـەی قورئـان دانەبـەزیبوە خـوارێ، هـەر کەسـێك شـایەتمانەکەی دەهێنـاو بـاوەڕی بـەوە دەهێنـا، کـە بـۆی هـاتبو، ئینجـا پێـوەی پابەنـد دەبـو، ئـەوە موسـوڵمانی تـەواو بـو، باوەڕەکەشـی تـەواو بـو، چـونکە هـەر ئەوەنـدەی لـێ داواکرابو، بەڵام هەر کەسێك لـە دوای کۆچـی موسـوڵمانان بـۆ مەدینـە بـاوەڕی هـەر بەوەنـدە بهێنایـە لێـی وەرنـەدەگیرا، ئەگـەر بیشـیوتایە، هـەر ئەوەنـدە وەردەگرم پێی کافر دەبو! (ابن تیمیة: مجموع الفتاوی ٧/٥١٨) ..

پێم وایە ئەم دیدو بۆچون و بەدواداچونە پڕاوپڕ راستەو ئەوەیـە، کـە دڵـی پێ خۆش دەکرێت، چونکە حـەقی بـە شـێوەیەکی جوان تێدا رون کردۆتـەوە، بۆیـە موسـوڵمان، کـە دەیبینێـت دڵـی ئـاو دەخواتـەوەو سـوکنایی لا دەسـت دەکـەوێت.. بـەڵام رەحمـەتی خـوا لـە شـێخی ئـەلبانی بێـت وخـوای هیدایـەتی موقەللیدەکانی بـدات، تـا زیـاتر شـوێن هەواوهەوەسـی خۆیـان نەکـەون، بـەڵکو هەمو پەی بە رێی راست ببەین.. والحمد لله رب العالمین ..

# باسی دووەم

# ئەهلی سوننەت کێیە؟!

کاتێك حەلەبی بینی ئیمامی ئیبنوحەجەر رحمەالله نوسیوێتی، کە کردار مەرجی تەواوێتی باوەڕە، زۆر دڵخۆش بو، وای زانی دوو هەنگی لە دارێکدا دۆزیوەتەوە، بە دووی زۆر نوسینی حەلەبیدا چومەوە، لە هەمو شوێنێك دەمبینی، ئەو قسەی ئیبنوحەجەری رەحمەتی کردوە بە پینەی پێناسە بیدعەکەی خۆی[1]!

ئیمامی ئیبنوحەجەر رحمەالله دەربارەی باوەڕ دەڵێ: (سەلەف[2] گوتویانە: باوەڕ بریتیە لە قەناعەتی دڵ و دەربڕینی بە زمان و ئەنجامدانیکردەوەکان، مەبەستیان لەوە ئەوەیە، کە باوەڕ مەرجی تەواوێتی باوەڕە. (ابن حجر: فتح الباري ١/ ٦٤).

- وەڵامی ئەم گومانە بەم شێوەیە دەدەینەوە:

یەکەم: گومان لەوەدا نیە، کە ئیمامی ئیبنوحەجەری عەسقەلانی لەگەڵ گەورەیی و پێشەوایەتی و بەرفراوانی زانیاریدا- لە پێناسەی سیفەتەکانی خوای پەروەردگارو پێناسەی باوەڕدا - کەوتبوە ژێر کاریگەری ئەشعەریەوە، سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی ئەمە دەزانن، بەڵام لە موناقەشەی ئێمە ماناندا لەبیر خۆیانی دەبەنەوە، چونکە دەزانن لە پێناسەی باوەڕدا دەبێتە پاڵپشتی ئەمان، دەنا ئەگەر راست دەکەن وئیمامی ئیبنوحەجەریان پێ قبوڵە، دەبا لە هەندێك پێناسەی تری سیفاتیشدا قبوڵیان

---

١- بۆ نمونە بڕوانە: پەڕاوێزی (حكم تارك الصلاة ل ٣٥٢) و شريتي (الرد على شبه التكفيريين) .

٢- دەڵێ سەلەف، چونکە ئەویش رحمە الله پێی وابووە ئەوە رای یاوەران و تابعینە، بۆیە ئیمامی ئیبنوتەیمیە لە (الإیمان ل ٣٥٢) دەڵێ: زۆر لە زانایانی چەرخەکانی دوایین، جیاوازیەکانی نێوان سەلەف و مورجیئەو جەهمیە لێك جوێ ناکەنەوە.. ) .

بێت، کە تێیدا پێچەوانەی بۆچونی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.. چەند شەرعناسی گەورە هەیە، کە کەوتۆتە ژێر کاریگەریی (هەندێك) لە گومانی (مورجیئەی شەرعناسان).. بەڵام کێیان کەوتۆتە ژێر کاریگەریی بیدعەگەرێتی (جەهمیە) کانەوەو، کەوتۆتە شوێن جەهمی کوڕی سەفوان؟!

دووەم: شێخ عبدالقادری کوڕی عبدالعەزیز خوا بیپارێزێت، دەڵێ: فەرمایشتەکەی ئیبنوحەجەر، کە گوتویەتی: (سەلەف گوتویانە: کردار مەرجی تەواوێتی باوەڕە) راست نیە! ئەمە قەولی مورجیئەیە، نەك سەلەف، ئەمە هەر ئەوەیە، کە شێخ ئیبراهیمی باجوری (ئەشعەرییەو ساڵی ١٢٧٧ ك کۆچی دوایی کردوە) لە شەرحی (جوهرة التوحيد/ابراهيم اللقاني ١٠٤١ ك) دا هێناویەتیەوە. ئەو لەو کتێبەیدا دەڵێ: ئەوەی ئەهلی سوننەت گەیشتونێ ئەوەیە کە کردار مەرجی تەواوێتی باوەڕە، هەر کەسێك ئەنجامی بدات ئەوە باوەڕی تەواوی دەسکەوتوە، هەر کەسێکیش ئەنجامی نەدا ئەوە تەواوێتی باوەڕی لەدەست داوە. کە دەڵێ (لای ئەهلی سوننەت) مەبەستی پێی ئەشعەریەکانە، چونکە ئەوان وەکو زوبەیدی لە کتێبی (اتحاف السادة المتقين٢/٦)دا دەڵێ: (ئەگەر ئەشعەریەکان وتیان: ئەهلی سوننەت وجەماعەت ئەوەمەبەستیان پێی خۆیان و ماتۆریەکانە)، ئەوەش ناو ناساوێکە، کە لە جێی خۆیدا نیە[1] ..

دەڵێم: ئەم قەولەی بەنەزانین بڵاوکراوەتەوە، کە گوایەڕای ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوەیە، کە کردار مەرجی تەواوێتی باوەڕ بێت، نەك مەرجی هەبونی، ئەوە قەولی (مورجیئەی شەرعناسان)ە، بە تایبەتی ئەشعەریی و ماتۆریدیەکانیان، ئەمەش وەکو رون کراوەتەوە قەولێکی باتڵە، باشترین کەسی شارەزا لە دیدورێی سەلەف لە یاوەران و تابعین، کە ناڕەوایی ئەو قەولەمان بۆ رون کاتەوە، ئیمامی شافیعیە رحمەالله، کە دەڵێ: کۆڕا (ئیجماع) ی یاوەران و تابعین و ئەوانەی بەدویاندا هاتن لەسەر ئەوە بو کە باوەڕ گوفتارو کردارو

---

١ــ عبدالقادر بن عبدالعزيز: الجامع في طلب العلم الشريف ٢/٥٢٩

نیەتە، کە هیچ یەکێك لەو سێیە بێ ئەوانی دیکە نابێتە باوەڕ.. (ابن تیمیة: مجموع الفتاوی ٧/٣٠٩) واتە: نە یەکیان و نە دوانیان بە تەنها باوەڕ دانامەزرێنێت، بەڵکو هەر دەبێت هەر سێکیان پێکەوە وەرگیرێن، چونکە پێکهاتەی یەکترن و بە هەموان هەبونی باوەڕ دێننە دی..

ئیمامی ئاجوری رحمەاللە دەڵێ[1] :ئەنجامدانی کردار بەڵگەی بە راست زانینی ئەو باوەڕەیە، کە لە دڵ چەسپیوە، کە زمان ئیقراری کردوەو دەری بڕیوە، جا هەر کەسێك بە کردار، وەکو دەسنوێژ گرتن و نوێژو زەکات و ڕۆژوو حەج و جیهادو هاووێنەیان هەبونی باوەڕەکەی ناخی نەسەلماند، هەر بەوەندە رازی بو کە گوایە بە دڵ و زمان باوەڕی سەلماندوە، دەبێت موسوڵمانێتیەکەی لە کوێدا بێت؟! ئا ئەمەی لاف ئیمانداری بە دڵ وزمان لێدەدات وکردار ناکاتە پێکهاتەی باوەڕەکەی، کەی موسوڵمانە؟! ئەوکرداری دڵ و زمانە چ دادێکی دەدات؟! وەل کردنی کردەوەکان وئەنجامنەدانی بەڵگەی بەدرۆخستنەوەی باوەڕەکەیەتی.. بۆیە پێویستە ئەوە بزانیت، کە وەکو وتمان کردار بەڵگەی راستی هەبونی باوەڕەکەی دڵە.. ئەمەش دیدو رێی زانایانی کۆن و نوێی ئوممەتی موسوڵمانە، هەر کەسێك غەیری ئەمە بڵێ ئەوە مورجیئەی پیس و بۆگەنە.. هۆشت لە دینی خۆت بێت ولا نەکەیت بەلای ئەوانەوە.. بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەو ئایەتەیە، کە خوای گەورە تێیدا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ﴾ البينة / ٥ واتە: فەرمانی ئەوەیان پێکرابو، کە تەنها خوای گەورە بەڕاست ودروستی بپەرستن و، لا نەکەن بە لای هیچ دینێکی ترەوە، هەروەها نوێژەکانیان بکەن و زەکات بدەن، ئا ئەوەش دین و دینداری راست و دروستە..

---

١ـ الأجري: أخلاق العلماء ل ٢٨ لە سفر الحوالي: ظاهرة الارجاء في الفكر الاسلامي ٢/٦٤٧ وەرگیراوە ..

# باسی سێیەم

# شیکردنەوەی بەڵگەی مەدخەلی و پاڵانتەوانانی ( سەلەفێتی ) بە فەرمودەی دۆزەخیەکان

(سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی) زۆرجار بۆ بەهێز کردنی هەڵوێستی خۆیان، حەدیسی شەفاعەت بە بەڵگە دەهێننەوە، کە تێیدا هاتوە، کە خوای پەروەردگار کۆمەڵێك خەڵك، کە پێیان دەوترێت (دۆزەخییەکان) لە دۆزەخ دەردەهێنێت و دەیانخاتە بەهەشتەوە، بێ ئەوەی کاروکردایان ئەنجام دابێت.. ئەویش بەم شێوەیە:

ئەبو سەعیدی خودری خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: (إِذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ وأمِنُوا فـ (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِه) مَا مُجَادَلَةُ أَحدكُمْ لِصَاحِبِه فِي الْحَقِّ يكُونُ لَهُ فِي الدُّنْيَا بِأَشَدَّ مِنْ مُجَادَلَةِ الْمُؤْمِنِينَ لِرَبِّهِمْ لِأَخْوَانِهِمُ الَّذِينَ أُدْخِلُوا النَّارَ، قَالَ: يَقُولُونَ رَبَّنَا إِخْوَانُنَا كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَنَا وَيَصُومُونَ مَعَنَا وَيَحُجُّونَ مَعَنَا (وَيُجَاهِدُونَ مَعَنَا) فَأَدْخَلْتَهُمُ النَّارَ، قَالَ: فَيَقُولُ: اِذْهَبُوا فَأَخْرِجُوا مَنْ عَرَفْتُمْ مِنْهُمْ، فَيَأْتُونَهُمْ، فَيَعْرِفُونَهُمْ بِصُوَرِهِمْ، لا تَأْكُلُ النَّارُ صُوَرَهُمْ فَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ النَّارُ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْه، وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ الَى كَعْبَيه، (فَيُخْرِجُونَ مِنْهَا بَشَرًا كَثِيرًا) فَيَقُولُونَ رَبَّنَا قَدْ أَخْرَجْنَا مَنْ أَمَرْتَنَا، ثُمَّ يَقُولُ ارْجِعُوا فَمَنْ كَانَ فِي قَلْبِه وَزْنَ نِصْف دِينَارٍ مِنْ خَيْرٍ فَأَخْرِجُوهُ فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا ثُمَّ يَقُولُونَ رَبَّنَا لَمْ نَذَرْ فِيهَا أَحَدًا مِمَّنْ أَمَرْتَنَا بِه حَتَّى يَقُولُ أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِه مِثْقَالَ ذَرَّةٍ (فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا) قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ: إِنْ لَمْ تُصَدِّقُونِي بِهَذَا الْحَدِيث فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ (إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِنْ تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِنْ لَدُنْهُ أَجْرًا

عَظِيمًا)[1] قَالَ فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا أَخْرَجْنَا مَنْ أَمَرْتَنَا، فَلَمْ يَبْقَ فِي النَّارِ أَحَدٌ فِيهِ خَيْرٌ! قَالَ: ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: شَفَعَتِ الْمَلَائِكَةُ، وَشَفَعَتِ الأَنْبِيَاءُ، وَشَفَعَ الْمُؤْمِنُونَ، وَبَقِيَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ، قَالَ: فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّارِ، أو قَالَ قَبْضَتَيْنِ، فَيُخْرِجُ مِنْهَا قَوْمًا لَمْ يَعْمَلُوا خَيْرًا قَطُّ قَدْ احْتَرَقُوا حَتَّى صَارُوا حُمَمًا، قال: فيقال لهم: ادخلوا الجنة، فما تمنيتم و رأيتم من شئ فهو لكم (ومثله معه) فيقول أهل الجنة: هؤلاء عتقاء الرحمن، أدخلهم الجنة بغير عمل عملوه ولا خير قدموه)[2] واتە: دوای ئەوەی موسوڵمانەكان لە مەترسی چارەنوسی دۆزەخ قوتار دەبن، دەكەونە موناقەشەی كەسانی دیكە، قەسەم بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە بەرگریی كردن و موناقەشە كردنتان لەسەر ماف هاوڕێكانتان لە دنیادا گەورەترو گرنگرتر نابێت وەك لەوەی لە قیامەتدا دەتانبێت لە خزمەت خوای پەروەردگاردا لە بەرگری كردنتان لەوانەی خراونەتە دۆزەخەوە، ئینجا ئەو موسوڵمانانە (ئەوانەی موناقەشەو بەرگریەكە لە موسوڵمانەكانی تریان دەكەن كە خراونەتە ناو دۆزەخەوە عەرزی خوای گەورە دەكەن: خوایە خۆ ئەوانە لەگەڵماندا بون، نوێژیان دەكرد لەگەڵماندا، ڕۆژوویان دەگرت لەگەڵماندا، زەكاتیان دەدا لەگەڵماندا، جیهادیان دەكرد لەگەڵماندا، كەچی تۆ خستوتنە ناو ئاگری دۆزەخەوە! خوای گەورە دەفەرموێ: بڕۆن هەرچی دەناسن دەریان بهێننەوە. دەچن و هەرچیەك بە دەموچاو ڕەنگ و ڕوویاندا دەناسن دەریان دەهێننەوە، كەسیان ئاگر دەموچاوی نەسوتاندون، هەر لە ئاگردان، هەیە ئاگر تا ناوەندی لولاقی هاتوەو، هەیانە تا قولەپێی هاتوە، ئیتر خەڵكێكی زۆریان لێ دەهێننە دەرەوەو دەڵێن: خوایە هەرچی فەرمانت پێكردبوین بیانهێنینە دەرەوە، هێناومانەتە دەرەوە، كەس لە دۆزەخدا نەماوە خێرێكی پێوە مابێت (یەعنی كردەوەیەكی چاكی كردبێت) ئینجا خوای گەورە

---

١ـ النساء / ٤٠

٢ـ ئەم فەرموودەیە لای بوخاری و موسلیم و ئیمامی ئەحمەدو خاوەن سوننەكانیش هەیە، لەگەڵ جیاوازی هەندێك ووشەو رستە، شێخی ئەلبانی رەحمەتی توێژینەوەی لەسەر كردووەو بێ گومان بە سەحیحی داناوە. بڕوانە: ( الالباني: حكم تارك الصلاه ل ٧ ).

دەفــەرموێ: فریشــتە شــەفاعەتیان كــرد، پێغەمبــەران شــەفاعەتیان كــرد، موســـوڵمانان شـــەفاعەتیان كـــرد، بـــەزەییترینی خـــاوەن بەزەییـــەكان (ئەرحــەموراحمین) مــاوە، ئینجا چنگێك لــەو خەڵكــە تــاو دەداتــێ و لــە ئــاگر دەریان دەهێنێت، كــە بــە هــیچ شێوەیەك كردەوەیەكی چاكیان لەبــەر خــاتری خوا نەكردوە، هەمویان داپلوخاون و بون بــە خــەڵوز، دەهێنــرێن بــەرەو ئاوێــك كە پێــی دەوترێت ئــاوی ژیــان، ئــەو ئاوەیــان بەســەردا دەكرێت، هــەر هــەمویان وەكو دانەوێڵەی گوێ روبار دەڕوێنەوە..

ســەلەفیەكانی بــەر ســێبەرو مەدخەلیــەكان وپاڵانتــەوانانی ســەلەفی ئــەم فەرمودەیەو فەرمودەكانی تری هاومانای وەك گورزی دەستی پاڵەوان بەرامبــەر راجوێكانیان بەكار دەهێنن، وەك فەرمودەی: (مَنْ قَــالَ لا الــه الا الله مُخْلِصَــاً مِنْ قَلْبِهِ حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ )[1] واتە: هەر كەسێك سەرراستانە پڕ بــە دڵ بڵــێ: (لا الە الا الا الله) خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخی یاساغ دەكات.. چونكە ئــەم فەرمودانە واڵێك دەدەنەوە، كە بەڵگەی ئەوەن كە كردار مەرج نیەبۆ قوتاربون لە دۆزەخ و مانەوە تێیدا..

وەڵامی ئەم گومانە لە چەند لایەنێكەوە دەدەینەوە:

**یەكەم:** ئەوەی كە (سەلەفیە) كــان لــەم فەرمودانــە حــاڵی بــون، پێچەوانەی تێگەیشــتن وحــاڵیبونی پێشــەوایانی ســەلەف و زانایــانی ئــەهلی ســوننەت و جەماعەتە! سەیریش ئەوەیە ئەوان ئەو خەڵكەیان داوەتــە بــەر گورزو، پێیــان دەڵێن: (پێویستە تێگەیشتن لە قورئان وسوننەت بــە پێــی تێگەیشتنی سەلەف بێــت)! ئــەدی بۆچــی لــە تێگەیشــتنی ئــەم تەوەرەباســە كاریگــەرە خۆیــان لــە تێگەیشتنی سەلەف بواردوە؟!

ئەگەر راست بێت و ئەم فەرمودەیە ئەوە بگەیێنێت، كە كردار مەرجی باوەڕ نیەو، ئەوی هیچ كردارێكی نیــە، كــافر نابێــت، دەبــو ئــەم تێگەیشــتنە بخرایاتــە

---

١ـ بوخاری/ كتاب العلم ( ١٢٨ ).

بەر رۆشنايى كۆڕاى زانايان وپێشەوايانى سەلەف، نەك بە پێچەوانەى بنەما سەرەكيەكانەوە بەكار بهێنرێت، وەكو ئيمامى شاتيبى گوتى: لقە بەشييەكان (الفروع الجزئية) ناشێت دژايەتيان هەبێت لەگەڵ بنەما ئوسوڵيە گشتيەكان (الاصول الكُلِّيَّة)، چونكە لقە بەشييەكان، ئەگەر نەبنە ئاڕاستەوانى كردارێك دەبێت بوەستێنرێن، ئەگەر بوشنە رێساى كردارێك، دەبێت لەگەڵ بنەما سەرەكيە گشتيەكاندا بسازێنرێن، چونكە گەڕانەوە سەر ئوسوڵەكان گەڕانەوەيە بۆ رێى راست.. هەر كەسێك ئەمە پێچەوانە بكاتەوە دەكەوێتە بەر شالاوى گلەيى ... (الاعتصام ١/١٧٤).

هەروەها دەڵێ: هەر كەسێك بەڵگەى شەرعى ديراسە بكات، دەبێت ئەوە رەچاو بكات، كە سەلەفيانى يەكەمين چۆن لێيان تێگەيشتون و چۆنيان بە گەڕخستون، ئەمە ڕاسترەوييەو جيدديەتى زانست و كار پێكردنێتى .. (الموافقات ٣/٥٧)...

**دووەم:** پێشتر هۆشدارى ئەوە درا، كە ئيستيدلال كردن بە كۆمەڵێك خاڵى گشتى دەقە شەرعيەكان، بێ ئەوەى رەچاوى ئەو بەڵگەو خاڵانەى تريان بكرێن، كە بە شتێكيانەوە تايبەت دەكەن، ئەوە سيفەتى ئەهلى بيدعەو ياخيانى شەرعە..

وشەى (الخير) يان (العمل)، كە لە فەرمودەى دۆزەخيەكاندا هاتوە، كە خواى گەورە دەيانخاتە بەهەشتەوە، بێ ئەوەى كاروكردارى باشيان ئەنجام دابێت (بغيرِ عَمَلٍ عَمَلُوهُ)، پێيان دەوترێت شێوازى گشتى (صِيَغُ العمُوم)، چونكە نەزانراون لە رستەى نەفيدا (نَكِرَةٌ في سِياقِ النفي)، ئەمەش بەرامبەرەكانمان دەخاتە سەر دوو رێيانێك، كە رێى سێيەمى وەكو كوچەى خۆ دزينەوەش نيە:

- يان ئەوەيە ئەم گشتيە تايبەت كراوە، يان نەكراوە..

ئەگەر لاف ئەوەى لێدا، كە ئەمە گشتيەو تايبەت نەكراوە، ئەوە دەبێت بە تووش ئەو قسەيەوە، كە ئەگەر كەسانى تريش وابكەن و تەنانەت بە

تەوحیدیشـەوە پابەنـد نـەبن، دەبـێ بـەر ئـەو شـەفاعەتە بكـەون، كـە لـە فەرمودەكەدا باسی هاتوە، یەعنی هـەمو كەسێك دەتوانێت داواكـراوی شـەرعی جێبـەجێ نـەكات و لـە بەرامبەریشـدا سەرپێچـی و تاوانكـاریی بكاتـە پیشـەو ئومێدی تەواویشی بەو شەفاعەتە هەبێت، كە موسوڵمانانی تر بۆی دەكەن، یان پێغەمبەران و فریشتە، یان ئەوەی خوای (ئەرحەموڕاحمین) دەیكات.. ئەمـەش قسەی كردن نیە، چونكە جێی نكوڵی كردنە، لەبەر ئـەوەی بـەدرۆ خستنەوەی زەق و ئاشـكرای دەقـە شـەرعیەكانە و، بەرهەڵستی بەڵگەنەویستـەكانی دیـن و دینداریە، لەوانە: بەهەشت غەیری موسوڵمان ناچێتە ناوی..

ئەگـەر لاف ئـەوەش لێـدەدەن، كـە نكـوڵی كردنـی هـەبونی چـاكەی ئـەو دۆزەخییانە لەو فەرمودەیەدا گشتیە، بەڵام تایبـەت كـراوە، واتـە ئەوانـەی ئـەو شەفاعەتانە دەیانگرێتـەوە، جگـە لـە شایەتمان هێنـان هیچـی تریـان نـەكردوە، پێیان دەڵێین: ئەم تایبەتكردنەتان لە كوێوە هێناوە؟!

ئەگەر وتیان هەر لە هەمان فەرمودەوە.. دەڵێین: ئەمە داتاشینی مانای ترە! چونكە فەرمودەكە نـەفی گشـتی تێدایـە.. بـە شـێوەیەكی گشتی دەفـەرموێ، كـە هیچ كاروكرداریەكی باشیان نەكردوە..

ئەگەر وتیشی بە دەقی تر دەیسەلمێنم، ئەوە بەڵگەهێنانـەوەو هەنجەتەكـەی بڕا، چونكە نەیتوانی ئەم فەرمودەیە بكاتە بەڵگـەی نوقسـان حـاڵی بونەكـەی.. بۆیە پێی دەڵێین:

دەبـێ ئـەم فـەرمودە گشـتیە تایبـەت بكرێـت بـەو تـەوەرە باسـەوە، كـە دەقەكانی تر شەرحیان دەكـەن، كـە بریتیـە لـە كافربونی ئـەو كەسـەی كـە بـە یكجاریی واز لەكرداری چاكە دەهێنێت و نایانكـات. چـونكە دەقـە شـەرعیەكان چونە بەهەشت پەیوەند دەكەنەوە بەكرداری چاكەوە، ئیتر مانـای فەرمودەكـە ئـاوای لێـدێت: (ئەمانـە كـارو كردەوەیـەكی چـاكەی وایـان ئـەنجام نـەداوە، كـە شایانی قوتـاركردن لـە ئـاگری دۆزەخ و چونە بەهەشتییان بێـت) بۆیـە خـوای گـەورە بـە رەحمـەتی خـۆی خسـتونیەتە بەهەشـتەوە.. ئائەمـە ئـەو دیـدو

بۆچـونەیە کـە لەگـەڵ بنـەما ئوسـوڵیەکانی عەقیـدەی ئـەهلی سـوننەت و جەماعەتدا یەك دەگرێتەوە، کە لەسەر بناغەی تێگەیشتنی سەلەف بۆ قورئان وسوننەت دامەزراوە..

خوێنـەری بـەڕێز وا تێنـەگات، کـە ئـەم تایبـەت کردنـی فەرمودەیـە شتێکی نوێیەو ئێمە دامانهێناوە! نا، ئەمە هەر وەڵامی ئەهلی سوننەت و جەماعەتـەو، کـاتی خـۆی وەڵامـی مورجیئـە کۆنـەکانیان پـێ داوەتـەوە، ئێمـەش بەرامبـەر مورجیئـە نوێیـەکانی سـەردەم (سـەلەفیەکانی بـەر سـێبەرو مەدخەلیـەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی) هێناومانەتەوە.. چونکە گومانی (سـەلەفی) ەکـان کـۆن و نوێیە..

ئیمامی ئەبوبەکری کوڕی خوزەیمە رحمەالله دەڵێ: ( باب ذِكْـرُ الـدليل أنَّ جميعَ الآخبارِ التي تقدَّمَ ذِكْرِي لَهَا الى هذا الموضع في شـفاعةَ الـنبي صـلى الله عليه و سلم في إخراج أهلِ التوحيدِ من النارِ إنمـا هـي ألفـاظٌ عامـة مرادهـا خاص) .. (كتاب التوحيد ٢/٧٢٧).

ئەو بەڵگانە ئەوە دەگەیێنن، کە (هـەمو ئـەو فەرمودانـەی لێرەدا هێنرانـەوە لەسـەر تکـاکردنی پێغەمبـەری خـوا صــلى الله عليــه وســلم، کـە ئەوانـەی خوابەیەکناسـن لـە ئـاگری دۆزەخ دەهێنرێنـە دەرەوە) بـە مانـای گشـتین و مەبەست لێیان کارو کەسانی تایبەتە ...

پاش ئەوە دەڵێ: ئەم لەفزە (لَمْ يَعْمَلوا خَيراً قَطُ) لەو جۆرە دەستەواژانەیە، کـە عـەرەب لـە وتنیـدا بـۆ کـەم و کـورتی و تـەواو نـەبونی کارێـك بـەکاری دەهێنێت، مانای ئەسڵی ئەم عیبارەتـە ئەوەیـە کـە: قـەت کارێکیـان بـە تـەواوی نەکردوە، بەو شێوەیەیە، کـە خـوا فـەرمانی پێداوەو لەسـەری فـەرز کـردون .. (كتاب التوحيد ٢/٧٣٢) .

**شێخ سەفەر ئەلحەوالی دەڵێ: فەرمودەی کابرا، کە نوێژەکانی بە خراپی دەکرد پشتگیری ئەم لێکدانەوەیە دەکات... کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم پێی دەفەرمو: (ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ)[١] بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە چونکە تۆ نوێژت نەکرد!**

**ئەو نکوڵی کردنەکە لەبەر تەواو ئەنجام نەدانی نوێژەکەیەتی بەو شێوەیەی، کە خوای گەورە فەرزی کردوەو پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم رایگەیاندوە...ئەبو عوبەیدیش ئاوا ئیستیدلالی بەم فەرمودەیە کردوە .. (سفر الحوالي: ظاهرة الارجاء ٢/٧٥٢).**

**ئەگەر یەکێك لە قەرەچەناغەکانی مەدخەلی وتیەوە: بەڵام لەفزی فەرمودەی دۆزەخییەکان ڕۆشنە، کە مەبەستی لەوەیە کە (لَمْ يَعْمَلُوا خَيرًا قَطُّ) هیچ خێرێکیان نەکردوە، یەعنی جەخت کردنەوەیە لەسەر ئەوەی، کە هیچ جۆرە خێرێکیان نەکردوە. دەڵێین: ئێ فەرمودی (المُسِيءُ صَلاتَهُ) مکەش هەر وایە! جەختە لەسەر ئەوەی، کە تۆ نوێژەکەت نەکردوە ،کابرا نوێژەکەی وەکو**

---

١ـ تەواوی فەرموودەکە ئاوایە: ( عَلِيُّ بْنُ يَحْيَى بْنِ خَلادٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمِّهِ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ : أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى، فَلَمَّا قَضَى صَلاتَهُ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَى الْقَوْمِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَعَلَيْكَ، ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، قَالَ : فَرَجَعَ فَصَلَّى، فَجَعَلْنَا نَرْمُقُ صَلاتَهُ لا نَدْرِي مَا يَعِيبُ فِيهَا، فَلَمَّا قَضَى صَلاتَهُ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَى الْقَوْمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : وَعَلَيْكَ، ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ. فَذَكَرَ ذَلِكَ إِمَّا مَرَّتَيْنِ وَإِمَّا ثَلاثًا، فَقَالَ الرَّجُلُ: لا أَدْرِي مَا عِبْتَ عَلَيَّ مِنْ صَلاتِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّهَا لا تَتِمُّ صَلاةُ أَحَدِكُمْ حَتَّى يُسْبِغَ الْوُضُوءَ كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، فَيَغْسِلَ وَجْهَهُ، وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَيَمْسَحَ بِرَأْسِهِ وَرِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ يُكَبِّرَ اللَّهَ وَيَحْمَدَهُ وَيُمَجِّدَهُ، وَيَقْرَأَ مِنَ الْقُرْآنِ مَا أَذِنَ اللَّهُ لَهُ فِيهِ وَتَيَسَّرَ، ثُمَّ يُكَبِّرَ فَيَرْكَعَ، فَيَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ وَتَسْتَرْخِيَ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَيَسْتَوِيَ قَائِمًا حَتَّى يَأْخُذَ كُلُّ عُضْوٍ مَأْخَذَهُ، وَيُقِيمَ صُلْبَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرَ فَيَسْجُدَ، وَيُمَكِّنَ جَبْهَتَهُ مِنَ الأَرْضِ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ وَتَسْتَرْخِيَ، ثُمَّ يُكَبِّرَ فَيَرْفَعَ رَأْسَهُ فَيَسْتَوِيَ قَاعِدًا عَلَى مَقْعَدَتِهِ وَيُقِيمَ صُلْبَهُ، فَوَصَفَ الصَّلاةَ هَكَذَا حَتَّى فَرَغَ، ثُمَّ قَالَ: لا تَتِمُّ صَلاةُ أَحَدِكُمْ حَتَّى يَفْعَلَ ذَلِكَ) ئەبو داوود ( ٨٥٩ )، ترمزی ( ٣٠٢ )، نەسائی ( ٢/٢٠، ١٩٣ )، ئیبنوماجە ( ٤٦٠ ) شێخی ئەلبانی لە: صحيح أبي داود (٨٥٩ )دا دەڵێ حەسەنە.

نوێژ دەكرد، بەڵام پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم نكوڵی لە كردنی دەكرد، خۆ ئەو لەبەرچاوی پێغەمبەری خوا دەیكرد، كەوابو مەبەستەكە لە تەواو نەكردنێتی .. لێرەشدا جەخت كردنەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ڕۆشنە، كە دەفەرموێ: (فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ) بە تەئكید تۆ نوێژەكەت نەكردوە! خۆ دیارە مەبەستی لەوە نیە، كە نەمانبینیت ركوع و سجودی نوێژكردن ببەیت.. تۆ نوێژێكت كردوە، بەڵام ئەو نوێژە نیە، كە داوات لێكراوە، ئەو نوێژە نیە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فێری ئەو خەڵكەی كردوە.. دۆزەخییەكانیش هەر وان.. دۆزەخیەكان هیچ كارێكیان نەكردوە كەم و كورتی تێدا نەبێت، هیچ كارێكیان نەكردوە بە پێی فەرمانی خواو پێغەمبەری خواصلی الله علیە وسلم دروست بوبێت! لەوانەیە كاروكردەوەی چاكەیان زۆر كردبێت، بەڵام لەوانەیە ریای تێكەوتوە، بیدعەكارانە بوە، نوقسان بوە.. خوای گەورەش لێی وەرنەگرتون.. ئەمە ئەو حوكمە گشتیەیە، كە مەبەستەكەی حوكمی تایبەتە..

ئەمەی ئیمامی ئیبنوخوزەیمە باسی لێوە كردوە سازاوی دیدو بۆچونی ئەهلی سوننەت وجەماعەتە، لەگەڵ بنەما ئوسوڵیەكاندا یەك دەگرێتەوە، لەگەڵ كۆڕا (ئیجماع) ی سەلەفەدا یەك دەگرێتەوە، پڕاوپڕی عەقیدەی دەستەی سەرفرازان (فیرقەی ناجیە)یە، بۆیە دەست پێوەگرتن و پێوەپابەندبونی زەرورییە، لەو بترازێت لیتاوی هەوەسبازی و ئیسراحەتەكەی مورجیئەیە..

شێخولئیسلام ئیبنوتەیمییە شێوازی مورجیئەكان فەزح دەكات، كە ئاوا پەنا دەبەنە بەر مل بادانی (پێناسەی حوكمە گشتیەكان، كە بۆ مانای تایبەتن) بۆ مەبەستی خۆیان، تا بیان كەنە حوكمێكی گشتی لەسەر هەمو كێشەكان.. بۆیە دەڵێ: ئەمما ئەو كەسانەی، كە نوێژنەكەرو هاوشێوەیان بە كافر دانەناوە، هەنجەتەكەیان هەر ئەوەیە، كە ئەو بەڵگانەی بە دەستیانەوەیە، هەر دو جۆری

نوێژنەکەرەکان دەگرێتەوە: هەم ئەوانەی لە تەممەڵیدا نوێژ ناکەن هەم ئەو کەسانەش، کە نکوڵی لە فەرزبونی نوێژ دەکەن، ئەوەی دەبێتە وەڵام بۆ حوکمی نوێژنەکەری هۆی نکوڵی، دەشبێتە حوکمی نوێژنەکەری هۆی تەممەڵی. دەقەکان لەسەر وازلێهێنانی نوێژنەکەرن. ئەمەش وەکو ئیستیدلالی مورجیئەکان بە حوکمە گشتیەکان وایە، حوکمی گشتی وەکو: (مَنْ شَـهِدَ أَنَّ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَأَنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ)[١] واتە: هەر کەسێك شایەتی بدات کە هیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێت، جگە لە الله، شایەتی بدات، کە محمد نێرراوی خوایە و عیسا بەندەو نێرراوی خوایە، ئەو وشەو رۆحەیە، کە خوای گەورە خستیە ناخی مەریەمەوە، ئەوە خوا دەیخاتە بەهەشتەوە..

لەبەر ئەوەی (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپالآنتەوانانی سەلەفی) کاسیان کردوین، بەوەی، کە بەردەوام دەیدەن بە گوێچکەماندا، کە هەر کەسێك ئەهلی تەوحید نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە، ئێستا جێی خۆیەتی بە کورتی پێناسەی ئەو تەوحیدە لە لای ئەهلی سوننەت وجەماعەت بکەین، نەك ئەو تەوحیدە نوقسانەی لای ئەوان..

شێخ محمد بن عبدالوهاب رحمە اللە دەڵێ: راجوێیی لەوەدا نیە، کە تەوحید دەبێت لە دڵ وسەرزمان و زاهیری کردەوەدا بێت، ئەگەر یەکێك لەمانەی نوقسان بو، کابرا موسوڵمان نامێنێت، ئەگەر کاری پێنەکرد کافرێکی کەللەڕەقی وەکو فیرعەون و ئیبلیس و هاوشێوەیانە..(محمد بن عبدالوهاب: کشف الشبهات ل ٤٠) والحمدلله.

**سێیەم:** زۆرو لە زۆرشوێندا ئامۆژگاری ئەم بەناو (سەلەفی)انەمان دەکرد، کە هێرش مەکەنە سەر جۆری تێگەیشتنی دەقەکان، شتیش بە سەتحی تێمەگەن، بشزانن تێگەیشتنی دەق وسەرنج لێدان و لێوەرگرتن لێیان، وەکو

---

١ـ بوخاری ( ٣٤٣٥ )، النووی : شرح مسلم ( ١٩٤/١ ).

لەبەرکردنی مەلا کوێرەکان نیە.. بەڵام دەڵێێ گوێزمان بۆ ژماردون! بە راستی کابرای شاعیر راستی وتوە، کە دەربارەی کەروکونتێی وەکو ئەوان وتویێتی: لَقَدْ أسْمَعْتَ لَو نَادَيتَ حَيًّاوَلَكِنْ لَا حَياةَ لِمَنْ تُنَادِي[1]

ئەوەتا دیسان سەلماندیەوە کە ئێمە نەك هەر گوێزی بۆ دەژمێرین چوالەو چەقالەشیان بۆ دەژمێرین..

ئەم فەرمودەیەی، کە دەیانەویست لە (باب الایمان) دا بیکەنە هەنجەتی دەستیان، لە هەمو لایەکەوە بوە حوججەی قیامەت لەسەریان!

ـ **ئەگەر دەڵێن:** ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (کردار) مەرجێك نیە لە پێکهاتەی باوەڕ، چونکە دۆزەخییەکان هیچ کردەوەیەکیان نەبو، لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمان مابون..

پێیان دەڵێین: ئەو کردەوانە چین کە دۆزەخیەکان نەیانکردوە؟! ئایا (کرداری دڵ و جەستە) یە، یان تەنها (کرداری جەستە)یە؟!

ئەگەر دەڵێن: هەردو توخمی کرداری دڵ و جەستەیە، دەڵێین: کەوتنە دوو خانەوە:

یەکەم: سەلماندتان، کە ئێوە لە (باب الایمان) دا لە ریزی (توندڕەوانی مورجیئە) ن و لەسەر عەقیدەی ئەوانن! چونکە زۆرینەی دەستەو تاقمەکانی مورجیئە هەر کرداری دڵ دەخەنە پێکهاتەی باوەڕەوە.. جگە لە جەهم و ئەوانەی شوێنی کەوتون وەکو سالحی[2] ..

دووەم: ئێوە خۆتان بەستەوەو چونە کوڵانی بنبەستەوە، لێوی خۆتان گەستەوە.. ئێوە کرداری دڵ دەکەنە مەرجی پێکهاتەی باوەڕ، کەچی ئەوەتا پێچەوانەی دیدو تێڕوانینی خۆتان وەستانەوەو ریسەکەی خۆتان کردار بە

---

١ـئەگەرزیندووت بانگ کردایە هەر دەیبیست،بەڵام تۆ هاوار لەکەسێك دەکەیت گیانی تێدانەماوە !

٢ـ شێخولئیسلام باسی ئەمەی لە (مجموع الفتاوی ب ٧ ل ١٩٤) دا کردووە ..

خورى!!

**- ئەگەر دەڵێن:** ئەوكرداريەى فەرمودەى دۆزەخيەكان باسى فەرموە، تەنها (كردارى جەستە) يە، چونكە (كردارى دڵ) بۆ خۆى هەر مەرجى پێكهاتەى باوەڕەكەيە..

دەڵێين: فەرمودەكە حوججەيە لەسەرتان، چونكە نەفى هەمو توخمێكى كردار دەكات! ئێوە لاتان بە لاى ئەم خاڵەوە نەكردۆتەوە، چونكە هەر سەرخستنى خەت ومەزهەبى خۆتان پێ پەسەندە!

پاشان بە چ بەڵگەيەك ئێوە (كردارى دڵ) تان جوداكردەوە؟! بە چ بەڵگەيەك (كردارى جەستە) تان خستە ريزى نەفى كراوەكەوە؟ ئايا بە بەڵگەى ترە، يان بە سەرنجدانى خۆتانە؟!

ئەگەر وتيان بە بەڵگەى ترى جودا، دەڵێين: ئەمە تايبەت كردنى حوكمى گشتى دەقە!! ئەمە ئەوەيە، كە ئێمە دەشڵێين وئێوە لێى هەڵدێن، ئەوا ئێوەش هاتنە سەر راى ئێمە، كە هەندێك دەق هەيە حوكمى گشتى كێشەيەكن، بەڵام لە لێكدانەوەياندا تايبەت بە كەسانێك، يان روداوێك دەكرێن.. ئەوەتا ئێوەش لە حوكمە گشتيەكە كە كردارى دڵ وجەستە لە پێكهاتەى باوەڕن، حوكمەكەتان تايبەت كرد، چونكە تەنها كردارى دڵتان وەرگرت!

كەوابو ئێستا ئێوە ناچار دەبن، كە دەبێ جۆرەها كردارى جەستە نەفى بكەن، كە بەشن لە پێكهاتەى باوەڕ، كە باوەڕ بە بێ ئەوانە وجودى نيە.. ناشتوانن بەڵگەكان بۆ تەرەفى خۆتان پێچ پێ بكەنەوە. كەوابو ديارە كە ئەوەى كردوتانە بە بەڵگەى خۆتان، لە ڕاستيدا هەنجەتى پياوى بەزيوە، كە دەيەوێت كەنار كەوێت و لە ديلانێدا خۆى راژەنێت، تا خەوى لێ دەكەوێت..!

# باسی چوارەم

## مەدخەلیەكان و پالأنتەوانانی سەلەفێتی عەقیدەیان تەواو نیە

(حەلەبی) ویستی ئەوە بسەلمێنێت، كە ئەو عەقیدە مورجیئەیەی ئەو لەسەرێتی لە (باب الایمان)دا هەقە! دزەكارانە بە ماتەماتە بۆ دوو دەقی ئیبنوتەیمییەی شێخول ئیسلام چو، ملی هەردووكیانی گرت و بۆ پشتگیری خۆی هێنانی، نەیزانی خەڵكی ئاگای لێیەو دەیبینن، كە ئەمە ساختەكارییە! دەیویست ئەوە نیشاندا، كە كاروكرداری رواڵەت و دیار مەرجی تەواوێتی باوەڕن، نەك مەرجی پێكهاتەو دروستی باوەڕ، دەیەویست ئەوە بسەلمێنێت، كە قەناعەتی ناخ وكردار لازم و مەلزومی یەكتری نین، وا نین كە یەكیان هەبو، ئەوی تریشیان هەیە، ئەگەر یەكێكیان نەما ئەوی تریش نەمێنێت!

دەقی یەكەمی ئیمامی ئیبنوتەیمییە كە (عەلی حەلەبی) بۆ خۆی راپسكاندوە، ئەوەیە كە شێخولئیسلام دەربارەی باوەڕ دەڵێ: ئەسڵی باوەڕ لە دڵدایە، تەواوێتیەكەشی كردەوە دیارەكانە، بە پێچەوانەی پێناسەی (ئیسلام) ەوە، كە ئەسڵی دیارو تەواوێتیەكەی ئەوەیە كە لە ناخی دڵدا چەسپیوە. (ابن تیمیة: مجموع الفتاوی ٧/٦٣٧).

هەروەها ئەوەی، كە دەڵێ: بە تەئكید باوەڕی تەواو حەتمەن ئەوە دەخوازێت كە دەبێ بە پێی ئەوكرداری دیاری دەركەوێت، چونكە شتێكی نامومكینە باوەڕی تەواو لە ناخدا وجودی هەبێت و نەبێتە هۆكاری دەركەوتنی كاروكرداری ئاشكرا.. ( الایمان ل ٢٠٣).

تەعلیقی (حەلەبی) لەسەر ئەم دوو دەقە ئەوەیە، كە دەڵێ: (هەر كەس سەرنج داتە ئەم وەسف و بەندە (باوەڕی تەواو) ئیشكالاتێكی زۆری لا نامێنێت (الحلبي: صيحة النذير ل ٢٧)!!

تێگەیشتنە سەقەتەکەی (حەلەبی) هەڵدەوەشێنینەوە:

**پـواز[١] ی یەکـەم:** لـە قسـەکەی شێخولئیسـلامدا هـیچ شـتێکی تێـدا نیـە (حەلەبی) بیکاتە نیرگەی پاڵپشتی بیدعەکەی خۆی... چونکە ئیبنوتەیمییە دەفەرموێ: (ئەسڵی بـاوەڕ لـە دڵدایـە، تەواوێتیەکەشی کـردارە ئاشـکراکانە، بـە پێچەوانەی پێناسەی (ئیسلام)ەوە، کە ئەسڵی دیارو تەواوێتیەکەی ئەوەیـە، کـە لـە نـاخی دڵـدا چەسـپیوە..) لـە بـەراوردی نێـوان پێناسـەی بـاوەڕو پێناسـەی ئیسلام (الایمان) و (الاسلام) دا هێناوێتیـەوە.. ئـەوە ئاشـکرایە کـە ئەگـەر ئـەو دوو زاراوە پیرۆزە بە جیا لە شوێنێکدا بەکار هاتن، هەر یەکـەیان مانـای ئـەوی تریشیان دەدات، بەڵام ئەگەر پێکەوە لە شوێنێکدا باسکران، ئـەوە مەبەسـت لـە باوەڕ بە راست زانینی دڵەو مەبەست لە ئیسلامیش توخمی کردارە[٢] (ابن رجب الحنبلي: جامع العلوم و الحكم ١/١٠٨).

ئەگـەر لەمـە حـاڵی بویـت، سەریشـت لـەوە دەردەچـێت، کـە بۆچـی ئـەم دۆستەمان ئاوا بە ماتەماتە بۆ دەقەکان چوە!! ئەگـەر نـا، ئایـا مەعقولـە وا لـە دەقـەکانی شێخولئیسـلام تـێ بگـەین، کـە مەبەسـتی لـەوە بێـت، کـابرا کـە موسوڵمانە، لە حەقیقەتدا بە هۆی کردارە دیارەکانیەوەیـەتی، نـەك بـەوەی لـە نـاخی دڵ و دەرونیـدا هەیـە! چـونکە بـە پێـی ئـەو تێگەیشـتنە سـەقەتە: موسوڵمانێتی بریتیە لەکرداری دیارو تەواوێتی موسوڵمانێتیش وا لە دڵدا!!

ئا ئەمەیـە، کـە دەترسـم ئـەم (حەلـەبی) انـە محەلەبیانـە هەڵیلوشـن وببنـە (مورجیئەی کەرامیە)، کە زانایانی ئیسلام بە کافریان دادەنان!

---

١- پواز، سنگێکە لە درزی داری قەڵشاوی دەنێن، تا یەك نەگرێتەوە ..

٢- لە کوردیدا کە دەڵێین: کابرا موسوڵمانە یەعنی هەم باوەڕی بە شەش روکنـەکانی بـاوەڕ هەیـەو کـرداری دڵ ئـەنجام دەدات، هـەم بـاوەڕی بـە پێـنج ڕوکنەکـەی ئیسـلام هەیـەوکردارە ئاشـکراکانی ئیسلامەتی جێبەجێ دەکات، بەڵام لـە عەرەبیـدا پێناسـەکان زەقترن،چونکە مؤمن و مسلم بەرامبـەر زاراوەی (موسوڵمان) ی کوردی بەکار دێت، بۆیە لە عەرەبیەکەدا جێ موناقەشەیەکی زۆرتـرە. ئـەویش گوتویەتی: ئەگەر لە یەك جێدا پێکەوە هاتن، هەر یەکەیان مانای خۆی دەگەیێنێت، ئەگەر بە جیا بەکار هاتن هەر یەکەیان مانای ئەوی تریشیان دەبەخشێت ..

شێخولئیسلامی رەحمەتی دەڵێ: ئەگەر ئەمە زانرا، کە ئەسڵی باوەڕ ئەوەیە، کە لەدڵدا جێگیر دەبێت، ئەو کاتە ئەوەش دەزانرێت کە جاری وا هەیە، کە پێناسەی باوەڕی کەسێك دەکرێت، مەبەست لێی ئەوە دەبێت کە لە دڵی چەسپیوەو کردەوەکانی دڵی پێ ئەنجامداوە، وەکو: بە راستگۆزانینی خواو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆشەویستی و بە مەزن زانینیان، ئەو کاتە گوفتارو کرداره زاهیریەکان دەبنە نیشانەو پێداویستی وداواکاری باوەڕەکەی دڵ.. جاری واش هەیە: مەبەست لێی ئەوەیە، کە لە ناوەوەو دەرەوەی کەسەکەدایە[1].. ئەو کاتەش پێداویستیەکانی باوەڕو داواکاریەکانی بەشێك دەبن لە باوەڕەکە وکردار دیارەکانیش پێیان دەوترێت موسوڵمانێتی (ئیسلام) .. لەمەوەیە، کە جاری وا هەیە کردار بەشێکە لە باوەڕو جاری واش هەیە بەشێك نیە لێی..

جاری وا هەیە یەك زاراوە چەندین واتای هەیە، هەر یەکێك لەو واتایانە لە شوێنی تایبەتی خۆیاندا، کە بەکار دێن مانا تایبەتیەکانی ئەو شوێنەیان دەبەخشن.. لەوانەیە زاراوەکە یەك بێت، بەڵام بە دوو مانا لە یەك شوێندا بەکار بهێنرێت، بەڵام کە دوو ماناکەی پێکەوە بەکار دێن، هەر یەکەیان واتایەکی سەربەخۆ دەگەیێنێت.. وەکو زاراوەی (فقیر)، (مسکین)، هەر یەکەیان بە جیا بەکار بهێنیت، هەردوو ماناکە دەبەخشێت، بەڵام ئەگەر پێکەوە لە یەك شوێندا بەکار هاتن، هەر یەکەیان مانا تایبەتیەکەی خۆی دەبەخشێت.. (مجموع الفتاوی ٧/٥٥١). (الایمان ) و (الاسلام )یش وان..

دواتر ئیبنوتەیمییەی رەحمەتی هەمو ئەو وەسف وسیفەتانە تورهەڵدەدات، کە (حەلەبی) پێوەی لکاندوە، دەڵێ: مورجیئەکان کرداری ئاشکرایان لە مەرجی باوەڕ کردۆتەوە، ئەوانەشیان، کە کرداری دڵیشیان لە مەرجی باوەڕ کردۆتەوەو وتویانە، هەر راستگۆ زانینەکە بەسە، ئەوانە وێڵ و گومڕا بون.. ئەمما ئەوانەی، کە کرداری ئاشکرایان لە مەرجی باوەڕ بردۆتە دەرەوە پێیان

[1] ـ قەناعەتی دڵی و کردەوە دیارەکانی پێکەوە ..

دەوترێت: کرداری ئاشکرا لە کرداری دڵەوە هاتووەو لێی جودا نابێتەوە، ئەگەر کرداری ئاشکرا نەما، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هیچ لە دڵدا نەماوە.. (مجموع الفتاوى ٧/٥٥٤)..

**پوازی دووەم:** قەولەکەی شێخولئیسلام لەسەر باوەڕ:(شتێکی نامومکینە باوەڕی تەواو لە ناخدا وجودی هەبێت و نەبێتە هۆکاری دەرکەوتنی کاروکرداری ئاشکرا) بە هیچ شێوەیەك نابێتە بەڵگەی تێگەیشتنە سەقەتەکەی (حەلەبی)! لەبەر سێ هۆ:

**هۆی یەکەم:** قەولەکەی شێخولئیسلام لە ناوەرۆکی ڕەتکردنەوەی ئەو بۆچونەدایە، کە دەڵێ: باوەڕی تەواو کردار ناخوازێت، ئەویش دڵنیایی ئەوەیدا، کە شتێکی نامومکینە باوەڕ لە دڵدا تەواو ببێت ئەگەر کرداری لەگەڵدا نەکرێت.. ئاوا دەڵێ، ناڵێ باوەڕ بە بێ کرداریش دێتە دی..

بۆ بنبڕکردنی تەواوی گومانەکە، قەولەکەی ئیمامی ئیبنوتەیمییە بە تەواوی دێنینەوە، تا ئەوە رون بێتەوە، کە ئەو ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە باسوخواسی ڕەتدانەوەی ئەو بۆچونەدا ئەوەی فەرموە، کە گوایە باوەڕی تەواو بۆ خۆی بێ کرداریش دادەمەزرێت. ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ:

ئەو گومانەکەیان (گومانی مورجیئەکان) ئەوەیە کە باوەڕ لە دڵدا بەبێ ئەنجامدانی کردەوە دێتە دی، لەمەوەیە کە کردار دەکەنە بەرهەمی ئەو باوەڕە، نەك بەشێك لە پێکهاتەی.. واتە دەیخەنە خانەی ئەسباب وموسەببیباتەوە[1].. بەڵام بە تەئکید هەبونی باوەڕی تەواو لە دڵدا حەتمەن هەبونی کردار دەخوازێت، ئەوە مەحاڵە باوەڕێك لە دڵدا بێت و کرداری ئاشکراو دیار نەخوازێت و بشوترێت: باوەڕێکی تەواوە.. ئەمەش خستونیەتە جەدەلێکی بێ ماناوە، بۆ ئەوەی بڵێن پەیوەندی نێوان بەدەن و دڵ نیە، شتی

---

١ـ یەعنی هەبوونی باوەڕ لە دڵدا، هۆکارێك دەبێت بۆ ئەنجامدانی کار، بەڵام نەبوونی کارەکە نابێتە هۆکاری نەمانی باوەڕەکە... واتە کردار بەشێك نیە لە پێکهاتەی باوەڕ .. ئەمەش پێچەوانەی ڕای یاوەران و تابعینە. (وەرگێڕ) .

وا دەڵێن روودانی ئەستەمە، بۆ نمونە دەڵێن: ئەو کەسەی باوەڕ لە دڵیدا هەیە، با سوجدەیەکیشی بۆ خوا نەبردبێت، یان رۆژوی رۆژێکی رەمەزانی نەگرتبێت، باوەڕی وەکو باوەڕی ئەبوبەکری سددیق و عومەری کوڕی خەتتاب وایە!! چونکە باوەڕی تەواوی هەیە!! (ابن تیمیة: الایمان ل ٢٠٣).

مورجیئەی وەکو (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی) لەمەدا هاواریان لێ هەڵدەستێت لەبەر ئەوەی گوایە ئەوان مورجیئە نین، بەڵام بە دڵنیاییەوە هەمو ئەو مورجیئانەی بۆچونیان وایە، کە کردەوەی دیارو ئاشکرا بەشێك نیە لە پێکهاتەی باوەڕ وا دەڵێن، هیچیان وەکو زانایانی سەلەف ناڵێن، کە کردار بەشێکە لە هەبونی باوەڕ، کە ئەمیان نەبو ئەویشیان نابێت، کە ئەمیان ئەنجامدرا ئەویشیان بونی دەبێت..

ئیمامی ئیبنوتەیمییە جەخت لەوە دەکاتەوە، کە هەر کەسێك کردارو گوفتاری دەرەکی ئاشکراو دیاری نەکردە بەشێك لە پێکهاتەی باوەڕی ناخ و مەرجی هەبونی، حوکمی ئەو کەسە وەکو حوکمی مورجیئەیە.. ئەمەش پێناسەیەکی کۆنەو شیاوی حاڵ و ئەحواڵ وگەدەو گیپاڵی (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی)ی ئەمڕۆیە..

شێخولئیسلام دەڵێ: ئەو کەسانەی کرداری دیارو ئاشکرا ناکەنە بەشێك لە پێکهاتەی باوەڕ وەکو مورجیئەکانن، وەکو ئەوانن، کە دەڵێن: بەندە هەر بەوەندەی لە ناخیدا باوەڕی هێنا، ئیتر باوەڕەکەی وەکو باوەڕی پێغەمبەران و نێرراوانی خوا دەبێت سەلامی خوایان لێ بێت، با هیچ کارو کردەوەیەکی باشیش نەکات و لە جیاتی ئەوە هەر خەریکی خراپەکارییش بێت! با نوێژ نەکات و سیلەی روحمی خزمایەتیش جێبەجێ نەکات، با راستگۆش نەبێت و گوناحی گەورە نەمێنێت نەیکردبێت، یان نەیکات! ئەم کابرایە، کە قسە دەکات درۆ دەکات، کە بەڵێن دەدات نایباتە سەر، کە ئەمانەتی لا دادەنێن دەیخەوتێنێت، ئەمەی بەردەوامە لەسەر گوناحکردن، لەسەر درۆو دەلەسەو خیانەت، ئەمەی کە سوجدەیەکی بۆ خوا نەبردوەو نابات، کە چاکەیەکی

لەگەڵ كەسێكدا نەكردوەو نایكات لە زوڵم وستەم وخراپەكاریی ناگەڕێتەوەو هەرچی گوناح هەیە كردویّتی وسورە لەسەر كردنی، ئائەمە باوەڕەكەی وەكو باوەڕی پێغەمبەران وایە! ئەمە رای هەمو ئەوانەیە، كە دەڵێن: كردەوەی دیارو ئاشكرا بەشێك نیە لە پێكهاتەی باوەڕ. (مجموع الفتاوى ٧/٥٨٤). پێشتریش لە پەراوێزی ژمارە (١٨) دا ئەو قەولەیمان هێنایەوە كە شەرحی لازم و مەلزومێتی باوەڕو كردەوە دەكات و كردار بە (لازم)ی باوەڕ دادەنێت، كە گوتی: (متى وُجِدَ الملزومُ وُجِدَ اللازِمُ، وَمَتَى انْتَفَى اللازِمُ انتفَى المَلزومُ، واذا انتفى لازِمُ الشَّئِ عُلِمَ انَّهُ مُنْتَفٍ) بڕوانە (موافقة صحيح المنقول لصريح المعقول١/٥٣) واتە: هەر مەلزومێك هاتە دی بەڵگەنەویستە كە لازمەكەشی هاتۆتە دی، لازمی هەر شتێكیش نەهاتە دی مەلزومیشی نایەتە دی لازمی هەر شتێك نەما ئەو شتەش نامێنێ ..

**هۆی دووەم:** قەولەكەی شێخولئیسلام بە تەئكید پڕاوپڕ هاوجوتی بۆچونی زانایان و شەرعناسانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، لەو روەوە كە خۆی پێناسەیان دەكات و واشە، نەك لەو لاشییانەوە، كە عەلیلی حەلەبی دەیەوێت غەڵبەغەڵبی تێدا بكات تا سەر لە خەڵكەكە بشێوێنێت.. وەكو، كە خۆی لێی حاڵی نەبوە، یان نایەوێت لێی حاڵی بێت، دەیەوێت خەڵكەكەش چەواشەكات، تا بیانخاتە دوای خۆی! هەرچەندە زۆر جار قسەكانی خۆی دەبنەوە لوغمی هەڵتەكاندنی خۆی.. چونكە لە هەر لایەكەوە بۆ بۆچونی زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بچیتەوە هەر ئەوەت زیاتر بۆ رون دەبێتەوە كە (باوەڕی تەواوی دڵ بە قەدەر هەبونی خۆی كرداری دەرەكی ئاشكراو دیار دەخوازێت)..

ئەمەش ئەو حەقەیە، كە لە قورئان وسوننەتدا هەیە، نەك ئەوەی (حەلەبی) كە دەیەوێت بە غەڵبەغەڵب و ژاوەژاوی خۆی پێمان بسەلمێنێت، كە كردار مەرجی (تەواوێتی) باوەڕە، نەك مەرجی پێكهاتەی، ئەوەش یەعنی (وەكو سەلەفیەكانی بەر سێبەرو مەدخەلیەكان وپاڵانتەوانانی سەلەفی

دەیانەوێت) ئەگەر كارو كردەوە نەما، كابرا هەر بە موسوڵمانی دەمێنێتەوە، بەڵام باوەڕەكەی نوقسانە!! نەك ئەوەی ئەهلی سوننەت وجەماعەت دەڵێن كە (باوەڕ لە دڵدا بە پێی هەبون و بڕو رادەی كرداری دیارو ئاشكرای دەرێیە، ئەمیان چەند بێت ئەویشیان لە ناخدا ئەوەندەیە، ئەگەر ئەمیان لە دەرەوە كەمی كرد ئەویشیان لە ناوەوە كەم دەكات، تا وای لێ دێت ئەمیان لە دەرەوە هیچی نامێنێت، ئەویشیان لە ناوەوە هیچی لێ نامێنێتەوە)..

بۆچونی یەكەم كە (سەلەفیەكانی بەر سێبەرو مەدخەلیەكان و پاڵانتەوانانی سەلەفی) دەیانەوێت لەبەر خاتری حاكمە رەزاقورسەكان بەو خەڵكەی بسەلمێنن، كە باوەڕی ئەو حاكمە خائینانەش وەكو باوەڕی سەیدنا ئەبوبەكری سددیقە!

لە دوو لاوە بواری پوكاندنەوەی رای (سەلەفیەكانی بەر سێبەرو مەدخەلیەكان وپاڵانتەوانانی سەلەفی) هەیە:

**بواری یەكەم:** ئەم بۆچونە لە هەمو لایەنەكانیەوە پێچەوانەی پێناسەو بۆچونەكانی ئیمامی ئیبنوتەیمییەیە، كە بە راشكاوی دەڵێ: **هەر كەسێك هەمو** كردەوەكانی واز لێهێنا، كافرە، تەنانەت ئەو دەڵێ (أكفر الخلق)ە.. وەكو لە بەندی یەكەمدا هێنامانەوە..

**بواری دووەم:** ئەم بۆچونە كاڵفامەی (سەلەفیەكانی بەر سێبەرو مەدخەلیەكان وپاڵانتەوانانی سەلەفی) بۆچونی ئیمامی ئیبنوتەیمییە بە شێواو پشێو دەخاتە رو! چونكە حەلەبی و ئەمسالی ئەو دەیانەوێت شێخولئیسلام راكێشنە ریزی حزبەكەی خۆیان و بڵێن: ئەوەتا ئیبنوتەیمییەش بۆچونی وایە، كە باوەڕی دڵ (بە راستگۆزانین) بە بێ هەبونی كردەوەی دەرەكی دیارو ئاشكرا بەسە بۆ موسوڵمانێتی! ئەمەش شتێك نیە ئیبنوتەیمییەی رەحمەتی هەر بە لایدا چوبێت.. خۆ ئەو مورجیئە نەبوە.. شێخی ئەلبانی لەوەشی تێپەڕاندوە، كە پێی وایە كرداری دڵ بە بێ كرداری دیارو ئاشكرای دەرەكی هەر دەمێنێت، چونكە مەرجی هەبونی یەكتریی نین. ئەمەش بەراستی پێچەوانەی شەرع و

ئـەقڵ و گشت بۆچـونێکی سـەلەفی چـاکی ئـەم ئوممەتەیـەو، بۆچـونی ئیمـامی ئیبنوتەیمییەش دەخاتە کەنارەوە.

ئـەوەی وا دەکـات کەسـێك کـردارو رەفتـاری دەرەکـی ئـەنجام بـدات، بـاوەڕی ناخی دڵ ودەرونێتی. بۆیـە ئیبنوتەیمییـە دەڵـێ: (ئەگـەر دڵ ودەرون بـە بـاوەڕ ئاوەدان و ساغ و چاك بێت، خواناسی و بکەری خێـر بێت، بەڵگەنەویستە، کـە ئەنـدامانی دەرەکـی بـەدەن خێرەومەنـد دەبـن و وەکـو زانایـانی فـەرمودەوانی دەڵێن: هەمو کردارو رەفتارێکی دەرەکی خاوەن باوەڕەکە پـاك و چـاك دەبێـت: دیارو پەنهانی گوفتارو دیارو پەنهانی کردار چاك دەبن.. چونکە دەرەوە سەربە ناوەوەیە، هەر کاتێك ناوەوە پڕ بو لە نوری ئیمـان، حەتمـەن سـیمای دەرەوەش دەبێتە کردەوەی باش.. (مجموع الفتاوی ٧/٥٥٤).

مومکین نیە  دڵ و دەرون بە ئیمان بجۆشێت و ئاسـەوارەکەی بـە کـردەوەی دیـارو ئاشـکرادا دەرنەکـەوێت! چ جـای ئـەوە، کـە بوترێـت ئیمانەکـە لـە ناخـدا کامڵە، با کردەوەش ئەنجام نـەدا، ئەمـەیان هـەر ئەسـتەمە! بۆیـە کەمبونـەوەی کرداری دەرەکی، بەڵگەیە لەسەر زەعیف بون وپوکانـەوەی ئیمـانی نـاخ، ئەگـەر کـردەوە بـە تـەواوی پوکایـەوەو نـەما، دیـارە ئیمانەکـەی نـاخ بـە تـەواوی پوکاوەتەوەو هیچ لێ نەماوەتەوە..

ئیمـامی ئیبنوتەیمییـەی رەحمـەتی هـەر لەوێـدا (مجمـوع الفتـاوی ٧/٥٥٤) دەڵێ: (العملُ الظاهرُ لازِمٌ للعملِ الباطِنِ لا يَنْفَكُّ عَنهُ، وانتِفَـاءُ الظـاهِرِ دَليـلُ انتِفَاءِ البَـاطِنِ) واتـە: کـردەوەی دەرەکـی دیـارو ئاشـکراهۆگری ناخـە، سـەربە باوەڕەو لێی جویێ نابێتەوە، نەمانی کردەوەی دەرەکی بەڵگەی نـەمانی بـاوەڕی ناخـە.. ئەمـە راسـتە، چـونکە هێـزو تـینی کـردەوەی دەرەوەلـە کاریگـەریی ئیمانەوەیـە. ئەگـەر کـردەوەی دەرەکـی نـەما، یـەعنی لـە ناخـدا غـەیری بەراسـتزانین (تصـدیق)ەکە هیچی تێدا نـەماوە، ئـەوەش لای ئـەهلی سـوننەت وجەماعـەت موسـوڵمان بـونی لەسـەر بینـا ناگرێـت... لای ئـەهلی سـوننەت وجەماعەت (بەراست زانینی ناخ) بە بێ کردەوەی دیارو ئاشکرای دەرەکی بەس

نیە بۆ موسوڵمان بون، بۆیە ئەگەر لاف ئەوە لێدات، کەلە ناخی دڵ و دەرونیدا باوەڕی هەیە، بەڵام هیچ کارو گوفتارێك،کە لەوازیمی باوەڕەکەی ناخ ئەنجام نادات، ئەوەلای ئەهلی سوننەت و جەماعەت بە کافر حسێب دەکرێت، چونکە بە ئەنجام نەدانی کرداری دەرەکی دیارو ئاشکراکەی کافر دەبێت..

**هۆی سێیەم:** شێخولئیسلام لە رەت کردنەوەی بۆچونی ئەو کەسانەدا، کە دەڵێن وتنی شایەتمان مەرجی دروستی باوەڕ نیە، پێناسەی باوەڕی بە (تەواوێتی) پەیوەست کردۆتەوە، ئەو لە (مجموع الفتاوی ٧/٣٤٤)دا دەڵێ: (يَمْتَنِعُ أنْ يكونَ إيمانٌ تامٌّ فِي القَلْبِ بِلا قَولٍ وَلا عَمَلٍ ظَاهِرٍ) واتە: شتێکی ناмومکینە باوەڕ بە تەواوێتی لە دڵدا بچەسپێت، بێ ئەوەی لە دەرەوە کردارو گوفتاری ئاشکرای لەگەڵدا هەبێت.. ئایا دوای ئەمە بە پێی دیدی (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەف) و رێسای (حەلەبی) دەشێت بڵێین: وتنی شایەتمان مەرجە بۆ تەواوێتی باوەڕو کامڵبونی، بەلام مەرجی دروستیەکەی نیە؟!!

وەلحاسڵ ئەو دەقەی دووەم، کە (حەلەبی) وەك بەڵگەی خۆی هێنایەوە:

**یەکەم:** تیرێکەو بەر سەری (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان و پاڵانتەوانانی سەلەف) دەکەوێتەوە، چونکە ئیمامی ئیبنوتەیمییە لە بەرپەرچی ئەوانەدا هێنایەوە، کە لاف و گەزاف ئەوە لێدەدەن گوایە باوەڕ بە بێ هەبونی کردارو گوفتاری دەرەکی، لە ناخدا دەچەسپێت!

**دووەم:** قەولەکەی ئیمامی ئیبنوتەیمییە شتی وای تێدا نیە، کە ئەگەر کەسێك مادام لە ناخیدا باوەڕی هێنابێت، با هیچ کردراو رەفتارێکی دەرەکیشی نەبێت، هەر بە موسوڵمان حسێبە! لە چەندین جێی کتێبەکانیدا جەختی زۆر لەمە دەکاتەوەو، زۆر ئاشکراو راشکاوانە باسی دەکات..

**سێیەم:** بۆچونەکەی ئیمامی ئیبنوتەیمییە الحمدللە راستەو، لەگەڵ بۆچونی پێشەوایانی ئەهلی سوننەت وجەماعەتدایە، هەمویان تەرکیزیان

لەسەر ئەوەیە کە: ئەوی وادەکات کەسێك کرداری دەرەکی ئاشکراو دیار ئەنجام بدات، باوەڕی ناخێتی.. ئەوەیش تەنها بە راستگۆدانان نیە..

جێی خۆیەتی پێش ئەوەی ئەم ئاڵقەیەی موناقەشەی (حەلەبی) و (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی) جێ بهێڵین، پرسیارێك بکەین:

بۆچی (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی) رستەیەکی ئیمامی ئیبنوتەیمییەیان کردۆتە بەڵگەو، بەسەر ئەو هەمو دەقە رون و ئاشکرایانەی تریدا باز دەدەن، کە راشکاوانە حوکمی کوفری ئەو کەسە دەدات، کە توخمی کرداری دەرەکی وازلێدەهێنێت؟! خۆ حەتمەن دەیان جار دەقە زەقەکان دەکەوێتە بەرچاویان..

با بە یەك دوو قەولی تری پێشەوایانی ئەم ئوممەتە، ئەم باسەش کۆتایی پێ بهێنین:

حەنبەل دەڵێ: حەمیدی (مامۆستای ئیمامی بوخاری) فەرموی: هەواڵم هەیە، کە کەسانێك هەن دەڵێن: هەر کەس دانی بە فەرزبونی نوێژو زەکات و رۆژوو حەجدا هێنا، بەڵام تا مردنی هیچیانی نەکرد، یان، تا دەمرێت نوێژی پشت لە قیبلە دەکرد، مادام نکوڵی لە خودی باوەڕ نەکات و ئەو فەرزانە بە فەرز بزانێت و، ڕوکردنە قیبلەی پێ فەرز بێت، ئەوە هەر موسوڵمانە.. منیش دەڵێم (حەمیدی دەڵێ):ئەمە کوفرێکی راشکاو ئاشکرایە، ئەمە پێچەوانەی قورئان وسوننەت و بۆچونی زانایانی ئیسلامە. خوای گەورە دەفەرموێ :﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ البینة/٥ واتە: وا فەرمانیان پێدراوە، کە تەنها خوای تاك و تەنها بە نیازپاکییەوە بپەرستن..

حەنبەل دەڵێ: گوێم لە ئەبوعبداللە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بو، کە دەیگوت: (مَنْ قالَ هذا فَقَدْ كَفَرَ باللهِ وَرَدَّ عَلَى اللهِ أمْرَهُ وعَلَى الرَّسولِ مَا جَاءَ بِهِ) واتە: هەر کەسێك وا بڵێت، ئەوە کافربوەو دینەکەی خوای ڕەت کردۆتەوەو

ئەوەی پێ قبوڵ نەبوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە و سلم هێناویەتی .. (ابن تیمیة: الایمان ل ٢٠٨).

سەیر کەن ئیمامی ئیبنوتەیمییە چ نمونەیەك دەهێنێتەوە، کە ئەگەر کەسێك پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە و سلم، باوەڕی پێویستی هێنابێت، شایەتمانی دەربڕیبێت و راستگۆیی پێغەمبەری خوای صلی الله علیە و سلم لە دڵ و دەروندا چەسپابێت، ناخ و دەرەوەی تەسلیم بە دینی خوا کردبێت و هەرچی لەسەر بوە کردویتی[1]، ئەم کەسە کۆچ بکات بۆ مەدینەو لەوێ، کە کردەوەکان فەرز بون، مەبەست لە ئەرکانەکانی تری ئیسلامە: نوێژو زەکات و رۆژوو حەج، ئەم کابرایە لای مورجیئە کۆنەکان و موقەللیدە کونتێکانیان لەسەردەمی ئێمەدا موسوڵمانە، بەڵام لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت وانیە:

ئیبنوتەیمییە دەڵێ: کاتێك خوای پەروەردگار موحەممەدی صلی الله علیە و سلم بە نێرراوێتی خۆی کردە پێغەمبەری هەموان، ئەوەی فەرز بو لەسەر خەڵکی بە راستگۆزانینی بو لە هەرچیەك، کە دەیفەرمو، هەروەها گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ ئەو فەرمانانەی، کە پێی دەسپاردن، ئەو کاتە نەفەرمانی پێنج نوێژەکەی پێ دابون نە گرتنی رۆژووی رەمەزان و نە حەجی ماڵی خوا.. نە شەراب و سو(ربا)ی لێ حەرام کردبون، نە شتی تری لەو جۆرە.. زۆر لە ئەحکامی قورئانیش هێشتا نەهاتبوە خوارێ.. هەر کەسێك لەو کاتەدا باوەڕی بەوەندە قورئانە بهێنایا، کە هاتبوە خوارێ و شایەتمانەکەی بە ئاشکرا بوتایەو ئەو فەرمانانەی جێبەجێ بکردایە، کە خرابوە سەر شانی موسوڵمانان، کابرا بە موسوڵمانێکی باوەڕ تەواو دادەنرا. بەڵام ئەگەر کۆچی بکردایە بۆ مەدینەو، هەر بەوەندەی ئیسلامەکەوە پابەند بوایە ئەو برە باوەڕەی لێ قبوڵ نەدەکرا،

---

١. وەکو شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ووەلاو وبەراو، چونکە نوێژوزەکات ورۆژوو حەج وجیهاد، دوای کۆچکردن بۆ مەدینە فەرز بوون.

كە لە مەككە پێش كۆچكردنی بۆ مەدینە هەیبو، ئەگەر هەر ئەوەندەی بكردایە بە كافر حسێب دەكرا.. (مجموع الفتاوی ٧/٣١٦ ـ٣١٧)

جێی خۆیەتی لێرەوە بە (حەلەبی) و ئەوی (لەسەرویەوەیەتی) و ئەوی (لە خوارویەوەیەتی) بلێین: ئەگەر لە كۆڕا (ئیجماع)ی سەلەفەوە وەرناگرن و فێر نابن، دەی وەرن لە قورئانەكەی خواو سوننەتەكەی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه و سلم وەرگرن و فێر بن، خۆ ئەوەندەیان بەلگە تێدایە، كە دیدی لێڵتان ڕون كەنەوە، ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ: (ففي القرآنِ والسُنَّةِ مِن نَفي الايمانِ عَمَّنْ لَمْ يَأتِ بِالعَمَلِ مواضِعُ كثيرةٌ كما نَفَى فيها الايمانَ عن المنافِقِ) واتە: لەقورئان و سوننەتدا ئەوەندەی باسی بێ باوەڕی ئەو كەسانە تێدایە، كە كردەوەكان ئەنجام نادات، هەر وەكو كە باسی دووڕوەكان دەكات كە بێ باوەڕ دەیانناسێنێت...(ابن تیمیة: الایمان ل ١٤٦).

هەروەها لە جێیەكی تردا (مجموع الفتاوی ٧/٣٧٢) دەڵێ: شتێكی نامومكینە كابرا بە خاوەن باوەڕێكی راست و دروست حسێب بكرێت لە كاتێكدا، كە لە هەمو تەمەنیدا سوجدەیەكی بۆ خوا نەبردوە! ڕۆژووی ڕۆژێكی رەمەزانەكەی نەگرتوە، جارێك زەكاتی سامانی نەداوە، جارێك حەجی نەكردوە، ئەمە مومكین نیە ئیماندار بێت، چونكە هەڵوێست و رەفتاری وا لە دووڕو دەوەشێتەوە، نەك لە موسوڵمان، لە كەسێك دەوەشێتەوە، كە زەندیقەو ناخی بەتاڵە، ئەمە چۆن لەگەڵ باوەڕی راست ودروستدا دەگونجێت؟! نابینیت خوای گەورە ئەو كەسانەی بە كافر داناوە، كە لە قیامەتدا توانای سوجدەبردنەكەیان نامێنێت! وەك دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾﴾القلم/واتە: لە رۆژی قیامەتدا كە خوای پەروەردگار لاقی خۆی نیشان دەدات و موسوڵمانان هەمو سوجدەی بۆ دەبەن، ئەوانەی لە دنیادا دووڕو بون، یان سوجدەیان نەبردوە، لەو ساتە وەختەدا هەمو پشتیان ڕێك و

ڕەق دەوەستێت و ناتوانن بچەمێنەوە، چاوشۆڕو زەلیلانە دەوەستن، ئەمانـە لـە دنیادا ساغ و سـەلیم بـون، پێیـان دەوتـرا سـوجدەیەك بـۆ خـوا ببـەن، نوێـژێك بکەن نەیاندەبرد..

# کۆبەندی دووەم

## بەندی یەکەم

## هەڵسەنگاندنی عەقیدەی مەدخەلی و پاڵانتەوانانی ( سەلەفێتی ) لە ( باب الکفر )دا

## بەندی دووەم

## ڕەواندنەوەی بەڵگەی مەدخەلی و پاڵانتەوانانی ( سەلەفێتی ) لە ( باب الکفر )دا

# باسی یەکەم

## کرداری کوفرینیش هەر وەکو ئیعتیقادی کوفرینە

پێشتر باسی ئەوەمان کرد، کە سەلەفییەکان لە مەسەلەکانی باوەڕدا عەقیدەی مورجیئەیان تێ چوە، واتە لەسەر عەقیدەی مورجیئەن. ئەوەشمان باس کرد، کە هەر کاتێك کە سەلەفییەکان دەڵێن (باوەڕ گوفتارو کردارە) مەبەستیان ئەو پێناسەی ئەهلی سوننەت نییە، کە بۆ باوەڕیان بەو شێوەیە کردوە، کە گوتویانە: توخمی کردار لە پێکهاتەکانی باوەڕە، واتە بەشێکە لە هەبونی باوەڕ و دەبێت هاوڕێشی بێت، چونکە کردار بە باوەڕەوە بەندە، ئەگەر ئەو نەما ئەمیش نامێنێت، ئەگەر ئەمیش نەما ئەویش نامێنێت.. بەڵام سەلەفییەکان مەبەستیان ئاوا نییە، بەڵکو هەر وەکو (مرجئة الفقهاء) بە تایبەتی ئەشعەری و ماتۆریدییەکان دەڵێن: کردار مەرجی تەواوێتی باوەڕە، نەك مەرجی هەبونی، بۆیە بەلایانەوە وایە، کە ئەگەرکردار ئەنجام نەدرا، باوەڕەکە نافەوتێت و هەر دەمێنێت..

ئێستا دێین ئەوە بە بەڵگەی شەرعی دەسەلمێنین، کە سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی لە مەسەلەی تەکفیردا، زۆر مورجیئەترن وەك لە مەسەلەی باوەڕدا، چونکە لەم مەسەلەی تەکفیرەدا، نەك هەر مورجیئەی توندرەون (غلاة المرجئة) بەڵکو کتومت جەهمین، بگرە کەڕە جەهمییەی قەدیمیشیان ناگاتێ!

مەسەلەی تەکفیر بابێکی بەرفراوانەو زۆر کێشەو باس لەخۆ دەگرێت، بەڵام ئێمە لێرەدا یەك باسیمان پێ گرنگە، کە بە شێوەی پرسیار لەو کەڕە

سەلەفیانە دەپرسین و خۆشمان وەڵامەکەیان بە ئەمانەتەوە دەخەینەوە بەردەست، تا هەڵەی هەڵوێستی خۆیان بۆ دەرکەوێت، بەڵکو دیندارانە موراجەعەیەکی خۆیان بکەنەوە:

ئایا هیچ کردەوەیەك هەیە بە کوفرێکی وا بژمێررێت، کە خاوەنەکەی لە میللەتی ئیسلام بباتە دەرەوە، هەر وەکو کە کوفری ئیعتیقاد خاوەنەکەی لە میللەتی ئیسلام دەباتە دەرەوە؟!

خەڵکی لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا بون بە چوار پۆلەوە:

ئەهلی سوننەت، خەواریج، غولاتی مورجیئە(یان کەرە مورجیئە یان جەهمییە)، مورجیئەی شەرعناسان (مرجئة الفقهاء).

### ١ـ ئەهلی سوننەت و جەماعەت:

کە دەڵێن کوفر هەم بە ئیعتیقادە هەم بەکردار.

ئەوی بە ئیعتیقادە، وەکو ئەوەی کەسێك باوەڕی وا بێت، کە خوای گەورە هاوەڵی هەیە، یان خوایەکی تریش لە وێنەو هاوتای ئەو هەیە، یان ئەو کەسەی دەڵێت: من هیچ لەم باسانە حاڵی نابم و لێی نازانم! یان کەسێك باوەڕی بە رۆژی دوایی نەبێت، یان لە ناخی خۆیدا رقی لە خوای گەورە بێت، یان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ببوغزێنێت، یان گومانی لە ئایەتێکی قورئان هەبێت، یان حەدیسێکی سەحیح رەفز کاتەوە، یان بە درۆی بخاتەوە یان باوەڕی بە پێچەوانەی ئەو ئایەت و حەدیسە سەحیحەوە بێت، یان حەڵاڵێك بە حەرام بزانێت، یان حەرامێك بە حەڵاڵ بزانێت، یان باوەڕی وا بێت، کە شەریعەتی ئیسلام بە کەڵکی ئەم سەردەمە نایات، یان باوەڕی وا بێت ئەولیا کارتێکردنی لە گەردون هەیە، دەتوانن بە ویستی خۆیان باران ببارێنن، یان منداڵ بە ئافرەت ببەخشن، یان بێن بە هانای ئەو کەسانەوە، کە هاواریان دەکەنێ.. ئەمانەو ئەوی لەم شێوەیە هەمویان ئیعتیقاداتێکن، کە خاوەنەکانیان هەر بە باوەڕ پێ بونیان لە ناخی دڵ و دەرونی خۆیاندا پێیان

کافر دەبن، یا بە زمان وکردارییەکی واش دەریان نەبڕیبێت، کە کوفریان لێ بوەشێتەوە..

ئەمە ئیعتیقاد، ئەمما کردار، ئەوە ئەهلی سوننەت وجەماعەت دەڵێن: ئەو کردارانەی نەهییان لێ کراوە دوو جۆرن:

**جۆری یەکەم:** ئەو گوناحانەی، کە بکەرەکانیان پێ کافر نابن وەکو دزی و زیناو شەراب خواردنەوە و ئەوانەی، کە شەریعەتی ئیسلام بە کوفری بچوك ناساندونی، کە هەر گوناحی گەورەن، بەڵام خاوەنەکانیان لە میللەتی ئیسلام نابەنە دەرەوە، ئەمەی کە هەندێك پێیان وتوە: کفر دون کفر، واتە کوفرێك، کە لە خوار کوفرەوەیە، یان ناویان ناوە کوفری کردەوەیی یان کوفری بچوك.. ئەمانە بەڵگە لەسەر ئەوە زۆرە، کە خاوەنەکانیان هەر وان لە بازنەی دین و ئوممەتەکەیدا وبە ئەنجامدانیان کافر نەبون، وەکو کوشتاری نێوان موسوڵمانان، یان خۆکوژی، شەرع بە کوفر ناساندونی، یان فەرمویەتی هەرچی وای کرد لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە، بەڵام چونکە بەڵگەی تر بەدەستەوە هەیە، کە بە کوفری بچوك ناسێنراون، بە کوفری گەورەیان حسێب نەکردون.

ئەم جۆرە گوناحەیە، کە ئەهلی سوننەت وجەماعەت گوتویانە ئەگەر کەسێك ئەنجامدانیان بە حەڵاڵ دانەنێت، بشیانکات پێیان کافر نابێت، ئەمەیە پێی دەوترێت (الاستحلال) واتە بە حەڵاڵ زانین.. بۆ نمونە کابرایەك زینایەك دەکات، ئەم گوناحەی لە باوەڕەکەی کەم دەکاتەوە، بەڵام مادام بە حەڵاڵی نەزانیوە پێی کافر نابێت، ئەمما ئەگەر زینای بە حەڵاڵ زانی کافر دەبێت، با نەشیکات.. ئیمامی تەحاوی دەڵێ :(ئێمە کەس لە ئەهلی قیبلە بە گوناح کردن بە کافر دانانێین، تا بە حەڵاڵی نەزانیبێت)[١]..

ئیمامی ئیبنوتەیمییەش دەڵێ: (ئێمە ئەگەر وتمان: ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوە رێکن، کە کەس بە کردنی گوناح بە کافر دانانرێت، مەبەستمان

١ـ ابو جعفر الطحاوي: العقيدة الطحاوية لا ٦٠

گوناحەکانی وەکو زیناو شەراب خواردنەوەیە)[١].

**جۆری دووەم:** ئەو گوناحانەی، کە بکەرەکانیانی پێ کافر دەبن: ئەم جۆرە گوناحانە هەر کردنیان کافر بونیان پێوەیە، خاوەنەکانیان لە بازنەی دین و ئوممەتەکەی دەچنە دەرەوە.. ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر ئەوە کۆن، کە هەر کەسێك یەکێك لەو گوناحانەی کرد لە ناخ و روالّەتیدا بە کافر دەژمێررێت، با هەر لاف ئەوەش لێداو بەهانەی ئەوە بهێنێتەوە، کە لە دڵیدا بە حەلاڵی نەزانیوە، یان مەبەستی کوفر نەبوە، چونکە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی کۆمەڵێك قسەو کرداریان بەو جۆرە گوناحە کافرینە ناساندوە.. بۆیە دەبینیت زۆر لە ئیمامە بەرێزەکان بەشی سەربەخۆیان بە ناوی (أبواب الرِّدَّة) لە کتێبەکانی خۆیاندا بۆ باسی ئەم جۆرە گوناحانە تەرخان کردوە ئەوەشیان رون کردۆتەوە، کە هەر بە ئەنجامدانی حوکمی کافر بونەکە دەکەوێتە سەر بکەرەکەی.. خوا لاماندا

با ئەوەش لامان ڕون بێت، کە ئەوەی لای ئەهلی سوننەت وجەماعەت بەڵگەنەویستە ئەوەیە، کە بۆ حوکمدان و تەئکید لە کافر بونی بکەرێکی ئەم جۆرە گوناحانە چوار مەرج هەیە:

أ ـ مەرجە بکەری گوناحەکە زانیبێتی ئەو قسەیە، یان ئەوکردارە کوفرە.

ب ـ مەرجە کە ئەو گوناحە کافرینەی بە ئەنقەست کردبێت، یەعنی نییەتی کردنی کارە کافرینەکەی هەبوبێت، نەك نییەتی کوفر کردن وبە حەلاڵ زانینی گوناحەکەی لە ناخدا هەبوبێت! نا.. ئەمەیان مەرجێکی بیدعەیەو غەیری کەرە مورجیئەکان کەسی تر بە مەرجی دانەناوە.. لە موناقەشەدا ئاگاداری ئەم پاشقولە بە..

---

١ـ ابن تيمية: الايمان لا ٢٩٤.

جـ . مەرجە، کە گوناحەکە ئەوەندە تێکەڵ نەبێت ئیحتیمالی لێکدانەوەو تەئویل هەڵگرێت، چونکە ئەگەر لەو جۆرە قسەو کردەوانە بو، کە زۆر جۆر تەفسیر هەڵدەگرن، کابرای بکەری پێ کافر ناکرێت..

د . مەرجە کابرای بکەری گوناحەکە سەربەست بێت، نەك ناچار..

بۆ لێك هەڵاوێردنی ئەو دوو جۆر گوناحە، ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ: (باس لەوە کرا کە . بە پێی قورئان و سوننەت . ئەهلی سوننەت وجەماعەت، هیچ کەسێك لە ئەهلی قیبلە بە ئەنجامدانی گوناحێك بە کافر دانانێن و، لە بازنەی دین وئوممەتەکەی ناکەنە دەرەوە، بۆ نمونە بە کردنی زینا، یان دزی، یان شەراب خواردنەوە.. بەو مەرجەی باوەڕی واز لێ نەهێنا بێت، ئەمما ئەگەرکردەوەکەی واز هێنانی فەرمانێکی ئیعتیقادی لە خۆ گرتبو وەکو باوەڕ بە خوا بون، باوەڕ بە فریشتە، باوەڕ بە کتێبە ئاسمانیەکان، باوەڕ بە پێغەمبەران، باوەڕ بە زیندو بونەوەی دوای مردن، ئەوە حەتمەن بەوکرداریەی کافر دەبێ)[١].

هەروەها لە جێیەکی تردا دەڵێ: (بە شێوەیەکی گشتی هەر کەسێك قسەیەکی کوفری کرد، یان کردەوەیەکی کوفری ئەنجامدا پێی کافر دەبێت، با مەبەستی کافر بونیش نەبوبێت، چونکە خۆ کەس راستەو خۆ کارێك ناکات و مەبەستی پێ کافر بونی بێت، مەگەر چۆنها..)[٢]..

ئیمامی ئیبنوحەزم رحمەالله دەڵێ: (ئەوە سەلمێنراوە، کە هەندێك کردار هەن، کە بە ئەندامەکانی لەش ئەنجام دەدرێن وحوکمی کوفریان هەیە، باوەڕی بکەرەکانیان بە شێوەیەکی گشتی هەڵدەتەکێنن، هەندێکی تریش هەن کوفر نین، هەڵاوێردن و جوێ کردنەوەی ئەمانەیان لەوانە دەبێت بە پێی حوکمی خوای گەورە بێت و بەس )[٣].

---

١ ـ ابن تیمیة : مجموع الفتاوی ٢٠ / ٥٣

٢ـ ابن تیمیة : الصارم المسلول لا ١٧٨

٣ ـ ابن حزم : الفصل في الملل والأهواء والنحل ٣ / ٢٢٠

## ٢ـ خەواریج :

ئەمانــە جیــاوازی ناخەنــە نێــوان گونــاحی گــەورەی کــوفرین و گونــاحی سەرپێچی بچوکەوە، هەر کەسێك گوناحێکی گەورەی ئەنجامـدا، یـان بـەردەوام بو لەسەر گوناحی بچوك، بە ڕای ئەمان کافرە، نەك هەر ئەوەش، بەڵکو ئەوەی پێچەوانەی ڕاو بۆچونی ئـەمان بێـت و لـە دەسـتەو تـاقم و پۆلیـان نـەبێت، بـە کافری دەزانن! تەنانەت یەکێکی وەکو نەجدەتی کوڕی عـامر، کـە بیرمەنـدێکی قەدیمییانە دەیوت: (هـەر کـەس نـەزەرێکی کـەم و کـورت بکـات، یـان درۆیـەکی بچوکی لێ دەرکەوێت و بەردەوام بێت لەسەری ئـەوە موشـریکە)[١] بـەڵام ئەگـەر کەسێك لـە تـاقم و دەسـتەو پـۆلی خۆیـان بوایـە، ئەگـەر زیناشـی بکردایـە یـان شەرابیشی بخواردایەتـەوە بـەو مەرجـەی سـور نەبوایـە لەسـەر بـەردەوام بـونی لەسەری، هەر بە موسوڵمانیان دەدایە قەڵەم!

عبداللەی کوڕی یەحیای ئیبازی، کە دەسەڵاتی یەمەنی کەوتە بەردەست، لە وتارێکیدا وتی: (هەر کەس زینا بکات کافرە، هەر کەس دزی بکات کـافرە، هـەر کەس شەراب بخواتەوە کافرە، هەر کەسیش گومانی لە کافرێتی ئەمانـە هـەبێت کافرە)[٢]!

تەنانــەت هەنــدێکیان گەیشــتنە ئــەو ڕادەی، کــە بڵــێن: (ئەگــەر پێشــەوا (خەلیفە)لە خۆراسان یان لە ناوچەیەکی تر بو، زوڵمی لە کەسێك کرد خۆی و ڕەعیەتەکەی لـە هـەر جێیـەکی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا بـن، بـا لـە ئەنـدەلوس و یەمـەنیش بـن بـەو ستەمەی ئـەو کـافر دەبـن (!!) هـەروەها وتویانـە: (ئەگـەر دڵۆپە شەرابێك کەوتبێتە بیرێکەوەو یەکێك لەو ناوەوە تێپەڕ ببێت و لەو بیرە ئاو بخواتەوە ـ گەر زانیبێتی، کە دڵۆپێك شەرابی تێکەتوە ـ کافر دەبێت)[٣] !!

ئــیتر ســەیرەکەی لــە کوێدایــە، کــە ببیســتین و بخوێنینــەوە، کــە خــەواریج نەعوزوبیللا سەیدنا عوسمـانی کـوڕی عـەففان و تەڵحـەی کـوڕی عوبەیدوااللـەو

١ـ البغدادي: الفرق بين الفرق ل ٦٨.
٢ـ سەرچاوەی پێشوو ل ٦٨.
٣ـ ابن حزم: الفصَل في الملل و الاهواء والنحل ب ٤/ ١٩٠.

زوبەیری كوڕی عەوام و دایكە عائیشەو ئینو عەبباس و ئەو بەڕێزانەی تریان بە كافر دادەناو باوەڕیشیان وابو كە بە كافری مردون و لە ئاگری دۆزەخیشدا بە نەمری دەمێننەوە[١].. خوای گەورە لە دیدلێلی و ڕێ وێلی لاماندا ..

**٣ـ توندڕەوانی مورجیئە یان جەهمیەكان ( غلاة المرجئة ):**

ئەسڵ لای ئەمانە ئەوەیە، كە كوفر تەنها لە دڵدایە! بۆیە كەس بە كافر دانانێن، كە كرداری كوفرینیش ئەنجام بدات، تا ئاشكرای نەكات، كە قەناعەتی دڵیشی وایە! ئەمانە بە لایانەوە وایە، كە ئەگەر كابرایەك گوفتارێك، یان كردارێكی وای كرد، كە لە شەرعدا موسوڵمان بە ئەنجامدانی سەربەستانەی و نەبونی بەربەستی شەرعی پێی كافر دەبێت، مادام لە دڵیدا باوەڕی وا نەبێت، كە ئەم ڕەفتارە كوفرینەی پێ ڕاستە كافر نابێت! بۆ نمونە دەڵێن: ئەگەر كەسێك باوەڕی بە ڕاستگۆیی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم هێناو بڕیاریدا، كە ئیسلام هەموی ڕاستە، ئیتر هەرچی شتێك بەكردار بكات، كە كافربونیشی پێوە بێت بەو مەرجەی لە دڵ و دەرونیدا نكوڵی لە قەرزێك نەكات، یان كارێكی كوفرین بە حەڵاڵ نەزانێت پێی كافر نابێت.. چونكە باوەڕ، كە لای ئەمان بەراستگۆ زانینی پێغەمبەرە صلى الله علیه وسلم، كوفریش بەلایانەوە بە درۆ خستنەوەی پێغەمبەرە صلى الله علیه وسلم! لەبەر ئەوەی بە ڕاستگۆ

---

١ـ توندڕەوی كەللەپوتی هەندێك لەم خەواریجانە گەیشتە ڕادەی لەوەش سەیرتر، وەكو ئیمامی ئیبنو تەیمیەی ڕەحمەتی لە مجموع الفتاوى ب ١٩ / ٤١ لێیانەوە نەقڵ دەكات، هەندێكیان پێیان وابو، كە پێغەمبەری نازداریش صلى الله علیه وسلم لێی دەوەشێتەوە ـ پەنا بە خوا ستەم بكات! یان ڕێی لێ تێك چێت و گومڕا ببێت! بۆیە دەیانوت لەو كاتانەدا نابێت ملكەچی بۆ دەربېڕێت و گوێڕایەڵی بكرێت! ئاخر بۆیە ئەم گومڕایانە دەیانوت لە گەیاندنی قورئانەكەدا ڕاستی كردووەو تەواوە، بەڵام لە سونەتەكانی خۆیدا دەشێت بە فەرمایشتی ئەو نەكرێت، چونكە بە گێلی خۆیان دەیانوت : ( زۆر سونەتی ئەو پێچەوانەی قورئانە)!! جا تۆ سەیری ئەم گومڕایی و بێ ئەدەبیە؟! لەو دیدو هەڵوێست و حوكمە سەیرانەی بە هۆی جیاوازی خستنە نێوان قورئان و فەرمودەوە كەوتبوونە ناوی ئەوەبو، كە دەیانوت: (ماسی تا سەر نەبڕێت خواردنی حەرامە)! ڕوانە: ابن حزم : الفصل في الملل و الأهواء والنحل ب ٤/ل ١٨٩) ..

زانين و بە درۆزن زانين هەردوكيان كارێكى ناو دڵن و بە قەناعەتى ناخەوە بەندن، دەبێت كابراى، كەكردارى كوفرينى ئەنجامداوە ئاشكراشى كات، كە لە ناخيشيدا باوەڕى وايە، لەم حاڵەتەشيدا ماناى وايە بە راستگۆ زانينەكەى ناو دڵى نەماوە، بۆيە كافر دەبێت، بەڵام ئەهلى سوننەت دەڵێن: هەر ئەنجامدانى خودى كارە كوفرينەكەى كافرى دەكات، چونكە خواى گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ ﴾التوبة/ ٧٤ واتە وتەى كوفريان لێوە دەرچوەو دواى موسوڵمان بونەكەيان كافر بونەتەوە.. كەوابو هەر وتنى قسە كوفرينەكە هۆكارى كافربونيانە، ئەمەش پەيوەندى بە ناخيانەوە نيە، كە ئايا مەبەستيان كافربون بوە، يان نا.. ئيمامى ئيبنوتەيميە دەربارەى ئەم خاڵەى ئەمانە بو، كە گوى (پێشتر هێنامانەوە بەڵام هەر بۆ تەئكيد): (حەنبەل دەفەرموێ: ( حدثنا الحميدي قال: وأُخبرتُ أنَّ أناسا يقولون: من أقرَّ بالصلاة والزكاة والصوم والحج ولم يفعل من ذلك شيئا حتى يموت، ويصلي مُستدْبِرَ القِبلةِ حتى يموت، فهو مؤمن ما لم يكن جاحدا إذا علم أن تركه ذلك فيه إيمانه اذا كان مقرا بالفرائض واستقبال القبلة. فقلت: ذاك الكفر الصراح وخلاف كتاب الله وسنة رسوله وعلماء المسلمين. قال الله تعالى ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ البينة/٥ قال حنبل (سمعت ابا عبدالله احمد بن حنبل يقول: من قال هذا، فقد كفر بالله ورد على الله أمره وعلى الرسول ما جاء به)[١]واتە: حەميدى (مامۆستايەكى ئيمامى بوخارييە) قسەى بۆ كردين وتى: هەواڵم پێ گەيشتوە، كە هەندێ كەس هەن (مەبەستى مورجيئەكان بو) دەڵێن: هەر كەس دان بەوەدا بنێت، كە نوێژو وەكات و رۆژو حەج فەرزە، بەڵام هيچيشيانى، تا مردن نەكرد، هەروەها تا مردنيشى هەر پشتى لە قيبلە بو (يەعنى ئاڕاستەو روى لەو شوێنە نەبو كە موسوڵمانان

١- ابن تيمية، الايمان ل ٢٠٨.

هەيانە) هەر بە موسوڵمان حسێبە بەو مەرجەى لە ناخى خۆيدا نكوڵى لەو فەرزانە نەكات و باوەڕيشى وا بێت، كە واز هێنانەكەى هەر ئيمانداريية! منيش دەڵێم: (حەميدى دەڵێ: منيش دەڵێم): ئەوە كوفرى راشكاو رونە، ئەوە پێچەوانەى قورئان و سوننەتى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وبۆچونى زانايانى موسوڵمانە. خواى گەورە دەفەرموێ: جەختى ئەوميان لەسەر كراوەتەوە، كە تەنها خواى گەورە بپەرستن و دينداري سەر ڕاستانەش لەبەر خاترى ئەو بكەن.. حەنبەليش دەڵێ: گوێم لە ئەبو عبدالله ئەحمەدى كوڕى حەنبەل بو دەيگوت: هەر كەس وا بڵێت ئەوە كافر دەبێت، ئەوە دينەكەى خواى بۆ خوا رەت كردۆتەوەو ئەوى پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هێناوێتى داوێتيەوە بەسەريدا !!).

بڕوانە پێشەوايانى دين لە زانايان و شەرعناسانى ئەهلى سوننەت، كە ئەمانەيان بە كافر داناوە، هەر لەبەر ئەوەيانە، كە لە بە كافر بوندا كردويانە بە مەرج، كە دەبێت باوەڕى دڵ و قەناعەتى ناخيش (نكوڵى كردنى فەرزێك يان بە حەلاَڵ زانينى حەرام كراوێك)، يان لەگەڵدا بە ئاشكرا لێوە دەربكەوێت! ئينجا ئەو كەسە بە كافر دادەنێن، كە خواو پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم بە كافريان ناسيون! بەڕاستى ئەمەش گومڕاييەكى دژوارە، كە كەسێك ئەوەندە جورئەتى بۆ پەيدا بوبێت فەرمانى خواو پێغەمبەرەكەى صلى الله عليه وسلم ئاوا رەت كاتەوە، جا زۆر بە داخەوە لەم سەردەمەى ئێمەشدا ئاوا كۆمەڵێكى (سەلەفى) ئەو ديدو تێڕوانينە گومڕاييەيان لا بۆتە عەقيدە! خوا بمانگرێتە خۆى..

## ٤ ـ مورجيئەى شەرعناسان ( مرجئة الفقهاء ):

بە لايانەوە وايە، كە هەر كەسێك گوفتارێك، يان كردارێكى كوفرينى لێ دەركەوت كافر دەبێت، نەك بە دەركەوتنى خودى رەفتارەكە (گوفتارەكە بێت

یـان کردەوەکـە) کـە کوفرینـە، بـەڵکو لەبـەر ئـەوەی بەڵگـەو نیشـانەیە، کـە کافربونەکە لە دڵەوەیە! واتە: کردەوەکە بەڵگەیە بۆ بە دڵ بەدرۆ خستنەوەو هەڵوەشـاندنەوەی باوەڕەکـەی نـاخ، کـە لەسـەر بناغـەی بـە راسـت زانـینی پێغەمبەری پێشەوا صلى الله عليه وسلم دامەزرابو..

ئیمـامی ئیبنـو حـەزم رەحمـەتی خـوای لـێ بێـت لـە باسـی ئـەو بۆچـونەی مورجیئەکاندا، کە خودی کارە کوفرینەکەیان پێ بەس نیە بۆ حوکمی بە کافر دانی کـابرای بکـەری، دەڵـێ: (ئەوانـە دەشیانوت: ئەگـەر کەسـێك پـەنا بـە خـوا جنێو بە خوای پەروەردگار بدات و جنێو بـە پێغەمبەرەکـەی صـلى الله عليـه وسلم بدات بە خودی جنێو دانەکە کافر نابێت، بـەڵام جنێوەکـە بەڵگـە دەبێـت بۆ هەبونی کافرێتی لە دڵ و دەرونیدا)[1]!

ئیمـامی ابـن کـثیر رحمەاللـە دەربـارەی بیشـر المريسـی دەڵـێ: (کابرایـەکی مورجیئە بو، گروپی مریسـییەکان بـۆ ئـەم دەگەڕێنـەوە، ئـەم دەیـوت: سـوجدە بردن بۆ رۆژو مانگ کافر ناکەن، بەڵام نیشانەیەکن لەسەر هەبونی کوفرەکە)[2]!

شێخولئیسلام دەڵێ: پێویستە ئەوە بزانرێت، کە ئەوی دەڵێ: (جنێودەر بـە خواو پێغەمبەر صـلى الله عليـه وسـلم لەبـەر ئەوەیـە، کـە جنێودانەکـەی بـە حـەڵاڵ زانیـوە) ئەمـە هەڵـەنگوتنێکی خـراپ و سـەرسمدانێکی دژوارە، ئـەوی کەوتۆتە ئەم سەرسمدانەوە بە هۆی ئەو بۆچونەوەیە، کە مورجیئەکانی نوێ و پێشو وتویانە باوەڕ تـەنها بریتیـە لـە بـە راسـتگۆ زانـین، کـە ئـەویش لـە دڵ و دەروندایە[3] ..

ئێ ئەدی سەلەفیەکانی بـەر سێبەرو مەدخەلیـەکان وپاڵانتـەوانانی سـەلەفی لەسەر چ دیدو پێناسەو هەڵوێستێکن؟!

---

١- ابن حزم : الفصَل في الملل و الاهواء والنحل ب ٣/ ١٩٩

٢- ابن كثير : البداية والنهاية ب ١٠/٢٩٤

٣- ابن تيمية : الصارم المسلول على شاتم الرسول ل ٥١٥.

# باسی دووەم

## كەس لای مەدخەلیەكان وپالاَنتەوانانی سەلەفی كافر نابێتەوە !!

شێخی ئەلبانی رحمەالله دەڵێ: (يَسْتحيلُ أنْ يكونَ الكفـرُ العملـيُّ خُروجَـاً عن المِلَّةِ إلا إذا كان الكفرُ قَدْ انْعَقَدَ في قَلْبِ الكـافِرِ عَمَلَـاً) واتـە: موستەحیلە كوفری كردەوەیی بە چونە دەرەوە لە میللەتی ئیسلام حسێب بكرێت، مەگەر كافربونەكە لە دڵی كافرەكەدا بو بێت بەكردار)[1] ..

هەروەها دەڵێ: (لابُدَّ مِن مَعرفةِ أنَّ الكفرَ ـ كالفِسْقِ والظلْمِ ـ يَنقسِمُ الى قِسمينِ: كفرٌ و فسقٌ و ظلمٌ يُخْرِجُ مِن المِلَّةِ وكُلُّ ذلكَ يعودُ الى الاستِحْلالِ القَلبي، وآخَرُ لا يُخرجُ مِن المِلَّةِ يعودُ الى الاستحلالِ العَمَلِي)[2] واتە: حەتمەن دەبێ ئەوە بزانرێت، كە كوفر ـ وەكو فیسق و زوڵم ـ دەبێت بە دوو بەشەوە: كوفرو فیسق و زوڵمێك، كە خاوەنەكانیان لە میللەت دەباتە دەرەوە، بەلاَم هەمو ئەوانەش دەگەرێنەوە بۆ لە دڵدا بە حەلاَڵ زانینیان، دووەم بەشیان لە میللەت نابەنە دەرەوە، كە دەگەرێنەوە بۆ بەكردار بە حەلاَڵ زانینیان..

لە شوێنێكی تریشدا دەڵێ: (لكننا نُفَرِّقُ بينَ الكفرِ المَقصودِ قَلباً وبينَ الكفـرِ الذي لَمْ يُقْصَدْ قَلباً، وإنَّمَا قالِبَاً وفِعْلَـاً)[3] واتـە: بەلاَم ئێمە جیاوازی دەخەینە نێوان ئەو كوفرەی لە دڵەوە بە مەبەست دەربڕراوەو، ئەو كوفرەی ویستی دڵی لەگەڵ نەبوە، كە دەربڕراوە، بەڵكو هەر بە بەدەن وكردار دەربڕراوە..

---

١ـ كاسێتی (الكفر كفران) تەسجیلاتی بیت المقدس/عەممان ـ ئەردەن.

٢ـ الألباني: التحذير من فتنة التكفير ل ٧٠ ..

٣ـ هەر كاسێتی ( الكفر كفران ) تەسجیلاتی بیت المقدس / عەممان ـ ئەردەن

هەروەها روەو ڕوی سامیش لەو شریتی الكفر و كفرانەی عەممانیانـدا دەڵێ: (أنت بارك الله فيك هل انتبهت سابقا أو لاحقا في هذه الجلسة أن الكفر الاكبر عملٌ قلبيٌ وليس عملا بَدنيا ؟) واتە: تۆ خوا بەرەكەتت بهاوێتێ، پێشتر، یان دواتر لەم دانیشتنەدا تێبینی ئەومت كرد، كە كوفری گەورە كرداری دڵە، نەك كرداری بەدەنی؟!

دیسان هەر لەو شریتەدا دەفەرموێتەوە: (المسلمُ إذا صُدِرَ منـهُ كُفرٌ عَمَلِي وإبضاً مُقْتَرِنٌ مَعَهُ كُفْرٌ إعتقاديٌّ كَكُفْرِ الكافرِ هو كُفْرٌ لا إشكالَ فيه، إمَّا إذا لَمْ يَخْرُجْ منهُ مَا يَدُلُّ علَى أنَّهُ قَدْ اقتَرَنَ بالكُفْرِ العمَليِّ كُفْرٌ إعتقاديٌّ، حِينَئِـذٍ لا يكونَ كُفراً إعتقاديًّاً، لأن الكفرَ الإعتقادي يَختلفُ عن الكفرِ العَمَلِي من حيثُ أنَّهُ كُفرٌ قَلْبِيٌّ ـ أما الكفرُ العَمَلي ليسَ كُفْراً قَلبياً وإنَّمَا هو كُفرٌ عمَليٌّ) واتە: ئەو موسڵمانەی كوفرێكی كردەوەیی لێوە دەردەكەوێت، كە هاوڕێ لەگەڵ كافربونێكی ناخ (ئیعتیقادو باوەڕی دڵ) دا بو، ئەوە وەكو كوفری كافرێك كافربونەو ئیشكالێكی تێدا نیە، بەڵام ئەگەر شتێكی وای لێوە دەرنەكەوت كە بیسەلێنێت، كە لەگەڵ كوفرە عەمەلیەكەیدا كوفرێكی ئیعتیقادی (ناخی دڵیشی) لەگەڵدایە، ئەوە نابێتە كوفری ئیعتیقادی، چونكە كوفری ئیعتیقادی لەو روەوە لە كوفری عەمەلی (كردەوەوە) جیاوازە كە كافربونێكی ناخی دڵ و دەرونە، بەڵام كوفری كردەوەیی كوفری دڵ و دەرون نیە، هەر كوفری كردەوەیە..

شێخی ئەلبانی لە شوێنێكی تری هەمان كاسێتدا ئەوە دوپات دەكاتەوە، كە دەڵێ: (التَّفريقُ بينَ كُفرٍ و كُفرٍ هو أنْ نَنظرَ في القَلْبِ، فإنْ كانَ القلبُ مُؤمِنَاً والعَمَلُ كافِرَاً فَهُنَا يَتَغَلَّبُ الحُكْمُ المُسْتَقَرُّ في القَلْبِ عَلَى الحُكْمِ المُسْتَقَرِّ في العَمَلِ) واتە: بۆ جیاوازی نێوان كوفرێك و كوفرێكی دی دەبێ بڕوانینە دڵ! ئەگەر دڵەكە موسوڵمان بو، بەڵام كردەوەكە كافرانە بو ئەوا حوكمی دڵە موسوڵمانەكە زاڵ دەبێت بەسەر حوكمی كردەوەكەدا..

شێخی ئەلبانی رحمەاللە لە جێی تریشدا جەخت لەم دیدو بۆچونە

دەكاتەوە، وەكو لە شەرحی عەقیدەی تەحاویدا دەڵێ: ( إنَّ الذنبَ أي ذَنْب كانَ هو كُفْرٌ عَمَلي لا إعتقـادي)[1] واتـە: گونـاح، هـەر گوناحێك بێت، هـەر كوفری كردەوەیە، نەك كوفری عەقیدەو باوەڕ.. كە دەفەرموێ كوفری كـردەوە دیـارە، مەبەستی ئەو گوناحانەیە، كە شەریعەتی ئیسلام بە كوفری ناساندون، چونكە ئاوا قسەكە لەگەڵ رەوتی باسەكە دا یەك دەگرێتـەوە، چونكە شێخ بـە حـەڵاڵ زانـینی كـوفر لـە دڵـدا بـە كـافر بـون دەزانـێ، نـەك هـەر كـوفر ئەنجامـدانێك بەكردار، با وا نەزانرێت، كە شێخ مەبەستی هەمو گوناحێكە، كە كوفرە..

لە كاتی موناقەشە كردنـی شـێخ ئەلبانیـدا لەگـەڵ یـەكێك لـە قوتابیـەكانی خـۆی، كـە العەنبەرییـە، هـەر ئـەو قسـەیەی دەكاتـەوە تـەوەری هـەمو بـاس و خواسەكانی، كە باوەڕ بریتیـە لـە تەسدیق واتـە بـە راستگۆ زانـینی پێغەمبـەر صلی اللە علیه وسلم ئـەو كوفرەی، كـە بـە كـوفری بـەدەر لـە میللـەتی ئیسلام حسـێب دەكرێـت ئەوەیـە، كـە ئـەو بـە راسـتگۆ زانینیـەی دڵ و دەرونـی نەهێشـتۆتەوە، یـەعنی بـە درۆ خسـتنەوە (كـوفری تـەكزیب)[2]. جـا سـەیرێتی شـێخی ئـەلبانی لەوەدایـە، كـە هـەر ئـەو ئایەتـەی مورجیئـە كۆنـەكان دەیانهێنایـەوە بـۆ بەڵگـەی ڕاسـت و دروسـتی راو بۆچـون و هەڵوێسـتی خۆیـان، ئـەمیش هـەمان ئایـەت دەهێنێتـەوە.. لـەویش سـەیرتر هەڵوێسـت گـۆڕینی قوتابیەكەیەتی، كە لەبـەر خـاترو خـۆتری شـێخەكەی هەڵوێستە شـەرعیەكەی یەكەمی خۆی بۆ رای ئەلبانی دەگۆڕێت، تا پێچەوانەی نەبێتەوە!!

شێخی ئەلبانی دەڵێ: (إنَّ تكفيرَ المُوَحِّد بِعَمَلٍ يَصْدُرُ منْـهُ غَـيرُ جـائِزٍ، حَتَّـى يَتَبَـيَّنَ مِنْـهُ أنَّـهُ جَاحِـدَ ولَـو لِـبَعضِ مَـا شَـرَعَ اللهُ)[3] واتـە: بـە كـافر دانـانی یەكخواپەرسـتێك لەبـەر ئـەوەی كردەوەیـەكی لێـوە دەركـەوتوە (بـێ گومـان

[1] ـ الألباني: العقيدة الطحاوية (بە شەرحی خۆی) لا ٦٠.

[2] ـ الألباني: حكم تارك الصلاة لا ٦١.

[3] ـ ئەلبانی: شريتي التحرير لأصول التكفير/ سلسلة الهدى والنور ١/٨٥٥.

مەبەستی گوناحێكە، كە كردبێتی) جائیز نیە، تا ئەوەی، كە دەردەكەوێت، كە نكوڵی كردوە (مەبەستی ئەوەیە كە كوفری تەكزیبی لێ دەركەوتوە) با ئەو نكوڵی كردنەشی لە هەندێك لەوانە بێت، كە خوای گەورە دایناون..

شەقرەی قوتابیشی دەڵێ: (إنَّ المرءَ إذا نطقَ بالشهادةِ وصدَّقَ بها قلبُهُ واعتقَدَهَا جَازِماً، وآمَنَ بِحَقِهَا كُلِّه، فهو مُؤمِنٌ، وإنْ اجْتَرَحَ المعاصيَ كُلَّهَا، مَا ظَهَرَ منهَا وَمَا بَطَنَ، مَا لَمْ يُصَاحِبْهَا جُحُودٌ أو نُكْرانٌ لِمَا هو مَعلومٌ مِن الدِّينِ بالضَرورةِ )[1] واتە: كەسێك كە شایەتمانی هێناو بە دڵ باوەڕی پێ هێناو قەناعەتی بە ماف و ئەركەكانی كرد، ئیتر ئەوە موسوڵمانە، با هەرچی گوناحیش هەیە بیكات، ئەوی دەركەوتوەو ئەوی دەرنەكەوتوە، مادام شتێك لە دین رەت نەكاتەوە، یان نكوڵی لە شتێك نەكات، كە بە بنەمای دینەكە ناسراوە..

ئەو مەرج دانانی نكوڵی كردنەی، كە بریتیە لە بە درۆ خستنەوە بە زمان، هەروەها ئینكار كردنەكەش، كە هەر جۆرێكی ترە لە بە درۆ خستنەوە، كە شێخی ئەلبانی باسیان لێوە دەكات، وا دیارە هی ئەوەیە، كە باوەڕی وایە، كە كوفری گەورە كە خاوەنەكەی لە میللەتی ئیسلام دەباتە دەرەوە هەر بە درۆ خستنەوەیە، هەر لەبەر ئەوەشە، كە دەبینیت عەلیل حەلەبی لە نوسینی پێشەكی ئەو كتێبەی ئەلبانیدا (التحذير من فتنة التكفير) زۆری تین داوەتە خۆی و، خۆی ماندو كردوە، تا كۆمەڵێك ئەقوالی وا بهێنێتەوە، كە دیدو بۆچونەكەی خۆی و شێخی ئەلبانی پێ سەرخات، تا بە زۆریش بێت خوێنەرانیان بخاتە سەر ئەو رایەی، كە گوایە هەر هەمو جۆرەكانی كوفری گەورە دەگەڕێنەوە بۆ بازنەی نكوڵی كردن بە درۆ خستنەوە (الجحود و التكذيب)، چونكە لای ئەمانە كەس لە ئیسلام ناچێتە دەرەوە، تا نكوڵی لە فەرمانێكی شەرعی نەكات وبە درۆی نەخاتەوە! یان گوێ نەدان و پێچەوانە

---

١ـ محمد ابراهيم شقرة : هي السلفية لا ١٢٢.

رەفتار کردنی بەرهەڵستی (نەهی) یەکی شەرعی بکات و لە ناخی خۆشیدا پڕ بە دڵ بە حەڵاڵی بزانێت !!

لەم راوبۆچونەوەیە کە خەڵکی لەوە دڵنیا بون، کە سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی وەکو مورجیئەی شەرعناسانی کۆن (مرجئة الفقاء) پێیان وایە کە کردارە کوفرینەکان، کە کوفری گەورەشن خۆیان لە خۆیاندا نابنە هۆکاری بە کافر دانانی کەسێك، بەڵکو بەوە دەبنە بەڵگەی کافر بون، کە نیشانەی ئەوەن، کە کابرا لە ناخیدا باوەڕی نیەو کافرە، یەعنی کاتێك کردارێکی کوفری گەورە لە کەسێکەوە دەردەکەوێت و هیچی لێ نافامرێتەوە، جگە لە کافر بون، دەشێت حوکمی کافر بون کابرای بکەری بگرێتەوە، بەڵام نەك لەبەر ئەوەی کارەکەی کوفرێکی گەورەیەو لە میللەتی دەکاتە دەرەوە، بەڵکە لەبەر ئەوەی ئەوە دەسەلمێنێت، کە کابرا لە دڵ و دەرونیدا شەریعەتکەی بە درۆ خستۆتەوە، یان ئەو بەرهەڵستە شەرعیەی پێ حەڵاڵ بوە.. ئەمەش دەقاو دەق بۆچونی مورجیئەی شەرعناسانی پێشوە.. کە ئیمامی ئیبنو حەزم دەربارەی ئەو جۆرە زانایانەی، کە کرداری کوفرین بە کافر بون دانانێن، تا نکوڵی کردنی دڵ ودەرونیشی لەگەڵدا نەبێت! دەڵێ: (خَشُوا مُبادَرةَ جميع أهلِ الإسلامِ لهم، فقالوا لكنَّه دليلٌ على أنَّ في قَلْبِه كُفْرًا)[١] کە لەوە ترسان خەڵکی ئیسلام لێیان ڕاپەڕێت، وتیان: ئەنجامدانی ئەو کارە کوفرینە بەڵگەیە لەسەر جێگیر بونی کوفر لە دڵ و دەرونی خاوەنەکەیدا! وا دیارە سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی ئەمڕۆش، لە پێش هەمویانەوە شێخی ئەلبانی رەحمەتی، کە زانیان بۆچونەکەیان پێچەوانەی بۆچونی ئەهلی سوننەتە، کە دەڵێن خودی ئەنجامدانی کاری کوفرین لە کاتی نەبونی بەربەستی شەرعیدا کافربونی خاوەنەکەی دەکەوێتە سەر، بۆیە ئەمانیش وەکو پێشینە کۆنەکانی مورجیئەکانیان دەڵێن: کابرا بە هەرچی کردەوەیەکی ناشەرعی، کە ئەنجامی

---

١ـ ابن حزم : الفصل في الملل والأهواء و النحل ٢٠٦/٢ ...

دەدات، بەکردنی هەمو گوناحی دیارو نادیار کافر نابێت، بەڵام ئەو کوفرانەی دەبنە نیشانەی هەبونی ویستی کوفر لە ناخیدا!! ئەوەتا شێخی ئەلبانی رەحمەتی جەخت لەم بۆچونە پێچەوانەی خۆیان دەکاتەوەو دەڵێ: (هذا العملُ يكونُ دالّاً علَى مَا في القلبِ من الكفرِ، لماذا هذا العملُ كانَ كفراً ؟ لأنَّـهُ دالٌّ عَلَى مَا فِي القلبِ من الكُفْرِ)[١] واتە: ئەم کردەوەیە نیشانەی ئەو کوفرەیە، کە لە دڵدا هەیە، بۆچی ئەم کردەوەیە بە کوفر حسێبە؟ چونکە بەڵگەی هەبونی کوفرە لە دڵدا..

هەروەها لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: (ومِنْ الأعمالِ قَدْ يُكْفَرُ بِها صاحِبُها إعْتقاداً، لأنَّها تَدُلُّ على كُفْرِه دِلالَةً قَطعيَّةً يَقينيَّةً، بحيثُ يَقومُ فِعْلُهُ هذا مَقَامَ إعْرَابِه بِلِسانِهِ عنْ كُفْرِه، كَمَثَلِ مَنْ يَدُوسُ المصْحَفَ مَع عِلمِـه بِـه وقَصْـدِه لَـهُ)[٢] واتە:کرداری وا هەیە، کە لەوانەیە حوکمی کافربونی خاوەنەکەی لە روی عەقیدەو باوەڕەوە بگرێتەوە، چونکە دەبێتە بەڵگەیەکی بنبڕی گومان هەڵنەگرو نیشانەی رۆشنی کافر بونی، بە شێوەیەکی وایە کە جێی ئەوە دەگرێتەوە کە کابرا بە زمانی ئەو کوفرە راگەێنێت، وەکو ئەو کەسەی قورئان بخاتە ژێر پێ لە کاتێکدا زانیاری بە کارەکەی هەیەو مەبەستیشیەتی وا بکات..

سەیری کە دەڵێ لەوانەیە!! ئەم نمونە زەقەش دەهێنێتەوە، کە زانایانی سەلەف و تەنانەت خەلەفیش لەسەر ئەوە رێکەوتون، کە هەر کەس قورئان فرێداتە نەجاسەتەوە بە فرێدانەکە کافر دەبێت، کەچی ئەم دەیەوێت بۆی تێدا بهێڵێتەوە! ئەم و سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی تریش دەیانەوێت ئەوە بە خەڵکی بسەلمێنن، کە تەنانەت ئەگەر ئەو کارە تاوانکارییە بۆ خۆی نابێتە کافربونی کابرا، تا باوەڕی دڵ و دەرونیشی لەگەڵدا نەبێت! بەڵام حوکمی کافر بون دەیگرێتەوە، چونکە کارەکەی لە کاری

---

١ـ الالباني : شريتي التحرير لأصول التكفير / سلسلة الهدى و النور ١/٨٥٥ ..

٢ـ الألباني : التحذير من فتنة التكفير لا ٧٢ ..

کافران دەچێت و نیشانەی هەبونی ویستی کافرێتیە لە ناخیدا، نەك کارەکە خۆی کافر بون بوبێت، ئەویش بە خودی ئەنجامدانەکەی کافر بو بێت!! ئەمەش یەعنی، ئەگەر کابرا دەیزانی ئەمە قورئانی پیرۆزەو بە ئەنقەستیش خستیە ژێر پێی و وتی مەبەستی ناخی دڵم سوکایەتی کردنە بە قورئان و کافربونمە ئینجا حوکمی کافر بون دەیگرێتەوە!! یەعنی ئەگەر وتی مەبەستم کافربونم نیەو، ئەم کارەشم پێ جائیز نیە پێی کافر نابێت!!! دواتر دێینەوە سەر ئەم نمونەیان و راو بۆچونیان زیاتر شی دەکەینەوە..

جیاوازی ئەم راو بۆچونەو راو بۆچونی ئەهلی سوننەت ئەوەیە، کە ئەهلی سوننەت گوتویانە کە ئەگەر زانیاری بەوە هەبو کە ئەوە قورئانەو وای لێ دەکات پێی کافر دەبێت، بەڵام سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان و پاڵانتەوانانی سەلەفی ئەم زەمانە، وەکو جەهمیەکانی کۆن دەڵێن: (کافربون لە دڵدا) مەرجە بۆ دەرکردنی حوکمی کوفر لەسەر بکەری کاری وا ناڕەوا، ئەگەر ئەم مەرجەی دڵ نەبو، کابرا لە حەقیقەتدا کافر نابێت ![1]

کە ئەم خاڵانەمان لا ڕون بۆوە، دەزانین جیاوازی راو بۆچونی ئەهلی سوننەت و سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان و پاڵانتەوانانی سەلەفی ئەم سەردەمە چین، پێشەواو چاوساغانی هەر هەمو ئەم سەلەفیانە ئەمە بۆچونیانەو لەکەسی ناشارنەوە، چونکە ئیعتیقادی تەواویان هەیە، کە ڕای سەلەفیان گرتوە!! لە کاتێکدا ناشوێرن زۆر توێژینەوە لەسەر بابەتەکان بکەن نەبادا بگەنە حەقیقەتی بۆچونی سەلەف و ناچار بین لەسەر دیدی رەسەن ئەوان برۆن!! چونکە هەست بە خەتەریاتی هەڵوێست دەکەن، کە لەسەر ئەو راو بۆچونە رەسەنەی ئەهلی سوننەت دەگیرێتە بەر، کە ناساندنی کافرە بە کافرێتی و ناساندنی موسوڵمانە بە موسوڵمانێتی خۆی..

شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە یەکێك لە شریتەکانیدا لێی دەپرسن: (ئایا

١ـ ئەوەش بزانین کە جەهمیەکان دەیانوت لەگەڵ ئەوەشدا، کە بە حەقیقەت کابرا کافر نەبوە، بەڵام حوکمی کافربوونیان لە دنیادا بەسەردا دەدا، بەڵام پاڵانتەوانانی سەلەفی ئەم سەردەمە حوکمی کافر بوونی نە لە دنیاداو نە لە ئاخیرەتدا نادەن! !

کافر بون تەنها لە دڵ و دەروندایە؟ یان دەشێت لە دڵ و زمان وکرداریشدا دەرکەوێت؟ بە شێوەیەکی تر بپرسین: ئایا کافر بون، هەر بە ئیعتیقادە، یان بە ئیعتیقادو زمان وکرداریشە؟). شێخ لە وەڵامیدا گوتی: (ئەوەی من لەم باسەدا لێی تێ دەگەم[1] ئەوەیە، کە کافر بون هەر بە دڵە، بەڵام گوفتاری کرداری واش هەن کە لەوانەیە لە کەسێکەوە دەرچن، کە ببێتە نیشانەی کوفرێك کە کەوتۆتە دڵیەوە، بەڵام ئێمە نابینین ئەوە پێویست بێت، کە ئەو کوفرەی لە دڵیدا هەیە ببەستینەوە بە یەکێك لەو کردەوانەی لێوەی دەردەکەون، چونکە لەوانەیە پەیوەندیان پێکەوە هەبێت و لەوانەشە پەیوەندیان پێکەوە نەبێت، بەو مانایەی کە وەکو دووڕویەك وایە، کە ئەو کوفرەی لە دڵیدایەو ئەو کوفرەی لێوەی دەردەکەوێت، مەرج نیە پەیوەندیان پێکەوە هەبێت، چونکە مونافیق بەکرداری زاهیریی موسوڵمانە، قورئانیش رۆشن باسی ئەعرابی بەم شێوەیە کردوە .. من ئەوەی بۆم رون بۆتەوە ئەوەیە، کە ئاسانکاری لەم حوکمەدا زەروریە، دەبێ بسازێنرێن، ئایا کوفر بە دڵ و زمانە؟! بەڵێ، لەوانەیە ببێت، بەڵام ئەسڵ ئەوەیە کە کافربون لە دڵدایە)[2] .

شێخی ئەلبانی رەحمەتی بە رۆشنیەکی وا راوبۆچونی خۆی دەردەبڕێت، کە ئاڵۆزی تێدا نیە، ئەوبە یەقینەوە، زۆر بە راشکاوانە دەڵێ:

ا- ئەو کردەوانەی، کە شەرع خستونیەتیە خانەی کوفری گەورەوەو بکەرەکانیان لە بازنەی ئیسلام و ئوممەتەکەی دەباتە دەرەوە، بەڵێ هەر وایە، بەڵام ئەوە لەبەر ئەوەی، کە بەڵگەو نیشانەی هەبونی کوفرە لە دڵ و دەروندا، نەك لەبەر ئەوە بێت کەکردەوەکان خۆیان کوفرینن..

---

١- بۆ کەسێکی وەك ئەو سەیرە وا بڵێت! چونکە دەبێ بڵێت : ئەوەی ئەهلی سوننەت لەسەر نی، ئەوەیەو ئەوەیە نەك ئاوا کابرای پرسیار کەر بخاتە سەر نەزانینێکی تر تا بیخاتە دووی خۆی!

٢- الالباني: شريتى التحرير لأصول التكفير / سلسلة الهدى و النور ٨٥٥/١ ..

ب ـ ئەم کردەوانە ئەگەر کوفری ناخی دڵ و دەرونیان لەگەڵدا نەبێت (واتە مەبەستی کافر بون نەبێت) نابنە کوفرێك (کافر بونێك)، کە بکەرەکانیان لە ئیسلام و ئوممەتەکەی ببەنە دەرەوە، چونکە لەوانەیە ئەم کردارە کوفرینانە لەگەڵ کوفری ناخی دڵ و دەرونیدا یەك کەوتبن هەر وەکو، کە دەشێت پێکەوە نەبن[1] ئەگەر پێکەوە بون ئەوە کوفری گەورەن، ئەگەر پێکەوە نەبون ئەوە کوفری گەورە نابن! بۆیە لەوانەیە کەسێك لای شێخی ئەلبانی لە زاهریدا کافر بێت (بە ئەنجامدانی کردارێکی کوفرینی) بەڵام لە ناخیدا هەر موسوڵمانە، یەعنی لە حەقیقەتیدا هەر موسوڵمان ماوە (چونکە لە دڵ و دەونی خۆیدا مەبەستی کافر بون نەبوە).. دەی سا ئەمەش دەقاودەق باوەڕو قەناعەت و پێناسەو بۆچونی جەهمی کوڕی سەفوان و سالحیيە کە ان شاوالله دواتر دێمەوەسەر ئەم بڕگەیە[2] ..

---

۱ـ ئەلبانی: شریتي التحریر لاصول التکفیر، زنجیرەی الهدي والنور ذمارة ۱/۸۵۵

۲ـ (سەرنجێك : بەڵام ئێستا پێویستە ئەوە رون کەمەوە، کە بەراستی ئەم پێوەرەی شێخ، کە لەسەر ئەو دووڕووە دەیکات، کە لە زاهیریدا موسوڵمانەو لە ناخیدا کافرە ! ئەمەش پێوانێکی لاسەنگ و سەقەتەو حوکمێکی باتڵە، چونکە خەڵکی لە دیدی ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە سێ پۆلن و نابن بە چوار : (موسوڵمان، دووڕوو، کافر ) دووڕوو ئەو کەسەیە، کە لە زاهیریا ئیسلامی وەرگرتووەو موسوڵمانە، بەڵام لە ناخی خۆیدا کافرە، کافریش ئەو کەسەیە، کە لە زاهیرو ناخیدا کافرەو باوەڕی نیە .. ( بڕوانە ئیبنو تەیمیە / مجموع الفتاوی ۲۹۰/۷) ئەمما پۆلی چوارەم ئەوە هەر بوونی نیە ! مەگەر لای جەهمیەکان و ئەوانەی لەسەر بیردۆزی ئەوان دەڕۆن ..

ئەبو سولەیمان الخەتتابی دەڵێ: دەشێت کابرا لە زاهیریدا تەسلیم بە دینەکە بوویێت و وەری گرتبێت، بەڵام لە ناخیدا خۆی پێ تەسلیم نەکات و باوەڕی پێی نەبێت، بەڵام هەرگیز ناشێ کابرا لە ناخیدا راستگۆ بێت و باوەڕی هەبێت بەڵام لە زاهیریدا خۆ بە دینەکەوە پابەند نەکات.. ( البغوی: شرح السنة ۱۱/۱ ) ..

دەبێ ئەوە بزانین، کە هەر کەسێك بە کردەوەیەکی ئاشکرای کوفرین کوفری لێوە دەرکەوت، ئەوە لای جەهمیەکان و هاوبیرانیان بە پێی کردەوە زاهیرییەکەی (بە کردەوە) کافرە، بەڵام لە ناخیدا (بە حەقیقەت) موسوڵمانە ! ! بەڵام لای ئەهلی سوننەت وجەماعەت لە زاهیرو ناخیدا کافر بووە.. ئەگەر کابرایەك بڵێ: سەیدنا عیسا خوایە، ئینجا نکوڵی لە هەموو ئیسلام کرد، پاشان ووتی: دڵم لەسەر هیچ شتێك نیە لەمەی ووتم و باوەڕم پێی نیە، هەر بە کافر حسێبە، نەك بە موسوڵمان.. (ئیبنو تەیمیە : الایمان ل ۳۷٤) ..

**شێخی ئەلبانی لە جێیەکی تردا دەڵێ: وەکو کە لە هەندێك پرسیاردا هاتوە، ئەگەر کەسێك جنێوی بە پێغەمبەر علیە السلام دا ئەوە داوای تۆبەی لێ دەکرێت (!) ئەگەر تۆبەی کرد ئەوە باشە، ئەگەرنا ئەوە دەکوژرێت، بەڵام ئەگەر دەسبەجێ ئەستەغفیروللەی کرد و پەشیمان بۆوە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە مەبەست و ئەنقەست ئەو کوفرەی نەکردوە[١]..**

**ئەوەی دەبێ لەسەری بوەستین ئەو قسەیەتی، کە دەڵێ: (ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە مەبەست و ئەنقەست ئەو کوفرەی نەکردوە) ئەمەش یەعنی هەر کەسێك جنێو بە پێغەمبەری رێزدار بدات (علیە السلام)، ئەگەر لە ناخی دڵ و دەرونیدا مەبەستی ئەوە بوبێت، کە سوکایەتی بکات و کافر ببێت، کافر دەبێت! دەنا ئەگەر جنێوەکەی داو مەبەستی ئەوە نەبو لە ناخی خۆیدا کافر ببێت، ئەوە هیچی لەسەر نیە!**

**بەڕاستی ئەمە هەر ئەو ئیرجائەی قەدیمەو هیچی لێ زیاتر نیە! ئەم قسەیە هەر ئەوەیە، کە کەسێکی وەکو جەهمی کوڕی سەفوان نەیدەتوانی بیڵێت! چونکە ئاشکرایە، کە ئەحکامی شەرع لە دنیادا ئەو کەسانە دەگرێتەوە، کە بە ئاشکرا کوفرێکیان لێ دەرکەوتوە، بێ ئەوەی تەماشای ناخی بکرێت..**

---

هەروەها شێخول ئیسلام ئیبنوتەیمیە دەڵێ: ئێمە دەزانین، کە هەر کەسێك سەربەستانە، بێ ئەوەی ناچار کرابێت جنێوی بە خواو بە پێغەمبەرەکەی دا یان کەسێك سەربەستانە ووشەی کوفری بە دەمدا هات بێ ئەوەی ناچار کرابێت، یان هەرکەسێك گاڵتەی بەخواو ئایەتی قورئان و پێغەمبەری خوا کرد، حوکمی زاهیرو ناخی کافر بوونە، ئەمما ئەو کەسەی، کە دەڵێ: لەوانەیە ئەو کەسەی ئەمانە دەڵێت، یان دەکات لەوانەیە هەر بە زاهیریی کافر بێت و لە ناخی دڵ و دەرونیدا موسوڵمان بێت، ئەوە قسەیەکی نابەجێی کردووەو پێچەوانەی بەڵگەنەوویستەکانی دینی ووتووە (مجموع الفتاوی٧/٣٤١ دواتریش راوبۆچوونی پێشەوایانی دیکە دێنینەوە ان شاء الله)..

١ـ الالباني: شریتی الکفر کفران/ تسجیلات بیت المقدس/ عمان ـ الاردن ..

سەرنجێك لەوەی کە دەفەرموێ: داوای تۆبەی لێدەکرێت، ئەمە پێچەوانەی کۆڕا (ئیجماع) ی زانایانە وەکو کە شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە لە کتێبی (الصارم المسلول) دا روونی کردۆتەوە، ئەمما کە دەفەرموێ: ئەستەغفیروللەی کرد و پەشیمان بۆوە، ئەمە مەنعی ئەوەی ناکات کە پێشتر کوفری کردووەو کافریش بووە مەگەر لای مورجیئەکان هەر بە موسوڵمانی مابێت ..

بەلاَم (سەلەفی)ەكان ئەمەیان بە لاوە كا و بایە، جا ئەگەر كەسێك كوفری لێ دەركەوت پێی كافر نەبێت، كەس جێی گلەیی نامێنێت، چ جای حوكمی سزای مورتەددا!!

ئەوە رونە، كە سەلەفیەكانی بەر سێبەرو مەدخەلیەكان وپالاَنتەوانانی سەلەفی، كە دەلَێن: (ئەگەر لە ناخی دلّ و دەرونیدا باوەڕی وا نەبو، یان مەبەستی نەبو) مەبەستیان لە هەمو ئەمانە ئەوەیە، كە ئەگەر بە ئەنقەست خۆی كافر نەكرد!! یەعنی، ئەگەر لە ناخی خۆیدا ئەو كارەی بە حەلاَلّ نەدەزانی! شێخی ئەلبانی دەلّێ: ئێمە جیاوازی دەخەینە نێوان ئەو كوفرەی بە قسەوكرداری سەرزارەكی وتراوەو كراوە، بەلاَم مەبەستی ناخی لەگەلّدا نەبوە، لەگەلّ ئەو كوفرەی، كە خاوەنەكەی مەبەستی ناخی دلّ و دەرونی خۆی وابوە كافر ببێ[1].

تەنانەت دەبینیت، كە شێخی ئەلبانی لەو شریتی (الكفر كفران)ەدا پۆزشیش بۆ ئەو كەسە دێنێتەوە، كە جنێو بە پێغەمبەری پێشەوامان دەدات علیه السلام بەو ئیعتیبارەی (پەرومردە كردنەكەی خراپ بوە)! ئەوەش یەعنی مەبەستی لەكردەوەكەی سوكایەتی كردن بوە، نەك كافر بونی..

١ـ شریتی الكفر كفران / تسجیلات بیت المقدس / عمان ـ الاردن .

سەرنجێك : لەمەوە ساویلەكەیی ئەو كەسانەت بۆ دەردەكەوێت، كە لە بەرگریی كردن لە شێخی ئەلبانی رەحمەتیدا خۆیان ماندو دەكەن لەوەدا، كە شێخ جیاوازی خستۆتە نێوان كوفری ڕەوفتارو كافر بوون بە كردەوە ! چ كاریگەرییەكی گەورە لە جیاوازی نێوان ئەم دوو حوكمەدا ماوە؟! چونكە شێخ و دەروێشە موقەللیدەكانی، كەس بە تەنها كردەوەی كوفرین بە كافر دانانێن، بەلّكو سوورن لەسەر ئەوەی، كە حەتمەن دەبێت كابرای كوفركەر لە دلّی خۆشیدا وویستی كافر بوونی بووبێت، ئەگینا هەر بە موسولّمانی دەمێنێت و ئیشكالێكی لەسەر دروست نابێت، شێخ ئەمەی راشكاوانە دەرخستووە، كە گوتویەتی: تەنها كوفری ئیعتیقادی خاوەنەكەی لە ئیسلام و ئوممەتەكەی دەباتە دەرەوە نەك كوفری كردەوەیی، كە خاوەنەكەی لە ئیسلام و ئوممەتەكەی ناباتە دەرەوە.. وەكو لە سلسلة الاحادیث الصحیحةدا لە ب٦ ل ١١٢ دا دەلّێ: كوفر دوو جۆرە: ئیعتیقادی و كردەوەیی، ئیعتیقادیەكە لە دلّدایەو كردەوەییەكەش بە ئەندامانی لەش دەكرێت).. ئەدی كافر بوون بە كردەوە كەوتە كوێوە ؟!.

عەلیل حەلەبی دەڵێ: (هەمو مەسەلەکان لە بازنەی کافربونێکدان، کە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی باوەڕو نەبونی ئیعتیقاد دامەزراوە)[١]. هەروەها دەڵێ: (گۆڕینی شەریعەتی خوا) بۆ خۆی کارێکی کوفرینە: (گۆڕینی بەڵگەیە لەسەر کافربون و نیشانەیەکی کافر بونەکەیە بەو مەرجەی باوەڕو قەناعەتێکی وای لەگەڵدا بێت، کە دەشێت حەڵاڵ حەرام بکات، یان حەرام حەڵاڵ بکات)[٢]

ئیبنو عوسێمین، کە یەکێکە لە شێخەکانی عەلیل حەلەبی لە (المجموع الثمین ١/٣٧) و (شرح الاصول الثلاثة) دا دوای ئەوەی جۆری کوفری ئەو کەسانەی باس کردوە، کە شەریعەتی خوایان گۆڕیوە باسی مەرجی تەکفیر کردنەکەشیان دەکات.. کەچی عەلیل حەلەبی لە (صیحة نذیر بخطر التکفیر ل ٦٣) دا، کە قسەکانی ئەو دێنێتەوە، حەزەر دەداتە خوێنەرانی کتێبەکەی، کە نەکەن بە غەیری جۆرەکەی من لە قسەکانی شێخ بن عوسێمین بگەن، ئینجا خوێنەر چەواشە دەکات و باس لە مەرجەکانی کافربونی جۆری ئەو کەسانە دەکات، نەك باسی کەسانی دیاری کراو.. ئەوەش بەڵگەی ئەو گەڕەلاوژێیەیە، کە سەرەنجامی راست نەڕۆیشتن و دید لێڵییان تێی کەوتون..

پاشان دەبینیت، کە عەلیل حەلەبی تەنانەت تەبەڕا لە قسەو بۆچونی (مورجیئەی شەرعناسان) یش دەکات و بۆچونی توندڕەوەکانی مورجیئە دەگرێتەوەبەر، کە دەڵێ: ( دوای ئەمە هەر کەسێك لاف ئەوە لێدات، کەکردار دیارەکانی کەسێك، هەموی یان هەندێکیان دەکەونە جێی ئیعتیقادو دەبنە بەڵگەی ئەوەی، کە لە ناخی دڵ و دەروندا بوغزو نکوڵی هەیەو ئەو کەسەی، کە ئەحکامی گۆڕیوە کافر بوە، ئەوە بەراستی تێنەگەیشتوەو باری قورسی لە خۆ ناوەو نارەوا دواوە)[٣]!

---

١ـ الحلبي: التحذير من فتنة التكفير ل ٢١. سەیری ئەو ناونیشانە بکە (فتنة التكفير)! لە کاتێکدا کە تەکفیر حوکمی شەرعە نەك فیتنەو ئاژاوە ..

٢ـ الحلبي: صيحة نذير بخطر التكفير ل ٦٤.

٣ـ الحەلەبی/ سەرچاوەی پێشوو ل ٦٤

ئەمە بەراستی موسیبەتەو حەوقەلە (لا حول ولا قوە الا باللە) ی دەوێت..

عەلیل حەلەبی بۆ ئەوەی ئەم دەلاقە هەڵدڕاوەی خۆی پینەکات کارێکی تری کرد کە هەر لەو ونمونەی ئەو دەوەشێتەوە! کە درۆیەکی گەورەی بە دەم ئیمامی ئیبنوتەیمیەوە هەڵبەست!! لە پەراوێزی کتێبەکەیدا(صیحةنذیر ل ٦٤) و لە شریتەکەشیدا (رد شبهة التکفیرین) درۆیەك هەڵدەبەستێت و دەڵێ: شێخولئیسلام ئەو کەسە بە کافر دانانێت کە جنێوی بە خوای گەورە داوە مەگەر لە دڵیشیدا سوکایەتیەکەی مەبەست بوبێت!! ئەمە بەراستی درۆیە، بوختانەو بە دەم ئیمامی ئیبنوتەیمییەوە دەکرێت، حەتمەن خوای پەروەردگار لەو دنیادا لە عەلیل حەلەبی دەپرسێتەوە لەسەری، ئەو رۆژەی هەمو بەملکەچیەوە لە حزوری خوای کارزاندا دەوەستێتەوە، مەگەر رەحمەتی خوای گەورە بیگرێتەوە..

کە دەگەڕێیتەوە ئەو شوێنەی عەلیل حەلەبی ئاماژەی پێکردوە، کە گوایە لە کتێبی (الصارم المسلول علی شاتم الرسول)ەکەیدایە، دەبینیت کە ئیبنوتەیمییە باس لەو وشانە دەکات، کە بە جنێو حسێب بون، کە لەوانەیە لای نەتەوەیەك بە جنێو حسێب بن لای نەتەوەی تر بە جنێو حسێب نەبن، ئێ ئەمە لە کوێ و بوختانەکەی عەلیل حەلەبی لە کوێ.. دەبا خەڵکی حەزەری خۆیان لە دەلەسەو فاك و فیکی عەلیل حەلەبی و ئەمسالی ئەو وەرگرن و ئاگاداربن..

یا سوبحان اللە چۆن خەڵکانێك وەکی ئەم عەلیل حەلەبیە بێ چاو وڕاوە، ئەو درۆیە بە دەم شێخولئیسلام ئیبنوتەیمییەوە دروست دەکەن، کە گوایە ئەو گوتویەتی، کە ئەوی جنێو بە خواو پێغەمبەری خوا بدات، کە لە شەرعداکرداره، بەڵام پێی کافر نابێت؟!! مەگەر لە دڵ ودەرونیشیدا سوکایەتیەکەی پێ رەواو بێت و مەبەستی بوبێت!! ئەمە لە کاتێکدایە، کە ئیبنوتەیمییە رحمەاللە ئەو قسەیە دەباتەوە سەر فیرقەی جەهمییەو بە

راوبۆچونی ئەوانی دەناسێنێت.. وەك لە (الصارم المسلول ل ٥١٨)دا دەفەرموێ: (ئەوانە خاڵێکی تریشیان لێ دەگیرێت، ئەویش ئەوەیە، کە باوەڕیان وایە، کە دەشێت کەسێك شتێك بە زمان بڵێت و بە دڵی مەبەستی وا نەبوبێت، بۆ نمونە ئەگەر کەسێك لە دڵ ودەرونی خۆیدا پێغەمبەری صلی الله علیە وسلم بە گەورەو بەڕێزو مەزن دانا، ئەگەر بەسەرزارەکی بە پێچەوانەی ئەوەوە شت بڵێ هیچ ئیشکالێکی نیە!! هەر وەکو کە دووڕویەك هەرچی چاکەو خێرێك بە سەرزارەکی بکات سودی نیە، مادام لە ناخی خۆیدا باوەڕی پێی نیە) جا بڕوانە چۆن هەمان قیاسی بەکار هێنایەوە، کە پێشتریش شێخی ئەلبانی کردیەوە بە بەڵگەی خۆی!! خوا بمانپارێزێت.. ئامین..

شێخ الاسلام دەڵێ: ناوداری مورجیئە ئەبومەعاز دەڵێ: هەر کەسێك پێغەمبەرێك بکوژێت، یان زللەیەکی لێدا کافر دەبێت، نەك بە زللە لێدانەکەی کافر بوبێت، بەڵکە لەبەر سوکایەتی و دوژمنایەتی دەربڕینەکەی، کە نیشانەی بوغزاندنێتی.. (مجموع الفتاوي ٧/٣٣٥) دەی ئیتر چی بۆ عەلیل حەلەبی مایەوە؟! نازانم..

عەلیل حەلەبی بوختانێکی گەورەی تریشی دەرهەق حافز ئیبنوکەسیر هەیە، دەتوانیت هەر لەو لاپەڕە ئاماژە کراوەیدا ببینیت..

مەسەلەی جنێو دان بە خوای پەروەردگار، یان بە پێغەمبەری نازدار صلی الله علیە وسلم مەسەلەیەکە هەمو ئیمامە بەڕێزەکان - وەکو لە دواتردا راوبۆچونەکانیان دێنینەوە ان شاوالله - لەسەری کۆن، کە هەر کەسێك جنێو بە خوای پەروەردگار، یان بە پێغەمبەری رێزدار بدات، لە زاهیرو باتنیدا بە کافر حسێبە، ئیتر باوەڕ لە ناخیدا چیەو چەندە ئەوە پەیوەندی بە کارە کوفرینەکەیەوە نیە.. ئەمەش حەقێکی رون و ئاشکرایە کەس خۆی لێ گێل و کەڕ نەکردوە، مەگەر کەسانێکی وەکو عەلیل حەلەبی، کە پەتای جەهمێتیان گرتوەو توشی ئەو لاسەنگیە بون..خوا لامان دات..

شێخی ئەلبانی دەڵێ: (کافر دانانی ئەهلی یەکخواپەرستی بەکرداریەك، کە

لێوەی دەرکەوتوە جائیز نیە، تا ئەو ساتەی ڕون دەبێتەوە، کە لە ناخیدا نکوڵی لە هەندێك لایەنی ئەو شەرعە دەکات، کە خوای گەورە ناردویێتی)[١]!

لەمەوە رون دەبێتەوە، کە (سەلەفی) یەکان، کە پەنا دەبەنە بەر قسەی شەرعناسە مورجیئەکان (مورجیئە الفوقهاء) زۆر ناخایانێت ئاشکرا دەبن، کە گەڕاونەتەوە سەر راوبۆچونە ئەسڵەکەیان، کە هەر ڕاوبۆچونی جەهمیەکانە.. چونکە شەرعناسە مورجیئەکان ئەو کەسە بە کافر دادەنێن، کە کارێکی کوفرینی لێوە دەردەکەوێت، بەڵام ناڵێن بە ئەنجامدانی خودی کارەکە کافر بوە، بەڵکو دەڵێن ئەوکردار کوفرینە بۆتە بەڵگەو نیشانەی نەمانی باوەڕ لە ناخی دڵ و درونی بکەرەکەدا.. شێخی ئەلبانی و قوتابیەکانیشی لە ئەسڵدا ئاوا دەڵێن، بەڵام دوایی زیادەیەك دەخەنە سەر ئەو ڕاوبۆچونەیان، کە دەڵێن: (مەبەست کافربون و بە حەلاڵزانی ناخی بکەرەکە، مەرجە بۆ بە کافر دانانی)! یەعنی ئەگەر کابرای بکەری کوفرەکە بڵێ، کە مەبەستی ئەوە نەبوە، کە خۆی کافر بکات، یان لە ناخیدا بە حەلاڵی نەزانیوە بە خودی کردەوەکە کافر نابێت، کەوابو کابرای کافر لای (سەلەفی)یەکان هەر موسوڵمانە، چونکە خۆ لە ناخی خۆیدا کافر نەبوە.. بەڵام لای شەرعناسانی مورجیئە کافر بوە چونکە شتێکی نیشان داوە، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی باوەڕ لەناخیدا نەماوە ..

---

١ـ الالباني / حكم تارك الصلاة ل ٦١.

# باسی سێیەم

## مەدخەلی و پاڵانتەوانانی ( سەلەفێتی )

## لە ( باب الکفر ) دا لەسەر عەقیدەی جەهمیەکانن

شێخولئیسلام ڕێسایەك لە بابەتی تەکفیردا بۆ ئەهلی سوننەت دادەڕێژێت، کە پێچەوانەی ڕاوبۆچونی هەمو گروپی مورجیئەکانە، ئەویش وایە، کە گوفتارو کرداری وا هەیە بکەرەکانیان لە دین و میللەت دەکاتە دەرەوە، بێسەرنجدانە ئەوەی، کە ئایا کابرا لە ناخیدا باوەڕی وا بوە، یان پێچەوانەی، ئایا لەگەڵ ئەو کوفرەی بە قسە یان بەکردار ئەنجامی داوە لە ناخی دڵ و دەرونیشیدا باوەڕی بە کوفرەکە هەبوە، یان هەر بە قسەوکردار ئەوەی دەربڕیوە.. ئەو ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: (بە شێوەیەکی گشتی هەر کەسێك شتێکی وت، یان شتێکی کرد، کە کوفرین بو پێی کافر دەبێت، با مەبەستی ئەوەش نەبوبێت پێی کافر ببێت، چونکە کەس ناڕوات بۆ ئەوەی خۆی کافر کات قسەی کوفرین، یان کرداری کوفرین ئەنجام بدات مەگەر چۆنها!! (الصارم المنلول علی شاتم الرسول لا ١٧٨) ..

ئینجا ئەوە رون دەکاتەوە، کە باوەڕ بون بەم ڕێسایە، بەشێکە لە باوەڕبون، بەوەی کە باوەڕ گوفتاروکردەوەیە، دوای ئەوە دەبینیت چۆن ڕاوبۆچونی سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەف لەم بوارەدا هەڵدەوەشێنێتەوە کە دەڵێ: (ئەگەر جنێوی بە خوا، یان بە پێغەمبەر دا صلی الله علیه وسلم دەسبەجێ لەزاهیرو باتینیدا کافر دەبێت، جا ئیتر جنێودەرەکە ئەو کارەی بەلاوە حەرام بێت، یان حەڵاڵ، لەبیری بێت،یان بیری چوبێتەوە، ئەمەش ڕاوبۆچون و فەتوای شەرعناسان و هەمو زانایانی تری ئەهلی سوننەت و جەماعەتە لەوانەی، کە دەڵێن باوەڕ گوفتارو کردارە..(الصارم المسلول لا١٢٧٥).

كەوابو هەر كەسێك، كە ئیعتیقادی وابو، كە باوەڕ گوفتارو كرداره پاشان ئەوه بۆ بەكافر بون بكات بە مەرج، كە دەبێت كافر بون لە ناخی دڵ و دەروندا هاوكاتی گوفتارو كرداری كوفرین بێت، تا خاوەنەكەی بە كافر بزانرێت، ئەوه ڕیسەكەی كردۆتەوه بە خوری، چونكه هەم خۆی بە درۆ خستۆتەوه، هەم له ڕێبازی ئەهلی سوننەت لایداوه..

ئیمامی ئیسحاقی كوڕی راهەوەی، كە لە پێشەوای ناودارانی ئەهلی سوننەتە ڕەحمەتی خوای لێ بێت، ئەوه دەسەلمێنێت كە كۆڕا(ئیجماع)ی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر ئەوەیە، كە هەندێك كردار هەن، كە كوفرینن، هەر كەسێك ئەنجامیان بدات پێی كافر دەبێت (با لە دڵ و دەرونیشیدا باوەڕی وا نەبوبێت، كە حەڵاڵ بە حەرام، یان حەرام بە حەڵاڵ بزانێت، یان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەدرۆ بخاتەوه، یان نكوڵی لە شتێك لە شەریعەتەكەی بكات) بۆیه دەڵێ: (زانایان رایان لەسەر ئەوه كۆیە، كە هەر كەسێك جنێو بە خوای گەوره یان جنێو بە پێغەمبەرەكەی صلی الله علیه وسلم بدات، یان شتێك لەوه رەت كاتەوه، كە خوای گەوره ناردویێتیە خوارەوه، یان پێغەمبەرێك بكوژێت، كافر دەبێت، با باوەڕیشی بە هەمو ئەوه هەبێت، كە خوای گەوره ناردویێتیە خوارەوه ..(الصارم المسلول لا ٤٠).

ئینجا جەخت لەوه دەكاتەوه، كە ئەوه فەتوایەكە، كە هەمو زانایان رایان لەسەرێتی بۆیە دەڵێ: ئەمە بۆچونێكە، كە زانایان لەسەری كۆن، هەمویان ئەم كەسەیان بە كافر داناوه، لایان هەر وەكو ئەو كەسە وابوه، كە نكوڵی لە بڕگەیەكی شەریعەتی خوایی كردبێت.. چونكە ئەو موسوڵمانەی، كە باوەڕی بە خوای پەروەردگار هێناوەو، بەوەش هێناوه، كە لە لایەن ئەوەوه هاتوه، بەڵام پێغەمبەرێك دەكوژێت، یان یارمەتی كوشتنی دەدات كافر دەبێت، با بشڵێت كوشتنی پێغەمبەران حەرامە.. (المروزي: تعظیم قدر الصلاة ٢/٩٣٠ لە كتێبی نواقض الایمان وەرگیراوه لا ٤٣ و ٤٤)..

دە سەیری ئەمە کەو سەیری هەڵوێستی سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی بکە، بزانە لەم کێشە دژوارە چارنوسسازەدا چەند لە کۆڕا (ئیجماع) ی پێشەوایان و زانایان و شەرعناسانی ئەهلی سوننەت دەرچون! بەوەی، کە بەحەڵاڵ زانینی کوفریان لە ناخی دڵ و دەرونی بکەری گوفتاری کوفرین، یان رەفتاری کوفریندا کردوە بە مەرج!! لەوەدا کە کافر بونی ناخیان کردوە بە تەنها هۆکارێك بۆ کافر بون!! لەگەڵ ئەم دیدە لێڵەشیاندا گوێیان لێ بگرە، تەنها خۆیان بە شوێن کەوتوی سەلەف دەزانن!! هەر پێیان وایە خۆیان درگی هەمو لایەن و رەهەندەکانی باوەڕیان کردوەو عەقیدەیان پاکەو تەواوە، لە کاتێکدا کە هەندێکیان لە ریزی مورجیئەشدا وان لە دواوە!

ئیمامی ئیبنوجەریری تەبەری رەحمەتی خوای لێ بێت، کە بەرپەرچی ئەو کەسانە دەداتەوە، کە (مەبەستی کافر پێبونیان) پێ مەرجە بۆ دەرکردنی حوکمی کافر بونی کەسێك کەکرداریەکی کوفرینی ئەنجامداوە، لە تەفسیری ئەو ئایەتەی قورئاندا، کە دەڵێ: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾﴾ الکهف.واتە: بڵێ: ئەرێ هەواڵی ئەو کەسانەتان بدەمێ، کە زەرەرمەندترین کاریان کۆکردۆتەوە، ئەوانەی کە هەمو رەنجی دنیایان بە با چو، کە واشیان دەزانی کاری چاکەیان ئەنجامداوە؟!!

تەبەری دەڵێ: ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر بۆچونی هەڵەی ئەوانەی کە وا دەزانن کە هیچ کەسێك دوای خواناسین و بەیەکزانینی خوای گەورە کافر نابێتەوە، مادام مەبەستی کافر بون نەبوبێت.. چونکە دەبینیت، کە خوای پەروەردگار لەم ئایەتەدا وەسفی سیفەتی ئەو کەسانە دەکات، کە ئەو هەمو هەوڵ و رەنجەی لە دنیادا دایان بە هەدەر چو، گومڕا بون! با خۆشیان هەر

وایــان زانیبێــت، کــە کــاروکرداری چــاکیان ئــەنجام داوە!! لــە وەســفی حــاڵ و چارەنوسیاندا دەفەرموێت: ئەوانە خۆیـان کـافر بوبـون.. ئەگـەر مەبەسـت لـەم ئایەتە ئەوە بوایە، کە دید لێڵەکان دەیڵێن کـە گوایـە کـەس کـافر نابێتـەوە، تـا خـۆی شـارەزا نـەبێت و نـەزانێت، دەبـو خـوای گـەورە پاداشـتی خێـرو چـاکەی ئەمانــەی بدابایاتــەوە، چــونکە خــۆ بــۆ خۆیــان هــەر باوەڕیــان وابــوە، کــە کاروکرداری چاکیان کردوە، بـەڵام هـەق بـە پێچـەوانەی ئـەوەی ئەوانـەوە بـوە! بۆیە خوای گەورە دەرهەقیان گوتی: ئەوانە کافرن و کاروکردەوەیـان پوچـەڵەو مایەی قبوڵ نیە.. (الطبري: جامع البیان ١٦/٢٨).

ئیمامی ئیبنوحەجەر رەحمەتی خوای لـێ بێـت لـە (فـتح البـاري) دا دەڵـێ: کەسـانی وا هەیـە لـە نـاو موسـوڵمانانـدا، کـە لـە دینەکـە دەچـێتە دەرەوە، بـێ ئەوەی خۆی مەبەستی بوبێت! بێ ئەوەی دینێکی تریشی قبوڵ کردبێت..

شـێخ حەمــەد بــن عــەتیق العیــدی نەجــدییش راوبۆچــونی (ســەلەف) و (ئەسلاف) یان هەڵدەتەکێنێتەوە، کەلە کتـێبی (الدفاع عن أهل السنة والاتباع لا ٢٢ــ ٢٣ دا) دەڵـێ: تــەرەف بەرامبــەر لــە کــۆی فــەتوای قورئــان وســوننەت و راوبۆچونی یاوەران و ئەوانیە دوای ئەوانیش بەوە دەردەچێت، کە دەڵێ: (هەر کەس دڵی بە کوفر گەشایەوە، واتە پێی دڵخۆش بـو، پێـی رازی بـو، لـە دینەکـە پاشگەزبۆوە و ناخی بە کافر بون ئاسودە بو، ئـەوە ئـەو کەسـەیە، کـە ئێمـە بـە کـافری دەزانــین (هــەر وەکـو کــە ســەلەفیەکانی بــەر ســێبەرو مەدخەلیــەکان و پاڵانتەوانانی سەلەفی ئەمڕۆش دەیڵێن!) واتە هـەر کەسـێك بـە رون و راشـکاوی گوفتارێکی کوفرینی، یان رەفتارێکی کوفرینی کردو لە ناخی دڵ و دەرونیشـیدا پێی خۆش بو، پێـی ئاسـودە بـو، ئینجـا بـە لامانـەوە کـافرە).. ئـەم قسـەیە زۆر ناهەقە، چونکە راشکاوانە پێچەوانەی تـەواوی دەقـە، بەرهەڵستیەکی ئاشـکرای رێبــازی موســوڵمانانەو نــەفامی زەقــە!! چــونکە قورئــانی پــیرۆزو ســوننەتی پێغەمبەر پێشەواو صلی الله علیــە وسـلم کـۆڕا (ئیجمـاع)ی ئوممەتـە.. هەمو

**لەسەر ئەوەن، کە هەر کەس کوفرێکی وت، یان کوفرێکی کرد پێی کافر دەبێت، ئاسودەیی دەرون و پێخۆشحاڵ بون پێی، بە هیچ شێوەیەك نابێتە مەرجی، مەگەر ناچار کرابێت.. ئەمما ئەو کەسەی ئازادو سەربەستەو کوفر دەکات و پێشی دڵخۆشە و ئاسودەیە وەلا ئەوە کافری موتڵەقەو دوژمنی خواو پێغەمبەری خوایە، با بەزمان یان بەکرداریش نەڵێت، کە دوژمنیانم.. ئەمەش بە بەڵگەی قورئان و حەدیس و ئیجماعی زانایانی ئوممەت سەلمێنراوە. (لە کتێبی الجامع في طلب العلم الشريف/عبدالقادر عبدالعزيز وەرگیراوە لا ٥١١).**

**ئیمامی ئیبنوحەزمیش هەر بەرپەرچی ئەو کەسانە دەداتەوە، کە کافر بون لە (نکوڵی کردن و بەحەلاڵ دانانی حەرام)دا دەبینن و بەس.. بۆیە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴿٢٦﴾ ﴾سورەتی محمد واتە: ئەو کەسانەی، کە لەدوای ئەوەی هیدایەت و ڕێنمایی خواییان بۆ دەرکەوت پاشگەز بونەوە، ئەوانە شەیتان تەفرەی دابون و ئەو ڕێی نیشاندابون! چونکە بەو کەسانەیان دەوت، کە قورئانیان دەبوغزاند: باشە گوێڕایەڵیتان لە هەندێك شتدا دەکەین!! خوای گەورە نهێنیەکانیان دەزانێت.. ئیبنوحەزم دەڵێ: ئەوانە گەرچی حەقیان دەزانی، بەلام خوای گەورە خستنیە ریزی کافرانەوە، ئەوانە ڕێنمایی خواییان بۆ هاتبو، هیدایەتیان وەرگرتبو، بەلام هەر بە قسە ئەومیان بە کافرەکان دەوت: باشە لە هەندێك شتدا بە قسەتان دەکەین!! گوێڕایەڵیتان دەکەین! خوای گەورە دەفەرموێ خوا نهێنیەکانیان دەزانێت!! خوای گەورە نافەرموێ: ئەوانە نکوڵیان کردوە!! بەڵکو ئەوەمان بۆ رون دەکاتەوە، کە ئەوانە دینەکەیان وەرگرتوەو لە ناخیاندا هەقیان بەراست زانیوەو پەسەندیان کردوە، چونکە هیدایەتەکەیان وەرگرتوە، ئاشکرایە، کە هەر کەسێك حەقی بۆ رون بۆوە شتێکی، نا مومکینە بە دڵ**

نکوڵی لێ بکات، مادام لە ناخی چەسپیوە هەر لە ناخی خۆیدا بە درۆی نازانێت بەڵام سەرزارەکی پێچەوانەی دەبێتەوە.. (ابن حزم: الفصل في الملل و الاهواء والنحل ٣/٢٢٠).

ئیمامی ئەبوبەکری شافیعی زۆر نمونە لەو گوفتارو کردارانە دێنێتەوە، کە ئەهلی سوننەت لەسەر کافر بونی ئەنجامدەرەکانیان پێیان، رێکن، با خاوەنەکانیشیان هەر لاف و گەزافی ئەوە لێدەن، کە لە دڵ و دەرونیاندا مەبەستیان کافر بون نەبوە.. ئەو دەڵێ:

(بۆ نمونە ئەگەر کەسێك بە دوژمنەکەی بڵێت: ئەگەر خوا بوایە نەمدەپەرست، پێی کافر دەبێت.. یان ئەگەر پێغەمبەری خوا بوایە باوەڕم پێی نەدەهێنا، پێی کافر دەبێت.. یان نەخۆشێك دوای چاك بونەوەی بڵێت: ئەوەندەم ناڕەحەتی لەم نەخۆشیەمدا چێشت ئەگەر ئەبوبەکری سددیق و عومەری کوڕی خەتتابیشم بکوشتایە شایانی ئەو هەمو ناسۆرە نەدەبوم، پێی کافر دەبێت.. یان ئیددیعایەی ئەوە بکات، کە وەحی بۆ هاتوە، با نەشڵێت پێغەمبەرم هەر کافردەبێت، یان بڵێت دەچمە بەهەشتەوەو لە میوەی دەخۆم و حۆریەکانیشی لەئامێز دەگرم، بە پێی کۆڕا (ئیجماع)ی زانایان پێی کافر دەبێت.. ئائەمەو هەمو قسەیەکی تری ئاوا، کە هەندێك سۆفی دەیڵێن.. یان کەسێك جنێوێك بە یەکێك لە پێغەمبەرانی خوا بدات، یان گاڵتەی پێ بکات، بە کۆڕای زانایان کافر دەبێت.. ئەگەر کەسێك بڵێت من پێغەمبەرم، یەکێکی تر لەولاوە بڵێ راست دەکات، پێی کافر دەبێت.. گەر کەسێك بێ بەڵگە بە موسوڵمانێك بڵێت هۆ کافر، پێی کافر دەبێت، چونکە ئیسلامەتی کابرای موسوڵمانی بە کوفر ناساندوە..

ئەگەر کەسێك بڵێ منداڵەکەم بمرێت دەبمە جولەکە، یان مەسیحی دەسبەجێ بەو قسەیەی کافر دەبێت.. ئەگەر کافرێك بە موسوڵمانێکی وت دەمەوێ موسوڵمان ببم فێری شایەتمانم، کە تا بیڵێم، ئەم ئاماژەی ئەوەی بۆ

بكـات، كـه لەسـەر دیـنی خـۆت بمێنیـەوە پێـی كـافر دەبێـت.. ئەگـەر شایەتمانەكەشی پێ نەهێناو لێی گەڕا، هەر پێی كافر دەبێت.. ئەگـەر دو كـەس شەڕە قسەیان بو، یەكێكیان وتی لاحول ولاقوة الا بالله ئەوی تریان بڵێ: لاحول ولا قوة الا بالله كەس تێر ناكات، بەو قسەیەی كافر دەبێت..

ئەگەر كەسێك گوێی لە بانگ بێت و بڵێ درۆ دەكات، پێی كافر دەبێت.. گەر بڵێ لە قیامـەت ناترسـم، پێـی كـافر دەبێـت.. گـەر كەسـێك لـەو كاتـەدا، كـە لـە منداڵەكـەی خـۆی دەدات، یـەكێكی تـر پێـی بڵێـت بـۆ وای لـێ دەكـەیت، مەگـەر موسوڵمان نیت؟! بە ئەنقەست بڵێ: نەخێر، بەم وەڵامەی كافر دەبێت.. بڕوانە كتێبی (الجامع في طلب العلم الشـریف/عبـدالقادر بـن عبـدالعزیز لا ٤٩٠ ـ ٤٩١)..

شێخولئیسلام ئیبنوتەیمیە ئـەوە بـە كـۆڕای زانایـان و شەرعناسـانی ئیسلام نەقڵ دەكات، كە جنێودان بە خوای گـەورە، یـان بـە پێغەبـەر صـلی الله عایـە وسـلم هۆكـاری كـافر بونـە، بـێ ئـەوەی گـوێ بـەوە بـدرێت، كـە لـە نـاخی جنێودەرەكەدا باوەڕ هەیە، یان كوفر.. بۆیە دەڵێ: قازی ئەبویەعلا دەڵـێ: هـەر كەسێك جنێوی بە خوا، یان جنێوی بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دا پێـی كافر دەبێت، ئیدی ئەو جنێودانەی بە حەڵاڵ زانیبێت، یان بە حەرام..(الصارم المسلول لا ٥١٣).

ئیبنوتەیمیە لە كتێبی (مجموع الفتاوی) شدا لە باسـی ئـەو كەسانەدا، كـە لـە رێگای سەفەری خۆیاندا گاڵتەو لاقرتێیـان دەكـردو نوكتـەیان لەسـەر ئیسلام و موسـوڵمانان دەگێڕایـەوە، خـوای گـەورە ئایـەتی قورئـانی دەرهـەقیان نـاردە خوارەوە، كە پۆزش مەهێننەوە تازە بەو قسانەتان كافر بـون (لا تَعْتَـذِرُوا قَـدْ كَفَرْتُمْ ) دەفـەرموێ: خـوای گـەورە ئـەوە رون دەكاتـەوە، كە ئـەو كەسـانە دوای ئـەوەی باوەڕیـان هێنـاوەو موسـوڵمان بـون كـافر بونەتـەوە، هەرچـەندە هـەر

دەیانوت ئێمە ئەوانەمان هەر بە زماندا هاتووەو وتومانە، دەنا باوەڕمان هەر وەکو خۆی ماوەو موسوڵمانین، ئێمە سوعبەتمان دەکرد، گاڵتەو گەپمان دەکرد. (ابن تيمية/مجموع الفتاوى ٧/١٤٠.

ئینجا ئیبنوتەیمیە رحمەالله رەد لەو کەسانە دەداتەوە، کە پێیان وایە، ئەگەر کەسێك جنێوی بە خوای کردگار، یان بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دا بەو مەرجەی مەبەستی کافر بون بوبێت، یان لە دڵ و دەرونیدا جنێودانی وای بە حەڵاڵ زانیبێت ئینجا کافر دەبێت!! ئەمما ئەگەر وتی، کە لە ناخی خۆیدا بە حەڵاڵی نەزانیوە، یان وتی، کە مەبەستی سوکایەتی نەبوە (وەکو لەم سەردەمەشدا عەلیل حەلەبی دەیڵێتەوە یان وەکو ئەوەی شێخی ئەلبانی دەڵێ: ئەوە بەڵگەی خراپ پەروەردەکردنێتی!!) ئەوە کافر نابێت!!

ئیبنوتەیمیە دەفەرموێ: ئەو قسەیەی، کە دەڵێ گوایە شەرعناسان رایان وابوە، کە ئەگەر جنێودەرەکە جنێودانی بە خواو بە پێغەمبەری خوا بە حەڵاڵ زانی، ئینجا پێی کافر دەبێت، ئەگەر نا، کافر نابێت! ئەسڵ و ئەساسی نیە.. ئەمە رای شەرعناسان نیە، ئەمە قسەی هەندێك لە موتەکەللیمینە (ئەهلی کەلام و فەلسەفە) کە قسەی شەرعناسان وا نەقڵ کردۆتەوە، کە وایان زانیوە بە پێی رێسا ئوسوڵیەکانی ئەوانەو لەگەڵ هەواو هەوەسی ئەواندا یەك دەگرێتەوە، ئەوەش وا نیە، ئەوەی ئەوان لێیانەوە نەقڵ کردون شەرعناس نین و خوێندکارانی فیقهن، کە راوبۆچونیان بە فەتوا دانانرێت.. ئێمە راوبۆچونی زانایان و شەرعناسانی پێشەوایانمان هێنایەوە و کۆڕایانمان لە کەسانێکەوە نەقڵ کرد، کە شارەزاترین کەسن لە ناسینی دیدو تێڕوانین و فەتوای ئەو پێشەوایانەدا.. ئیتر با کەسێك گومانی ئەوە نەبات، کە مەسەلەکە ئیجتیهادو راجوێیی هەڵدەگرێت و راوبۆچونی جیاوازی تێدایە.. نەخێر.. ئەوە هەڵە بینینە، چونکە کەس ناتوانێت بە هیچ شێوەیەك راو فەتوای یەکێك لە پێشەوایانی شەرعەوە نەقڵ بکات، کە ئەو بۆچونەی نەبوە، کە ئێمە هێناومانەتەوە.. (داخۆ سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان

وپالأنتەوانانی سەلەفی لێرەدا چی بڵێن؟!!) بەڵگە لەسەر ئەوەی هێناومانەتەوە زۆر زۆرن، کە هەمو ئەوە دەسەلمێنن، کە ئەوی جنێوی بە خواو بە پێغەمبەری خوا دا، بە جنێو دانەکەی کافر دەبێت وەکو ئەوەی، کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِيَّ ﴾ التوبە/٦١ واتە: ئەوانە هەیانە ئازار بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەگەیێنێت.. یان ئایەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ الاحزاب/٥٧ واتە: ئەو کەسانەی، کە ئازار بە خواو بە پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم دەگەیێنن.. یان: (لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ) پۆزش مەهێننەوە، ئێوە دوای موسوڵمان بونتان کافر بونەتەوە..

ئەو حەدیس و بەڵگانەی تر، کە هێنامانەوە، کە تەنها ئازاردانی خواو پێغەمبەرصلی الله علیە وسلم، خۆی لە خۆیدا مایەی کافر بونەکەیە، بێ گوێدانە ئەوەی ئایا لە ناخی کابرای جنێودەردا باوەڕ هەیە، یان نا، یان ئەو جنێودانەی بە خواو پێغەمبەری خوا بە جائیز زانیوە، یان نا؟ پێی حەڵاڵ بوە یان نا.. ( ابن تيمية: الصارم المسلول على شاتم الرسول لا ٥١٦ ـ ٥١٧) ..

ئەوە کۆڕا (ئیجماع) ی شەرعناسان و پێشەوای موسوڵمانان لەسەر ئەو مەسەلەیە، کە کۆڕایەکە هاوشێوەی زۆر کەمە، ئەوی لەم کۆڕایەش دەردەچێت، خۆی هەڵدەخەڵەتێنێت و مورجیئەیەو بە زۆری زۆرداریی دەیەوێت هەر (سەلەفی) بێت.. ئەمەش زێڕی تەزویرەو زۆر زو پەڵە پەڵە دەبێت و لە ناو گەردانە زێڕەکاندا حەیای دەچێت.. خوا لامانـدا..

شێخولئیسلام حاڵی مورجیئەکان باس دەکات، کە چۆن دوای ئەوەی ئیقامە حوججەیان لەسەر دەکرێت و قسەیان لەبەرامبەر ئەم کۆڕا (ئیجماع) ئوممەتەدا پێ نامێنێت، پەنا دەبەنە بەر ئەوەی کە دەڵێن: ئەم گوفتارو کردارانە بۆ خۆیان کوفر نین، بەڵام دەبنە نیشانەی هەبونی کوفر لە دڵی خاوەنەکانیاندا!! دەڵێ: (ئەمانەی قسەکانی جەهم و ساڵحی دووبارە دەکەنەوە،

زۆرجاریان وتوە، کە جنێو دان بە خوای گەورە و بە پێغەمبەرەکەی صلی الله علیە وسلم، یان وتنی سێ پیرۆزەکەی مەسیحیەکان، یان هەر قسەیەکی تری کوفرین، کوفری ناخ ناگەیێنێت، (یەعنی هەر بە سەرزارەکی کوفرە) بەلاّم بەلگەیە لەسەر هەبونی کوفر، بۆیە دەشێت ئەو کەسەی، کە بە زار جنێو بە خواو پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم دەدات لە ناخیدا یەکخواپەرستێکی خواناس بێت و زۆریش دیندار بێت (وەکو ئەوەی ئەلبانی رەحمەتی دەلێت: ئەوە بەلگەیە لەسەر ئەوەی، کە باش پەروەردە نەکراوە!!) ئینجا، کە ئیقامە حوججە دەکرێن بەدەقێکی رۆشن و راشکاو، یان بە کۆرای زانایان، کە ئەمە لە ناخ و روالەتدا کوفرە، دەلێن: ئەوە مانای وایە، کە کوفرێك لە ناخیدا هەیە)! (مجموع الفتاوی ٧/٥٥٧).

ئیمامی ئیبنوحەزمیش بە توندی بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە، کە خودی کافربونی سەرزارەکی بە کافر بون نازانن و پێیان وایە (نیشانە) ی هەبونی کوفرە لە ناخی خاوەنەکەیداو، ئەگەر بکەرەکەی مەبەستی کافر بون نەبوبێت، هیچ حوکمێکی کوفر نایگرێتەوە، چونکە بە حساباتی ئەوان تەنها کافربونی ناخ حسێبەو موسولمان بە ئەنجامدانی ئەو، لە دین و ئوممەتەکەی دەچێتە دەرەوە.. ئیبنوحەزم دەلێ: (ئەوانە دەلێن: جنێو دان بە خوای پەروەردگار، یان بە پێغەمبەری نازدار صلی الله علیە وسلم هۆکاری کافر بون نیە، بەلاّم بەلگەیە لەسەر هەبونی کوفرێك لە دلّ و دەرونیدا) (ابن حزم: الفصل في الملل و الاهواء والنحل ٣/١٩٩).

ئەمە ئەو ئیمامی ئیبنوحەزمەیە، کە ئیمامی ئیبنوتەیمیە دەرهەقی دەلێ: (ئەبومحمد ئیبنوحەزم لە مەسەلەکانی باوەرو قەدەردا راسترە لە خەلکی تر، شارەزاتریشە لە حەدیس و، زۆریش رێزی فەرمودەو فەرمودەوانانی لایە).. (مجموع الفتاوی ٤/١٧).

ئیمامی ئیبنوتەیمیە بۆ خۆشی دەڵێ: (هەروەها کە دەڵێن (مەبەستی مورجیئەکانە ) هەر کاتێك شەرع حوکمی کافر بونی کەسێکی بە کردارێك، یان بە گوفتارێك دا کە ئەنجامی دابو ئەوە مانای ئەوەیە، کە کوفرێك لە دڵیدا هەیە.. ئەمە خۆی لە خۆیدا دژ بەیەکە.. ئەگەر ئەمەیان لا ببێتە بەڵگەی ئەوەی، کە باوەڕ لە دڵدا دەشێت نەمێنێت، بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە خودی باوەڕەکە هەر لەو دڵەدا نەچەسپیوە، چونکە ناشێت کوفرو باوەڕ لە یەك کاتدا لە یەك دڵدا جێگیر ببن! ئەمەش نابێتە بەڵگە تا بۆ بەرگریی لە بۆچونی خۆیان بیهێننەوە).. (مجموع الفتاوی ٧/٦٤٤).

ئیبنوحەزم لە (المُحَلّی) کەیدا دەڵێ: (لەسەر ئەم زەمینەدا کەسێکی موسوڵمانت بەردەست ناکەوێت، کە بڵێ جنێودان بە خوای گەورە نابێتە کوفر، کەچی جەهمیەو ئەشعەریەکان، کە دوو کۆمەڵن هەرچەندە زۆر ئیعتیبار بۆ بۆچونەکەیان دانانرێت، بەڵام بەردەوام دەڵێن: جنێودان بە خواو راگەیاندنی کوفر کافربون نیە!! تەنانەت هەندێکیان دەڵێن: ئەو کەسەی، کە جنێو بە خوا دەدات بە دڵنیاییەوە دەڵێین کافر نابێت، ئەگەرچی جنێوەکەی بەڵگەی هەبونی کوفرە لە ناخی دڵ و دەرونیدا)! (المحلی بالآثار ١٣/٤٩٨).

لە کتێبێکی تریشیدا دەڵێ: (کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ﴾النساء/ ١٤٠ واتە: خوای گەورە لە پەیامی خۆیدا بۆی ناردون، کە ئەگەر لە شوێنێك بیستتان وا گاڵتە بە ئایەت و فەرمایشتەکانی خوای پەروەردگار دەکرێت، لەو شوێنە لەگەڵ ئەوانەدا دامەنیشن، مەگەر قسەو با سەکەیان بگۆڕن بە شتێکی تر، ئەگینا ئێوەش وەکو ئەوانن.. ئەمە ئەوە دەردەخات، کە قسەی وا هەیە، کە دەرهەق بە ئایەت و فەمایشتی خوای گەورە

**دەکرێت، کوفرەو دەبیسترێت! یان کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ۝٦٥ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ﴾ التوبة/٦٥-٦٦واتە: بڵێ: چما ئێوە گاڵتەتان بەخواو بەئایەت و فەرمایشت و بە پێغەمبەرەکەی دەکرد؟! پۆزش مەهێننەوە، تازە ئێوە بە تەئکید دوای باوەڕ هێنانەکەتان کافربونەتەوە، ئەگەر لە هەندێکیشتان خۆش ببین، دەستەیەکی ترتان هەر دەخەینە ژێر سزای بەژانی خۆمانەوە لەبەر ئەوەی، کە تاوانبارن.. ( الفصل في الملل و الاهواء و النحل ٤/٢٠٤). ئەمە فەرمایشتی خوای گەورەیە، کە ئەوە راشکاوانە رون دەکاتەوە، کە گاڵتەکردن بە خوای گەورە، یان بە ئایەت و فەرمایشتەکانی، یان بە پێغەمبەرێك لە نێرراوەکانی کافربونێکە، کە خاوەنەکەی لە دین و ئوممەت دەباتە دەرەوە، خۆ خوای گەورە نەیفەرمو: بەڵێ دەزانم، کە لە دڵ و دەرونتاندا کوفرێك هەیە!! بەڵکو هەر بە گاڵتەکردنەکەیان بە کافری ناساندن، گاڵتەکردنەکەی کردە مایەی حوکمەکەی، ئیدی هەر کەسێك غەیری ئەمە بڵێت، ئەوە قسەی بە دەم خواوە هەڵبەستوە لەوەی، کە ئەو نەیفەرموە، ئەمەش یەعنی درۆکردن بە ناوی خوای گەورەوە.. (ابن حزم: الفصل في الملل و الاهواء والنحل ٤/٢٠٤) ..**

**ئینجا لە هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٤/٢١٨-٢٢٠دا نمونەیەك لەسەر ئەوە دێنێتەوە، کە جەهمی و ئەشعەری و ئەوی بۆچونی ئەوانی گرتۆتە بەر دەیڵێن، ئیبنوحەزم دەڵێ: (ئەمە وەکو ئەوە وایە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بفەرموێ: کەس ئەمڕۆ غەیری کافر ناچێتە ناو ئەو خانووەوە، یان هەر کەس ئەمڕۆ بچێتە ناو ئەو خانووەوە، کافرە.. ئەوانە (مەبەستی لە مورجیئەو هاوبیریانیانە) دەڵێن: ئەوی دەچێتە ئەو خانووەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە باوەڕی وایە کافرە، نەك بە خودی چونە خانووەکەوە کافر ببێت..**

ئەبومحمد (ئیبنو حەزمەو مەبەستی لە خۆیەتی): دەڵێ: ئەمە درۆو دەلەسەیەو پەردەپۆش کردنێکی لاوازانەیە، چونکە هەر خودی چونە ژورەوەی ئەو خانوە لەو رۆژەدا کافر بونێکی رۆشن و راشکاوانەیە، لەوانەیە ئەو کەسەی دەچێتە خانوەکەوە فەرمایشتی خواو پێغەمبەرەکەی بە راست بزانێت و ئیماندار بێت، بەڵام هەر بە چونە ژورەوەکەی، هەمو کاروکردەوەکانی پوچەڵ دەبێتەوە! خۆ دوو موسوڵمان لەسەر ئەوە را جویێ نابن، کە چونەژورەوەی ئەو خانوە جائیز نیە، نە بۆ عائیشە، یان ئەبوبەکر، یان عەلی، یان هەر یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم و، نە بۆ هەر یاوەرێکی ترخوا لە هەمویان رازی بێت، ئەوانەی، کە خوای گەورە دەرهەقیان فەرمویەتی، کە خوا زانایە بەوەی لە دڵ و دەرونیاندا هەیە (لە باوەڕو تەقوا) بۆیە هێمنی و سوکنایی خۆی بۆ ناردنە خوارەوە.. باشە لەگەڵ ئەم باوەڕو پلەوپایەیاندا، ئەگەر هەر یەکێك لەو بەرێزانە لەو رۆژەدا بچێتە ئەو ژورەوە، گومانی تێدا نیە کافر دەبن، گومانیش لەوەدا نیە، کە بە چونەژوورەوەکە کافر دەبن، نەك بەوەی پێشتر کافر بوبن و چونە ژوورەوەی ئەو رۆژەیان بوبێتە نیشانەو بەڵگەی کوفرێك، کە پێشتر لە ناخیاندا هەبوبێت!! ئەگەر مورجیئەو هاوبیرەکانیشیان پێمان دەڵێن بە چونە ژورەوەی ئەو بەرێزانە بۆ ئەو خانوە لەو رۆژەدا کافر نابن، ئەوە خۆیان بەو قسەیە کافر دەبن، چونکە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم بە درۆ دەخەنەوە، کە فەرموی هەر کەس ئەمڕۆ بچێتە ئەو خانوەوە کافرە.. ئەدی کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾الحجرات/٢ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا صلی اللە عایە وسلم بەرز مەکەنەوە، بەو شێوە زەقەش لەگەڵیدا مەدوێن، کە لە ناو خۆتاندا دەدوێن، نەبادا کاروکردەوەکانتان پوچەڵ ببێتەوەو مایەپوت ببن، بێ ئەوەی خۆتان هەستی پێ بکەن.. خۆ ئەمە دەقێکی رۆشن ورونەو بە موسوڵمانان دەفەرموێ،

کە کاروکردەوەکانتان هەر هەموی هەڵدەوەشێتەوەو مایەپوت دەبن، بە چی؟ هەر بە دەنگ بەرز کردنەوەکەیان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم، بێ ئەوەی نکوڵی لە هیچ فەرمان و ئاڕاستەیەکی بکەن، بێ ئەوەی لە هیچ فەرمانێکی راڕا بوبن، گەر راڕا بونایە هەست پێ دەکرا، یان خوای گەورە بۆی رون دەکردینەوە، بەڵام خوای گەورە بە راشکاوی دەفەرموێ: ﴿ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾ کاروکردەوەکانتان پوچەڵ ببێتەوەو مایەپوت ببن، بێ ئەوەی خۆتان هەستی پێ بکەن.. کەوابو لەمەوە دەردەکەوێت، کە هەندێك کاروکردار هەیە، کە بە ئەندامانی لەش ئەنجام دەدرێت دەبنە کوفرو مایەی کافر بونی ئەنجامدەرانیان، هەر وەکو کە کاروکرداری واش هەیە نابێتە کوفرو مایەی کافر بون، ئەویش هەر بە پێی حوکمی خوای گەورەیە..

ئیمامی ئیبنوتەیمیە رحمەالله بەرپەرچی ئەو کەسانە بە توندی دەداتەوە، کە پێیان وایە کافربون نایەتە دی، تا لە ناخی دڵ و دەروندا کوفرەکەی نەچەسپێت!!! هەمو ئەو تێگەیشتنە ئاڵۆزە ئیرجائییە رەت دەکاتەوە کە لێڵ لەو ئایەتە حاڵی بون کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا ﴾ النحل/١٠٦، واتە: ئەو کەسەی دوای باوەڕهێنانی کە کافر دەبێتەوە، بەڵام دڵی هەر پڕ باوەڕەو دڵنیایە (ئەوە هیچی لەسەر نیە) مەگەر ئەو کەسەی، کە سینەی بە کافربونەوەکەی گوشاد ببێت وخۆشیی لێ ببینێت..

ئیمامی ئیبنوتەیمیە لە (مجموع الفتاوى) کەیدا دەڵێ: (ئەگەر وا بوایە، کە کەس بە گوفتاری کوفرین کافر نەبوایە، تا لە ناخیدا قەناعەتی دڵیشی لەگەڵدا نەبوایە خۆشحاڵ نەبوایە پێی، نەدەبو کەسی ناچار کراو لەسەر کوفر نواندن عەفو کرایە.. بەڵام مادام ئەو عەفو کراوە ئەوە دەردەکەوێت، کە هەر کەسێك کوفری لێ دەرکەوت و ناچار نەکرابو، حەتمەن حوکمی ئەوەی

بەسەردا دەدرێت، کە لە ناخیدا بە کوفر کردنەکەی خۆشحاڵە.. ئەمەش حوکمە نەك بەستنەوە..

ئەوەی ئیبنوتەیمییە رحمەاللە رونی دەکاتەوە ئەوەیە، کە مەبەست لە کوفر کردنی ناچار کراو ئەوەیە کە قەناعەتی ناخی لەگەڵدا نیە، چونکە کەس لەسەر ئەوە ناچار ناکرێت.. بۆیە نەیفەرمو ئەوی کوفرێکی کردو قەناعەتیشی وابو، چونکە باسی لە ناچار کراو کرد، ناچار کراویش لەسەر دەربڕینی کوفر ناچار کراوە، نەك لەسەر ئەوەی لە ناخیدا دەتوانێت بیشارێتەوە..

لەمەوە دەردەکەوێت، کە ئەو کەسەی وشەیەکی کوفری دەربڕی، دەکەوێتە بەر غەزەبی خواو حەتمەن سزای سەخت چاوەڕێیەتی، گومانیشی تێدا نیە، کە پێی کافر دەبێت.. مەگەر کەسێك، کە ناچار کرابێت کوفرێك بکات، بەڵام لە ناخیدا هەر موسوڵمان بێت و قەناعەتی ناخی خۆی هەر ئیماندارانە مابێت.. ئەگەر وا نەما، حەتمەن ئەویش بە کافر حسێب دەکرێت، چونکە ئەوەی لە حوکمی کافر بونەکەی پاراستبوی ئەوە بو، کە لە ناخیدا ئیماندار ماوە، بەڵام ئەگەر ئەوەشی نەما، ئیتر حەتمەن کوفرکردنەکەی دەبێتە بەڵگەی بەکافر دانانی.. هەر ئەم مەبەستەشە لەو ئایەتەدا، کە خوای گەورە فەرمویَ: ﴿ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ ﴾ التوبة/٦٦، واتە: تازە ئێوە بە تەئکید دوای باوەڕ هێنانەکەتان کافر بونەتەوە.. خوای گەورە ئەوەی بەم ئایەتە بۆ رون کردنەوە کە ئێوە هەر بەوەندەی کوفرەکەتان بە دەمدا هاتوە کافر بون، ئەگەرچی لە ناخی خۆتاندا باوەڕتان وا نەبوە! ئەمەش تەوەرەباسێکی توڵانیە.. (ابن تيمية: الصارم المسلول ل ٥٢٤).

ئینجا، کە بەرپەرچی ئەو کەسانەش دەداتەوە، کە پێیان وایە ئەوانەی، کە گاڵتەیان بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کردوە دوورو بون! بۆیە لەبەر ئەوە بە کافری ناساندون نەك لەبەر ئەوەی گاڵتەیان بە خواو

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كردوه[1]! دەفەرموێ: خوای گەورە هەواڵی ئەوەیدا، كە ئەوانە دوای ئەوەی باوەڕیان هێنابو، كافر بونەوە، هەرچەندە بە زوبانیش هەر هاوار دەكەن و دەڵێن، ئێمە ئیعتیقادمان وا نەبوە، هەر سوعبەتمان دەكرد.. (ابن تیمیة: مجموع الفتاوی ٧/١٤٠)..

هەروەها دەڵێ: ئەمە ئەوەش نیشان دەدات، كە ئەوانە بەلای خۆیانەوە شتێكیان نەكردوە، كە مایەی كافربونیان بوبێت! هەر وایان دەزانی ئەوەی وتویانە نابێتە هۆی كافربونیان، بەڵام خوای گەورە بۆی رون كردنەوە، كە گاڵتە كردن بە خواو بە پێغەمبەرەكەی و بە قورئانەكەی كوفرەو خاوەنەكەی لە ئیسلام پێ دەچێتە دەرەوە! ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوان باوەڕێكی لاوازیان هەبو، ئەم كردارە حەرامەشیان ئەنجامدا، كە دەشیان زانی حەرامە، بەڵام نەیاندەزانی مایەی كافر بونە، بەڵام حوكمی كافرێتیان بە هۆیەوە بەسەردا درا...(ابن تیمیة: الایمان ل ٢٦٧).

ئەمە خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، كە هەر كەسێك گاڵتەی بە خواو بە پێغەمبەرەكەی صلی الله علیه وسلم كرد، یان جنێوی پێدان، نەزانینی بۆ نابێتە بەهانەی كافر نەبونی، چونكە ئەسڵ ئەوەیە، كە هەمو كەسێك دەبێت هەر كەس شایەتمانی هێناو موسوڵمان بو، ئەوە بزانێت، كە خوای گەورەو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەبێت زۆر بەڕێزەوە ناوببرێن..

ئیبنوتەیمیە لە شوێنێكی تریشدا دەڵێ: لەبەر ئەوەیە، كە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ﴾ التوبة/٦٦، واتە: تازە ئێوە بە تەئكید دوای باوەڕ هێنانەكەتان كافر بونەتەوە، نەیفەرمو: درۆتان كرد وا نیە وەكو دەڵێن هەر سوعبەتمان دەكرد. بەڵكو ئەوەی بۆ سەلماندن، كە دوای

---

١ـ بڕوانە ئەمە هەر ئەو قسەیەیە، كە محمد شەقرە بە ئامادەبوونی شێخی ئەلبانی رحمە الله بە سامی ووت، گوێ بگرە لەشریتی (ثلاث مسائل مهمة/ سلسلة الهدی والنور ژمارە ١/٨٢١)

موسوڵمان بونیان بەو سوعبەت و گاڵتەو گەپەی بە خواو پێغەمبەری خوایان صلى الله عليه وسلم کرد کافربون.. (ابن تيمية / الصارم المسلول ل ٥١٧) .

شێخ سولەیمانی کوڕی عبداللەی کوڕی ئیمام محمد بن عبدالوهاب رحمهم الله، کە یەکێکە لە زانایانی ناوداری نەجد پێی وایە، کە کافر بون دەشێت هەر بە ئەنجامدانی کردار بێت بێ ئەوەی لەگەڵدابونی بێ باوەڕی ناخی بۆ بکرێتە مەرج، بە پێچەوانەی جەهمیەکان و ئەوانەی وەکو ئەوانن، کە پێیان وایە ئیعتیقادی دڵ بە کاتی دەرکەوتنی رەفتار، یان گوفتاری کوفرینەوە مەرجە بۆ کافر بونی.. ئەو دەفەرموێ: کە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ النحل، واتە: ئەو کەسەی دوای باوەڕ هێنانی، کە کافر دەبێتەوە، بەڵام دڵی هەر پڕ باوەڕەو دڵنیایە (ئەوە هیچی لەسەر نیە) مەگەر ئەو کەسەی، کە سینەی بە کافربونەوەکەی گوشاد ببێت وخۆشیی لێ ببینێت، ئەوە حەتمەن بەر غەزەبی خوا دەکەوێت و سزایەکی زۆر بە ژانی دەبێت. چونکە ئەوانە ژیانی دنیایان پێ چاکتر بوە لە رۆژی دوایی، خوای گەورە رێنمایی کافران ناکات.. خوای گەورە بەم ئایەتانە حوکمی خۆی داوە و قابیلی گۆڕین نیە، هەر کەس لە دینەکەی پاشگەز بێتەوەو کوفرێك بکات، کافرە، ئینجا ئیتر ئەو بۆ خۆی ترسی کردوە بە بیانو، یان خەمی ژن ومنداڵ وکەسوکار! جا ئەو کوفرەشی لە ناخیدا هەڵگرتبێت یان بە ئاشکرا لێوەی دەرکەوتبێت، هەروەها بە گوفتار کوفرەکەی وتوە، یان بە کردارێك ئەنجامی داوە، یان بە هەردووکیان، بە ئومێدی تەماعی دنیا کردوێتی، یان بە ئومێدی نزیك بونەوەی لە کافران، بە هەرچیەکی بێت لە دیارو نادیاریدا هەر پێی کافر

دەبێت، مەگەر ناچار کرابێت لەسەر ئەنجامدانی ئەو کوفرەی، وەکو ئەوەی کەسێکی موسوڵمان بکەوێتە بەر دەستی کافران و لێی دەن و ئەشکەنجەی بدەن و بڵێن، ئەگەر کوفرێك نەکەیت دەتکوژین، ئەویش بۆ خۆرزگارکردنی بۆی جائیزە سەرزارەکی بە قسەیان بکات، بەو مەرجەی لە ناخیدا خاوەن باوەڕی پتەو مابێت، ئەگەر لە ناخیدا چوەسەر داواکەیان ئەوە حەتمەن کافرە، با ناچاری کوفرەکەش کرابێت.. (سليمان بن عبدالله بن محمد بن عبدالوهاب: حكم موالاة أهل الاشراك/مجموعة التوحيد ١/ ٣٠٩).

شەهروستانی دەرهەق مورجیئەکان دەڵێ: هەر کەسێك پێغەمبەرێك بکوژێت، یان لێیدا، پێی کافر دەبێت، نەك لەبەر خودی کوشتن، یان لێدانەکەی بەڵکو لەبەر سوکایەتی کردن و دوژمنداریێتی و بوغزاندنەکەی، ئەمەش رای ئیبنوڕاوەندی و بیشر المريسي (عەلیل حەلەبی ئەم زەمانەی ئێمەو) ئەوانەیە، کە لەگەڵیاندا هاوبیرن، چونکە ئەوانە دەڵێن باوەڕ: بریتیە لە بە راست زانین لە دڵ و ئیقرار کردن بە زوبانە، کوفریش: بریتیە لە بێ باوەڕی ناخ و نکوڵی کردنی سەرزارەکی.. سوجدەبردن بۆ خۆر، یان بۆ مانگ، یان بۆ بتێك لای ئەوان خۆی لە خۆیدا کوفر نیە، بەڵکو نیشانەی هەبونی کوفرە.. (الشهرستاني: الملل و النحل کە لە داوێنی کتێبی الفصل ي ئیبنو حەزمدایە٣/١٩٢) ..

* پوختەی قسان ئەوەیە، کە (سەلەفی)ەکان وا نابینن، کە کوفر بەکردار کەس لە دین و میللەت بباتە دەرەوە! مەگەر لە ناخ و دڵ و دەرونیشیدا وابێت و ئەو کارە کوفرینەی بە حەڵاڵ زانیبێت، ئەمەش مەرجێکی داهێنراوەو بیدعەیەو پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، کە هەر لە جەهمیەکانەوە بۆیان ماوەتەوە بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەش، بەڵگەی زۆرمان هێنایەوە، کە گومانی ڕاڕایان بنبڕ دەکات..

ئەگەر ئەمەمان لا چەسپیوە، ئیدی کاتی ئەوەیە بەری پێنوس ئازادکەین بۆ ئەو خاڵە بیدعیە سەیرەی شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی وروژاندوێتی، کە باوەڕی بە شێوەیەکی وا دابەش کردوە، کە کەس پێش ئەو نەیکردوە! کە بە حەڵاڵ زانینیکردار کوفرینەکەی کردۆتە مەرجی بە کافر دانان! هەر لەبەر ئەمەشە دەبینیت، کە سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی، خۆشحاڵن بە عەقیدەی ئیرجاو!!

کەوابو لێرەدا دوو خاڵ هەن کە نابێت تێکەڵ کرێن:

یەکەم: مانای بە حەڵاڵزانین لای سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی و پەیوەندی بە کێشەی (شەرع لادان و هێنانی یاسا لە شوێنی)!

دووەم: ناچاربونی سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی بۆ وەرگرتنی مەزهەبی جەهمیەکان، تا بتوانن ئەو واقیعە بشەرعێنن و بە دواشیدا ئەو شێوازی کارکردنەی خۆیان بە شەرعی بدەنە قەڵەم، کە گوایە تەنها باس لە (زانست و فێرخوازیی) بکەن بەسە بۆ هێنانەوەی ئیسلام و، تا بەرامبەرە نەیارەکانی خۆیان بە ناشەرعیی بدەنە قەڵەم و بە گومڕاو خەواریجیان وەسف بکەن !!

جا بۆیە پشت بە خوای گەورە دەڵێم:

ئەوە بزانە، کە (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی) لە مەسەلەی بە حەڵاڵ زانین و گۆڕینی شەرعدا مەزهەبێکی نوێیان هەیە، کە پێش ئەوان نە سوننی و نە ئەهلی بیدعە شتی وای نەوتوە!! ئەوان وەکو ئەهلی سوننەت و جەماعەت نین، تا ئەو کەسە بە کافر دابنێن، کە گوناهی موفەسسیقە بە حەڵاڵ دەزانێت، یا خاوەن گوناهی موکەففیرە بە کافر بزانن بێ ئەوەی حەڵاڵ زانین بکەنە هاوڕێی گوناهە موکەففیرەکەی! بەڵکو باز

بەسەر هەمو ئەوانەدا دەدەن و بەحەلاڵ زانینەکە دەکەنەوە مەرجی گوناهە موکەففیرەکە !!

(سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان و پاڵانتەوانانی سەلەفی) هەر بەوە کابرا بە کافر دانانێن، کە بە گوفتار، یان بە نوسین، یان شەراب خواردنەوەی بە حەلاڵ زانیوە، ئەگەر بەربەستێکی شەرعی رێ لە بەکافردانانی نەگرێت، هەر بەوەندەوە ناوەستن، کە پێیان ئاساییە کە کابراکرداری کوفرینی بە گوفتارو کردار ئەنجامداوە! بەڵکو دەڵێن: هەر دەبێ کابرا ئیعتیراف بەوەش بکات، کە لە دڵیشیدا قەناعەتی بەو کوفرە هەیە !!

شێخی ئەلبانی لە دوای هێنانەوەی دەقی قسەی ئەبو جەعفەری تەحاوی، کە دەڵێت (لا نُكَفِّرُ أحَداً مِنْ أهْلِ القِبْلَةِ بِذَنْبٍ ما لَمْ يَسْتَحِلُّهُ) واتە: کەس لەوانەی ڕو لە قیبلە دەکەن بە کافر دانانێین هەر بەوەندەی گوناهێکی کردوە، بەو مەرجەی ئەو گوناهەی بە حەلاڵ نەزانیبێت.. دوای ئەمە شێخی ئەلبانی دەڵێ: (یەعنی لە دڵ و ناخیدا بە حەلاڵی نەزانیبێت)!! (الالبانی: نوسینەکەی لەسەر دەقی العقیدة الطحاویة کە لە پەڕاوێزی لاپەڕە ٦٠ دایە).. ئەمەی هەر لەبەر خاتری ئەوەیە، کە ئەو کەسەی، کە لەلای ئەهلی سوننەت بە ئەنجامدانی گوناهی موکەففیرە، یان بە حەلاڵدانانی گوناهی موفەسسیقە کافر بوە، ئەمان نەهێڵن بە کافر حسێب بکرێت، با بە گوفتارو نوسینیش ئەوەی بە حەلاڵ ناساندبێت، کە خوای گەورە بە حەرامی ناساندوە!!

ئا لەم قڵیشەوەیە، کە ئەو کەسە لای ئەمان بە کافر حسێب ناکرێت، کە یاسایەکی پێچەوانەی شەرع دارشتوەو (بە زانین یا نەزانین) کردوێتی بە بڕیارێکی خورتی و خەڵکی ناچاری وەرگرتنی دەکات!! چونکە ئەم سەلەفیانە بەم گۆڕانکاریە دژوارە ئەو کەسەی، کە ئەو یاسا پێچەوانەی شەرعی دارشتوە وەك ئەو کەسە لێ دەکەن کە دزی کردوە، یان شەرابی خواردۆتەوە!! هەمویان

هەر وا دەناسێنن کە کردەوەکانیان بە حەڵاڵ زانیوە، بەڵام ئەمە لە دین و میللەت نایانباتە دەرەوە! (الالباني: التحذير لا ٧١)[١] !

جیاوازی نێوان دوو پێناسەکە زۆر لەوە زیاترە بژمێررێت! بەڵام (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەف) بەو دەستەواژە چەواشەکارییانە دیدی خەڵکەکە لێڵ دەکەن! چونکە دەڵێن ئەو کەسەی، کە ئەو یاساو ڕێسا پێچەوانەی شەرعی دارشتوە مەرجە دەبێت هاوار کات، کە لە ناخی دڵ و دەرونیشیەوە قەناعەتی وایە، کە ئەوەی خۆی راستەو ئەوەی خوای گەورە چەوتە!! نەعوزو بیللا!!

جا تۆ سەیری دەستەواژەکەی ئەلبانی بکەرەوە، کە هەمویان ناو دەنێت بە حەلالزانی سەرپێچیەکەی، لە کاتێکدا لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوە ئاشکرایە، کە بە شەراب خۆر ناوترێت بە حەڵاڵی زانیوە!! مەگەر خۆی بە ئاشکرا وا بڵێت، یان دەقێکی وا بنوسێت، کە بڵێ شەراب، خواردنەوەکە بە حەڵاڵ دەزانم، ئەو کاتە پێی دەوترێت بە حەڵاڵزانی شەراب نەك هەر بە خواردنەوەی.. ئەگەر وای وت یان نوسی ئەوە حوکمەکەی دەگۆڕێت - هەر وەکو کە عوسمانی کوڕی مەزعون و هاوڕێکانی، کە شەرابیان خواردبۆوەو پێیان وابو بۆیان جائیزە داوای تۆبەیان لێکرا، تا ئەوە رون بکرێتەوە کە ئایا بە حەڵاڵیان زانیوەو خواردویانەتەوە، یان زانیویانە، کە حەرامەو

---

١ـ دوای ئا ئەمەی ناوی ناوە: بەحەلالزانینی کردەوەیی! وای داناوە، کە ئەو کەسانە بە کافر دانانرێن، تا بەلگەیەکمان چنگ نەکەوێت، کە ئا ئەوەی وا لە دڵیاندا ئەوەیە، کە باوەڕیان وایە، کە ئەوە بە حەرام دانانێن، کە خواو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە حەرامیان زانیووە، ئەگەر ئا ئەم سەرپێچیە دڵییەمان بە بەلگە بۆ روون بۆوە، ئەو کاتە حوکمیان دەدەین بەسەردا، کە کافرن و کوفرەکەشیان هەلگەڕانەوەیە لە دین ..

هەروەها بڕوانە قسەی حەلەبی لە صیحة ل ٤٢، کە پێشتر هێنامانەوە، کە دەربارەی شەرع گۆڕین و دەرکردنی یاساو ڕێسای پێچەوانەی شەرعی خوا ووتی : گۆڕینی شەرع بەلگەیە لەسەر کوفر، بەڵام بەو مەرجەی لە تلخەوە ئەوەی لەگەڵدا بێت، کە خاوەنەکەی باوەڕی والێت، کە بۆی هەیە حەرام حەڵاڵ بکات و حەڵاڵ حەرام بکات.. لەلاپەڕەکانی داهاتوودا باسی ئەمە دەکەینەوە. ان شاء الله.

خواردويانەتەوە، چونكە حوكمى شەرع دەربارەى هەر يەك لە وەلامەكەيان جياواز بو، سەيدنا عومەرى مۆلەتى پێداچونەوەو موناقەشەكردنى دانێ، گوتى ئەگەر بە حەلالّيان زانيبێت حوكمى پاشگەزبۆوە (مورتەدد) يان بەسەردا دەدەم، كە كوشتنيانە، ئەگەر بە حەراميشيان زانيبێت و خواردبێتيانەوە حوكمى فاسقيان دەدەم و جەلدەيان لێ دەدەم.. چونكە ئەو كەسەى گوفتارێك، يان كردارێكى كوفرينى واى لێ دەردەكەوێت، پێويستە بوارى تۆبەى بدرێت و هەل و كاتى موناقەشە كردنى بۆچونەكەى بۆ برەخسێت، تا ئەو لەمپەرانەى لە رێدا نەمێنن، ئەو جا ئەگەر هەر لە هەلۆێستەكەى خۆى نەگەڕايەوە حوكمى كافر بونى دەدرێت وچى پێويست كرد بۆراپەڕاندنى حوكمەكەى دەگيررێتە بەر..

ئەگەر ئەمەت بۆ رون بۆوە، ئەو نامۆگەرييەت لا ئاشكرا دەبێت، كە ئەو (سەلەفى) انە گرتويانەتە بەر، كە دەڵێن دز، يان شەراب خۆر، هەر بە گوناح كردنەكەى ديارە بە عەمەلى بە حەلالّى زانيوە، بۆيە ئەمەش دەڵێن، تا هەنجەتێك بۆ ئەوانە بدۆزنەوە، كە بە ياسا كوفريەكانيان شەريعەتى خوا دەگۆڕن وحەلاّل حەرام و، حەرام حەلاّلّ دەكەن! دە ديقەت بدە ئەونياز پيسى و رێ بزر كردنە!!

ئەوە رون كردنەوەى ناوێت، كە گۆڕينى شەريعەتى خواو بە حەلالّ دانانى حەرامى شەرع و بە حەرام دانانى حەلالّى شەرع وەك دەشێت بە قسەو گوفتار بێت، دەشێت بە رێگايەكى ترى پێوە پابەند كردنى ديكەش بێت، وەكو لەوانەى لە ئوسولّى فيقهدا باس كراون. وەكو ئەوەى بوترێت ئەمەى پێچەوانەى شەريعەتى خوايەو لە ئيسلامدا سزاى هەيە لاى ئەمانە نەيبێت!! يان هەيبێت، بەلام ئەو سزايە نەبێت، كە خواى گەورە بۆى ديارى كردوە! يان بێدەنگ بون لە تاوانێك و سزاكەى، كە شەرع ديارى كردوە! وەكو ئەمەش لە ياساى ولاتاندا دەبينرێت، كە شتى وا هەيە خواى گەورە بە حەلالّى داناوە، يان فەرزى كردوە، كەچى لاى ئەمان وا نيە! سەلەفيەكانى بەر سێبەرو

مەدخەلیەکان و پاڵانتەوانانی سەلەفیش دەڵێن: دەڵێ کابرای شەرع گۆڕ خۆی هاوار بکات، کە لە ناخی خۆشیدا باوەڕی وایە، کە بۆی هەیە پێچەوانەی شەرعی خوا یاساو ڕێسای دیکە دابڕێژێت! یەعنی ئەوەی بە زمان یان بە کردوە دەری بڕیوە، کە بۆی هەیە پێچەوانەی شەرع یاسا داڕێژێت مەرجە، کە لە ناخیشیدا ئەو ئیعتیقادەی هەبێت، دەنا حوکمی کافر بونی نادرێت! چونکە لای سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەف تەنانەت بۆ دژایەتی شەرعەکەی خوا بەو شێوەیەش هەر دەڵێن: مەرجە، کە (کوفری دڵ و ناخ هەبێت)! ئەمەش حاشا هەڵنەگرە، کە لە لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت هەر کەسێك یاسایەکی پێچەوانەی شەریعەتی خوایی دارشت بێ گوێدانە ناخی کارەکەی بە کوفر دادەنرێت..

گومان لەوەدا نیە، کە بەحەڵاڵزانین، یان گۆڕین لە ناخدایەو باوەڕێکی دڵ و دەرونە، چونکە خراپی زاهیریی، بەڵگەیە لەسەر خراپی و بەدی ناخ.. بەڵام ئەوەیە، کە ئەحکامە شەرعیەکان (وەکو حوکمی کافردانی کەسێك) پەیوەستە بە زاهیری خەڵکیەوە نەك هەڵدانەوەی ناخی.. کەسێك حوکمی کافر بونی بەسەردا دەدرێت، کە گوفتارێك، یان ڕەفتارێکی کوفرینی لێ دەرکەوتبێت و بەهانەیەك نەبێت بەرگریی حوکمدانی بکات، وەکو نەزانین وهەڵەو ناچاربون و ئەوانە.. کەسێك شتێك کە کۆڕای ئوممەتی لەسەرە، کە حەرامە ئەو بە حەڵاڵی بزانێت، یان شتێك کە کۆڕای ئوممەتی لەسەرە، کە حەڵاڵەو ئەو بە حەرامی بزانێت، ئەوە بە کۆڕا کافر بوە، ئیدی ئەوە کاریگەریی نابێت، کە ئایا باوەڕی وایە، یان هەر بە قسە وا دەڵێ! ئەوە ڕای هەندێك لە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، کە دیدو هەڵوێستی (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان و پاڵانتەوانانی سەلەف) وەك لۆکەی شیی کراوە سوك دەکات و بەربای دەدات:

ئیمامی ئیبنوحەزم بە شێوازو وتەیەکی ڕۆشن و ڕاشکاو حەقیقەتی بەحەڵاڵزانین وبەحەرامزانینی غەیری خوای پەروەردگار جوان ڕون دەکاتەوە،

**کە هەر دەڵێی لاف و گەزافی (سەلەفی) ەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە رەت دەکاتەوە، کە پێیان وایە بەحەڵاڵزنین و بەحەرامزانین، جگە لە لایەنی خوای گەورەوە بەو مەرجەی لە دڵ و دەروندا بە رەوا نەزانرابێت، ناچێتە ریزی کوفری گەورەی واوە، کە بکەرەکەی لە دین و ئوممەت بباتە دەرەوە! چونکە کوفرەکەی کوفری کردەوەیە!! گوێ بدەیە چی دەڵێ:**

**خوای گەورە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٌ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ التوبة/٣٧ واتە: ئەو یاسای گۆڕینەی نەسیئە[١] زیادەی کافر بونە، کە کافرەکان خۆی پێ گومڕا دەکەن، کە ساڵێك حەڵاڵی دەکەن و ساڵێك حەرام، تا بیخەنە ئەو کاتانەوە، کە خوا تێیدا حەرام کردوە، تا حەڵاڵی کەن! ئەمانە ئەو هەڵوێستەیان بۆ جوان کراوە، تا بیگرنەبەر! خواش بە تەئکید رێنمایی قەومی کافرات ناکات.. زمانەوانانی قورئانی لەسەر ئەوەن، کە زیادەی شتێك حەتمەن هەر لە توخمی خۆیەتی، نەك لە توخمێکی دیکە، کەوابو نەسی و، کە کردومیەکە کوفرە، کە بریتیە لە بەحەڵاڵزانینی ئەوەی، کە خوای گەورە بە حەرامی ناساندوە، هەر کەسێکیش یاسای وا دەرکات، یان پێی رازی بێت، یان داوەری بباتە لا حەتمەن بەو کارەی کافر دەبێت.. ئەمە بۆ هەمو شتێکی دیکە هەر وایە.. یەعنی هەر کەسێك شتێك، کە خوای گەورە بە حەڵاڵی زانیبێت و ئەو بە حەرامی بزانێت، یان خوای گەورە بە حەرامی زانیبێت و ئەو بە**

---

١- عەرەبەکانی سەردەمی پێش ئیسلام یاسایەکیان هەبو، کە لە مانگە حەرامەکاندا جەنگ نەکەن، بەڵام کە بەرژەوەندیی سەرۆکەکانیان تێك دەگیراو جەنگیان پێ پەسەندتر دەبوو، شەڕ نەکردنەکەیان دەگواستەوە بۆ مانگێکی دیکە! ئەمە پێی دەوترا نەسیء، خوای گەورەش ئەمەی بە یاسا داڕشتنی پێچەوانەی شەرعی خۆی حسێب کردوە، بۆیە بە کوفری ناساندووە. تێگەیشتن لەمە گرنگە چونکە مەسەلەیەکی ئوسوڵییە ..

حەلاَلی زانیبێت، کافر دەبێت.. چونکە خوای گەورە رێی بە هیچ کەسێك نەداوە حەلاَلکراوانی ئەو حەرام کات، یان حەلاَلْ کراوانی حەرام کات).. ئیبنوحەزم (الفِصَل في المِلَل والاهواء والنِحَل ب٣/ ٢٠٤) ..

شێخولئیسلام ئیمامی ئیبنوتەیمیییە زۆر جەخت لەوە دەکاتەوە، کە بەحەلاَلْزانین و بەحەرامزانین بەکردار دەبن[١]، بەوەش دەبن، کە خەلْکی پێوە پابەند بکرێت، بێ ئەوەی تەماشای ناخ و ئیعتیقادی بکەرەکانیان بکرێت، بۆیە دەلْێ: فەرز کردن و حەرام کردن مافی غەیری خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم نیە، بۆیە هەر کەسێك سزای یەکێك لەسەرکرداریك کە کردویَتی، یان دەبو بیکات و نەیکردبو، بە کەیفی خۆی دا (یەعنی کردبوی بە یاسایەك، کە خەلْکی بیگرنە بەر) ئەوە یاسایەکی دیکەی غەیری شەریعەتی خوای داناوەو راپەڕاندوە، بەمەش خۆی کردوە بە شەریکی خوای گەورەو، خۆی خستۆتە ریزی پێغەمبەری پێشەواوە صلی الله علیه وسلم! بەمەش دەچێتە ریزی ئەو موشریکانەوە، کە شەریکیان بۆ خوا بڕیار دەداو دەیانپەرستن، هەروەها وا لە ریزی ئەو مورتەددانەدا، کە باوەڕیان بە موسەیلەمەی کەززاب هێنابو، ئەو ئایەتەش دەیانگرێتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَـٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ﴾الشوری/٢١ واتە: دیارە شەریکی وایان هەیە، کە بۆ خوای گەورەیان داناوە، کە یاساو رێسایەك دەردەکەن، کە خوای گەورە رێی پێ نەداون. (ئیبنو تەیمیە: مجموع الفتاوی ١٤/٥)..

---

١ ئیبنو عوسێمین لە کتێبەکەیدا (المجموع الثمین ٣٧/١) و لە (شرح أصول الثلاثة) دا ئیعتیراف بەوە دەکات، کە ئەمە کردەوەیەو پێشی کافر دەبێت! کەچی کە عەلیل حەلەبی لە هاوراەکەیدا (الصیحە ل ٦٢) نیوەی قسەکەی ئیبنوعوسێمینی هێناوەتەوەو باقی قسەکانی خستۆتە کەنارەوە، تا حوکمی کافرکردنی ئەو رێسا گۆڕەرانەی نەکەوێتە سەر! !

ئیمامی ئیبنوحەزم رحمەتی خوای لێ بێت ئەوەی باسکرد، کە تەنها رمئی دان بەوەی، کە حەلاڵێك حەرام بکرێت، ئەوە یاساداناني پێچەوانەی شەریعەتەکەی خوایە و کافربونە.. ریوایەتی فەرمودەی بە سەنەدەوە گەیاندۆتەوە بە جەحادەی کوڕی دەسار، کە کەسانێك لە یاوەرانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە شام شەرابیان خواردبۆوە، یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان نامەیەکی دەرهەقیان بۆ خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی رازی بێت نوسی، کە ئەمانە شەرابیان خواردۆتەوەو بە حەلاڵیشیان زانیوە بەلگەیەکیش، کە هێناویانەتەوە ئەو ئایەتەیە، کە خوای گەورە تێیدا دەفەرموێ: ﴿ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ ﴾ المائـدة/٩٣ واتە: ئەو کەسانەی، کە باوەڕیان هێناوەوکرداری چاکەیان کردوە، ئەگەر تەقوای خوایان هەبێت و باوەڕیان قایم بێت، هەرچی شتێك بخۆن و بخۆنەوە هیچ زیانێکیان پێ ناگەیێنێت.. سەیدنا عومەریش راوێژی بەو یاوەرانە کرد، کە لەدەوروبەری بون، بە عەلی کوڕی ئەبو تالیبی خوا لێی رازی بێت فەرمو: مەسەلەکەیان چۆن دەبینیت؟ سەیدنا عەلی گوتی: وا دەبینم ئەمانە یاسایەکی تریان بۆ خۆیان داڕشتوەو شتێکی دیکەیان لە دیندا داهێناوە، کە خوای گەورە مۆڵەتی پێنەداون، بۆیە پێم وایە ئەگەر شەراب خواردنەوەکەیان بە حەلاڵ زانیبێت بیانکوژیت، چونکە حەرامێکی دینی خوایان حەلاڵ کردوە، ئەگەر وتیشیان حەرامە ئەوە یەکی هەشتا جەلدەیان لێدە.. (ابن حزم: المحلی ١١/٢٨٧).

ئەگەر ئەم خاڵەمان ئاوا لا رون بۆوە، ئیتر ئەوە بزانە، کە مەسەلەی بەحەلاڵزانین و گۆڕین لازم و مەلزومی یەکن، چونکە گۆڕینی شەرعی خواو پێوە پابەندنەبونی، یەعنی بەحەلاڵزانینی حەرامێك، کە خوای گەورە بە حەرامی ناساندوە.. بۆیە هەمو بەحەلاڵزانینێك یاساداناني پێچەوانەی پەیامی خوایە، بۆیە دەبینیت شێخ الاسلام ئیبنوتەیمییە تەعبیری ئەمیان بەویان دەکات و گۆڕینی شەریعەتی خواو پێوە پابەندنەبونی وا دەناسێنێت، کە

بەحەلاڵزانینی ئەو شتانەن، کە خوای گەورە بە حەرامی ناساندون، هەر کەسێکیش وا بکات ئەوە بە کۆڕای زانایان کافرە.. ئیبنوتەیمییە دەڵێ: ئەمما ئەو کەسەی ئیقامە حوججەی لەسەر نەکرابێت، وەك ئەوەی، کە نەو موسوڵمانەو هەمو ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامی پێ نەگەیشتوە، یان لە چۆڵەوانیەك ژیاوەو شارەزای ئیسلامەکە نەبوە، یان هۆی تری هەیە، یان بە هەڵە لە دەقەکە گەیشتوە، کە گوایە ئەو کەسەی باوەڕ دەهێنێت و ئیمانداری دەکات ئیتر هەرچی بخوات و بخواتەوە ئیشکالێکی نیە، وەکو ئەوانەی، کە ئەو ئیشکالەیان بۆ دروست بوبو، کە سەیدنا عومەری کوڕی خەتتاب تۆبەی پێ کردن، یان هاوشێوەی تر، ئەمانە هەمو داوای تۆبەیان لێ دەکرێت و هەڵەی هەڵوێست و راستی ئەحکامی سەرعەکەیان بۆ رون دەکرێتەوە، ئەگەر هەر لەسەر هەڵوێستی خۆیان سور بون ئەوە کافر دەبن، پێش ئەو ئیقامە حوججەیە ئەو حوکمە نایانگرێتەوە.. هەر وەکو، کە یاوەران خوا لێیان رازی بێت حوکمی کوفریان نەدا بەسەر قودامەی کەڕی مەزعون و هاوەڵەکانیدا، کە بە هەڵە ئەوانیش ئاوا تێگەیشتبون، کە شەرب خواردنەوە دوای ئیمان هێنان و تەقواو دینداریی زیانی نابێت! (ابن تیمیة / مجموع الفتاۆی ٧/ ٣٧١).

پێشتریش باس لەم خاڵە کرا، گرنگ ئەوەیە لە مەبەستەکەی بگەین، کە حەلاڵ کردنی حەرامێك بە قسەش بێت، هەر حوکمی کافربونی ئاشکراو پەنهان دەیگرێتەوە، بێ ئەوەی تەماشای مەرجی (ئیعتیقاد بە دڵ) ی تێدا کرابێت.. چونکە ئەمەیان مەرجی مورجیئەکانە..

ئیبنوتەیمییە دەڵێ: هەر کەسێك ئەو شتەی، کە بە کۆڕای زانایان حەرام بو ئەو بە حەلاڵی ناساند، یان ئەو حەرامەی بە کۆڕای زانایان حەرام بو، ئەو بە حەلاڵی ناساند، یان ئەو حوکمە شەرعیەی گۆڕی، کە کۆڕای زانایانی لەسەرە، ئەوە بە کۆڕای زانایان و شەرعناسان کافرێکی مورتەددە.. چونکە بە رای هەندێك لە زانایان ئەوە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەیە، کە دەفەرموێ:

(وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأولئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ) واتە: هەر کەسێك بەوە حوکم نەکات، کە خوای گەروە ناردویێتیە خوارەوە، ئەوانە کافرن، ئەمە ئەوانەن، کە حوکم کردنیان بە غەیری ئەوەی خوا ناردویێتیە خوارەوە بە حەلاڵ زانیوە.. (ابن تيمية مجموع الفتاوى ٣/١٦٧).

ئەمەی شێخولئیسلام رەحمەتی خوای لێ بێت باسی کردوە، کە (لە ئیبنو عەباس و تاوسەوە هاتوە، کە مادام ئەو کەسەی حوکمی بە غەیری پەیامی خوای گەورە کردوە، هەر بە گوناحی داناوەو لە دڵدا پێی حەلاڵ نەبوە، گوایە کوفری عەمەلی بچوکە، واتە کوفر دون کوفرە! حەتمەن دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێت، کە کابرا پێی شیاو بوە، کە حوکم بە غەیری دینەکەی خوای گەورە بکات، پێی جائیز بوە پێوەی پابەند نەبێت وئەو بخاتە لاوەو یاساو رێسایەکی دیکە بخاتە جێی و حوکمی پێ بکات (یان حوکمی پێ بکرێت) وەکو شێخولئیسلام خۆی لە سەرەوە رونی کردۆتەوە، چونکە ئیمامی ئیبنوتەیمییە لە دەیان شوێنی دیکەدا ئەوە باس دەکات، کە هەر کەس شەریعەتەکەی خوا بخاتە کەنارو حوکم بە پێی یاساو رێسایەکی دیکە بکات کافر دەبێت.. وەك دەڵێ: لە بەڵگەنەویستەکانی دینی موسوڵمانانە، کە هەمو موسوڵمانان لەسەر ئەوە رێکن، کە هەر کەسێك پێی جائیز بێت شوێن دینێکی دیکەی غەیری ئیسلام بکەوێت، یان شوێن یاساو رێسایەکی غەیری شەریعەتەکەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم بکەوێت، هەر بە پێ جائیز بونەکەی کافر دەبێت..(مجموع الفتاوى ٢٨/٢١٧). ئەمما قەناعەتی ناخ ئەوە حەتمەن هاورێی گۆڕینەکەیە، چونکە بەدی دەرەوە بەڵگەیە لەسەر بەدی دڵ و دەرون وقەناعەتی ناخ، بەلام ئەوە هەیە، کە هەمیشە ئەحکامی ئیسلام حوکم لەسەر زاهیری خەڵکی دەدات..

ئـەوەی، کـە دەیڵـێین هەڵوێسـتی نـەگۆڕی ئیمـامی ئیبنوتـەیمییـە بـوە لـە چەندین کتێب و جێی تردا ئەوەی وەکو بەڵگەنەویستی ئیعتیقاد بـاس کـردوە، لەوانە:

بە نیسبەت ئەو کەسەوە، کە شەریعەتی خوا دەگۆڕێت دەڵێ: ئـەو کەسـەی زاهـیرو بـاتین پابەنـدە بـە شـەریعەتی خـواو پێغەمبـەری خـواوە، بـەڵام لـە حوکمێکدا سەرپێچی دەکات و شوێن حـەزو ئارەزوی خـۆی دەکـەوێت، ئـەوەو هاوێنەی ئەو لە گوناهباران حسێبن.. (منهـاج السـنة النبويـة ٥/١٣١). ئەمـە ئەو حاکمەیە، کە بە غەیری شەریعەتی خوا حوکمی کردوە، کە بە لای ئیمامی ئیبنو تەیمییەوە مەرجە لە قەناعەتی ناخیدا کارەکەی بە حەڵاڵ زانیبێت..

ئــەو کەســەی بــە شــەریعەتی ئیســلامەوە پابەنــد نابێــت لای ئیمــامی ئیبنوتەیمییـە کـافرەو موناقەشـەی تێـدا ناکـات، وەك دەڵـێ: ئـەو کەسـەی بـە پەیامی خواو پێغەمبەری خواوە پابەند نابێت کافرە.. (منهـاج السـنة النبويـة ٥/١٣١). کەوابو بۆ ئەمەیان نکوڵی کردنی شەرع یان نەبونی قەناعەتی ناخی کابرا بەمەرج، بەڵکو پێی وایە، کە هەر بە گۆڕینەکەی کافر دەبێت.. ئەمـەت لە بیر بێت، تا لە تۆڕو تەڵەی مورجیئەکانی سەردەم دەرچیت..

ئەمـە بـە نیسبەت ڕاوبۆچونی ئـەو زانایانـەی، کـە وای بـۆ چـون کـە ئـەو کوفرەی ئەو ئایەتە ئاماژەی پێ دەکات، کوفری بچوکەو هـەر بـە تـاوانی گـەورە حسێبە نەك کوفر، ئەمما زانایانی دیکە، کە زۆرینەی سەلەف وخەلـەفن پێیـان وایـە، کـە ئـەو کـوفرەی ئـەو ئایەتانـە ئامـاژەی پـێ دەکـەن، کـوفری گەورەیـەو خاوەنەکـەی لـە دیـن و ئوممەتەکـە دەباتـە دەرەوە، بـێ ئـەوەی لا بکـەن بـەلای ئـەوەوە، کـە ئـەمان دەفـەرمون، وەك نکـوڵی کـردن، یـان بەحـەڵاڵزانین، یـان قەناعەتی ناخ و شتی تری وا.. نا، ئەم زانا بەڕێزانە پێیان وایە هەر واز هێنـان لـە شـەریعەتی خـواو خسـتنە کـەناریی، یـان گـۆڕین و هێنـانی بـەدیلێکی دیکـە بۆی، کوفری گەورەیـەو بکەرەکـەی پێـی لـە دیـن و ئوممـەت دەچێتە دەرەوە..

وەكـو ئیمـامی ئیبنولقـەییم دەڵـێ: لـەو زانایانـە هەیانـە ئایەتەكـە وای لێـك داوەتەوە كە هەر كەسێك بە ئەنقەست حوكمی بە غەیری ئەوە كرد، كە خوای گـەورە ناردویێتیـە خـوارەوە بـەو مەرجـەی نـەزان نـەبوبێت، یـان هەڵـەی لـە لێكدانەوەدا نـەكردبێت، ئـەوە حەتمـەن بـەو حـوكم پـێ كردنـە كافر دەبێـت و كوفرەكەشی، وەكو ئیمامی بەغەوی لە كۆڕای زانایانـەوە نـەقڵی دەكات كـوفری گەورەیـە، كـە لـە دیـن و ئوممەتەكـەی دەیباتـە دەرەوە.. (مــدارج الســالكين ٣٣٦/١) ..

خاڵێكی دیكەی گـرنگ مـاوە ئامـاژەی پـێ بـدەین، تـا ناحـەزێكی رەزاقـورس لێمان ڕاست نەبێتەوەو بڵێ: جا خۆ ئەو شەرعەی ئێوە دەیڵێن هەموی لە خواو پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم نەهاتوە! یان ئەگەر كابرا درۆی دەكرد، ئەوی چەسـپاندویێتی هـەواو هەوەسـی خۆیـەتی، یـان یاسـاو رێسـایەكی دیكەیـەو بـە درۆوە دەڵـێ: ئەمــە هــەر شــەریعەتەكەی خوایــە! لــە وەڵامــی ئــەم جـۆرە گومانانەدایـە، كـە ئیمـامی ئیبنوتەیمییـە دەڵـێ: هـەر كەسـێك بڵـێ ئەمـە شەریعەتی خوایـە، ئـەوە بـێ چەندوچـون كـافر دەبێـت، ئەمـە هـەر وەكـو ئـەو كەسـە وایـە كـە دەڵـێ خـوێن و مردارەوەبـو حەڵاڵـە!! ئەگـەر بڵـێ ئەمـە هـەر راوبۆچونی خۆمە، هەر پێی كافر دەبێت .. (مجموع الفتاوی١٦٨/٣).

بڕوانـە هـەر ئـەو حوكمـە قورسـەی، كـە داوێـتی بەسـەر ئـەو كەسـەدا، كـە شەریعەتی خوای گۆڕیوە، كە كـافر بونـە، داوەتـەوە بەسـەر ئـەو كەسەشدا، كـە دەڵێ ئەمە ڕاوبۆچونی خۆمە! چونكە مەسـەلەكە كۆڕا (ئیجمـاع) ی ئوممـەتی لەسـەرە، راجـوێیی نیـە، تـا كەسـێكی دیكـە بێـت و بـە راوبۆچـونی خـۆی رۆشنبیرمان كات!!

فەتوای ئیبنوتەیمییە لەمەڕ ئەو كەسـەدا، كـە شـەرعی خـوا دەخاتـە كـەنار، یـان دەیگۆڕێـت، یـان هـی تـر دێنێتـە شـوێنی رۆشـنە، هـەمو ئەوانـە بـەكافر دەزانێت و دەشڵێ، كە كوفرەكـەیان كـوفری گەورەیـەو پێـی لـە دیـن و ئوممـەت

دەچنە دەرەوە، وەك لە جێیەكی دیكەدا دەڵێ: ئەوە ئاشكرایە، كە هەر كەسێك ئەو فەرمانەی خوای گەورە كە لە رێی نێرراوانی خۆیەوە سەلامی خوایان لێ بێت گوتویەتی: بیكەن، یان ئەو بەرهەڵستیەی لە رێی ئەوانەوە گوتویەتی: مەیكەن بخاتە لاوەو پەكی بخات و كاری پێ نەكات، بە پێی كۆڕای موسوڵمانان و دیان و جولەكەش، بەو كارەی كافر دەبێت.. (مجموع الفتاوى ٨/٦٦).

ئینجا شێخولئیسلام ئیبنوتەیمییە رەحمەتی خوای لێ بێت ئەو دوو لایەنانە رون دەكاتەوە، كە عادەتەن پێچەوانەی شەرعیان لێوە دەكرێت، دەڵێ: هەر پێچەوانەكارییەكی شەرع، كە ڕو دەدات حەتمەن لە نەزانین و ستەمكاریی و هەواوهەوەسەوە دێت، ئەمەش لەم دوو بوارەدایە:

یەكەمیان، كە چاكترەكەیانە: ئەوەیە، كە ئەو یاسایە، یان ئەو شەرعەی حوكمەكەی پێكراوە لە پەیامی پێغەمبەرێكەوە وەرگیراوە، كە حوكمەكەی سڕراوەتەوە.

بواری دووەمیان: ئەوەیە كە پێشتر یاساو رێسای كەس نەبوەو ئێستا لە جێی شەریعەتی خوایی دەهێنرێتە پێش و دەچەسپێنرێت.. بە هەر حاڵ خۆ هەر یاساو رێسایەك پێچەوانەی شەرعی خواو پێغەمبەر صلى الله علیە وسلم بێت، یان ئەوەیە سڕراوەتەوە، یان شەریعەتەو گۆڕراوە، كەسێك، یان كەسانێك بێ مۆڵەتی خوایی دایانڕشتوە.. (مجموع الفتاوى ١٣/٣٨).

پاشان رەحمەتی خوای لێ بێت ئەو بڕیارە بنبڕە دەدات كە هەر كەسێك بەو شەریعەتانەوە پابەند بێت، كە هی پێغەمبەرانی پێشون، كە بە پەیامی موحەممەد الموستەفا صلى الله علیە وسلم سڕراونەتەوە (كە دەشڵێ: ئەمیان چاكترەكەیانە) لێی قبوڵ ناكرێت، چ جای ئەوەی خۆی لە هەواوهەوەس و دیدی خۆیەوە یان لە دیدو بۆچون و هەواو هەوەسی كەسانی ترەوە هێنابێتی! بۆیە دەڵێ: هەر كەسێك پابەندبو بە سڕراوەكە لەجیاتی سڕەرەوەكە، ئەوە لەسەر دینی ئیسلام نیەو بە شوێن كەوتوی هیچ پێغەمبەرێكیش هەژمارد ناكرێت، چونكە هەر كەسێك شەریعەتی پێغەمبەران بگۆڕێت و، یاساو

**ڕێسایەکی دیکە بهێنێتە جێی، کارەکەی باتڵەو ناشێت کەس شوێنی کەوێت، چونکە کوفری جولەکەو دیانەکانیش هەر ئاوا بوە، کە خوای گەورە دەربارەیان دەڵێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ الشوری/٢١ واتە: دیارە شەریکی وایان هەیە، کە بۆ خوای گەورەیان داناوە، کە یاساو ڕێسایەك دەردەکەن، کە خوای گەورە ڕێی پێ نەداون[١].. دەبینیت کە خوای گەورە ئەوەی بە کوفر لەسەر حسێب کردون، کە بە یاساو ڕێسایەکی گۆڕراوەوە پابەند بون لەجیاتی پەیامەکەی خوا!![٢] خوای گەورە ئەوەی لەسەر هەر هەمو مرۆڤایەتی فەرز کردوە، کە دەبێت باوەڕ بە هەمو پێغەمبەرانی بهێنن، بە هەمو پەیامەکانی، بە موحەممەد الموستەفا صلی الله علیه وسلم، کە کۆتا نێرراوی خوای گەورەیە، هەر هەمو مرۆڤایەتی داواکراون کە باوەڕ بە دینەکەی بهێنن، شوێنی کەون، شەریعەتەکەی وەرگرن و جێبەجێی کەن، هەمو ئەمانەش وان لە قورئان و سوننەتدا.. کەوابو ئەوی لە قورئان و سوننەتدایە شەریعەتی خواو پێغەمبەری خوایەو هەر هەمو مرۆڤایەتی موکەللفن باوەڕی پێ بهێنن و پێوەی پابەند بن، کەس بۆی نیە لە شەریعەتی خوا دەرچێت، شەریعەتی خواش ئەوەیە، کە موجاهیدەکان بەرگریی لێ دەکەن**

---

١ـ حافز ئیبنو کەتیر لە کتێبی (البدایە والنهایە ١٢٨/١٣) دا دەڵێ: هەر کەسێك ئەو شەریعەتە پاکە ڕەوایەی بۆ محمدی کۆتا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هاتۆتە خوارەوە وازلێبهێنێت و داوەری خۆی بباتە لای ئەو شەریعەتانەی پێش ئەو، کە بە دینەکەی ئەم نەسخ بوونەتەوە (حوکمیان سڕراوەتەوە) کافر دەبێت، چ جای کەسێك، کە دەیباتە لای یاسق وئەوی پێ قبوولە، چ جای ئەو کەسەی کە حوکمی یاسقەکەش لە پێشتر دەگرێت وەی ئەوی پێ باشترە لەوەی خواو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ؟! هەر کەسێك وا بکات، ئەوە بە کۆڕا (ئیجماع) ی هەموو موسوڵمانان کافرە.. ئیبنو کەپیر ئەوەش ڕوون دەکاتەوە، کە ئەگەر لە یەك مەسەلەشدا حوکمی شەرعی گۆڕی و بە پێی یاسای دژ بە ئیسلام حوکمی دەرکرد، هەر کافر دەبێت و کوفرەکەشی کافربوونی گەورەیە کە لە دین و ئوممەت دەیکاتە دەرەوە، ئەوە ئاگادار بین چونکە سەلەفی! زۆر دەبینین هەر لە بەهانەیەك دەگەڕێن بۆ حاکمە مورتەددەکانی بهێننەوە، تا بڵێن ئەمانە هەر موسوڵمان ماون وناشێت دژیان بوەستینەوە!.

٢ـ ئەدی کەسێك بە شەرعی ناپلیۆن و کرۆمەرو جۆرج بۆشەوە پابەند بێت حوکمی چی دەبێت؟!!)

و لـە پێناویـدا دەمـرن، کـە بریتیـە لـە قورئـان و سـوننەت.. (مجمـوع الفتـاوی ٢١٤/٣٥).

بەمانەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە ئا ئـەوەی (سـەلەف) ەکـان بەدەوروخولیـدا دێن و دەچن زۆر هەڵەیەو پڕ پەڵەیە، ئەوەی ئەوان سواری سەری خۆیـان بـون بۆی و دەیانەوێت بە ناوی سەلەفەوە خەڵکی لە بیدعەکەی خۆیـان کۆکەنـەوە، تەپکەیەو هـەر سادەپیاوی پێوە دەبێت! دەنـا ئـەو سـەلەفێتیەی خۆیـان پێـوە هەڵڕۆسکاندوەو رەسمی جەژنی لـە پـەناوە دەگـرن هـەر توێکڵـەداری گەنـدەڵەو نـاوەرۆکی بـە کرمـی جـەهمێتی خـوراوە! ئـەوەی ئـەوان وا دەزانـن بـۆ هـەمو حوکمی بەکافر دانانێك دەبێت بزانرێت، کـە کـابرای کـافر لـە نـاخی خۆشیدا کافرێتیەکەی بەسەر خۆیدا هێنـاوە!! هـەر گیزەگیـزی زەردەواڵەیـەو هـەنگوین وەبەرهـەم ناهێنێـت، ئـەوی شارەزاشـیان بـو، زو دەکەوێتـە راوەدونانیـان و دەیانداتە بەر مێشکوژ !!

هـەر کەسێك کـەمێك لـە توێژینـەوەی عیلمیـدا خـۆی مانـدو کـات و فیرقـە گومراکان بناسێتەوە، زو بۆی دەردەکەوێت، کە (سـەلەف) ەکـانی ئـەم سـەردەمە هەر ناویان لە ریزی ئەهلی سوننەت و جەماعەتـە دەنـا لـە راسـتیدا جـەهمین، هەر لەبەر ئەوەشە رەنگـی سـەلەفیان لـەخۆ داوە تـا نەناسـرێنەوە کـە سـەوزەو میوەی پلاستیکین! جا بۆ ئەوەی کەشفیش نەبن ئامادەن هەزارو یەك تەدلیس بکەن، حەق و باتڵ تێکەڵ دەکەن و دەیکەنە چەرەدوکەڵ تا لێت تێـك چێـت و نـەزانیت خـەریکی چـین!! سـەیری نوسـینەکانی عـەلیل حەلـەبی، کـە بـۆ سەرخستنی مەزهەبەکـەی خـۆی، کـە خـوزلانی مورجەئییـە چـۆن قسـە بـەدەم زانای وەکو ئیمامی ئیبنو کەثیرەوە دەکات!!

عەلیل حەلەبی هەرچەندە دەزانێت، کە ئیمامی ئیبنو کەثیر رحمەتی خوای لێ بێت ئەو کەسە بـە کـافر دادەنێـت، کـە شـەریعەتی خـوا دەگۆڕێـت، هـەر بـە گۆڕینەکە بە کافری دادەنێت بێ ئەوەی لاکات بەباسی ناخی دڵ ونکوڵی کـردن

و بەحەڵاڵزانینـــەوە، بـــەڵام دەیـــەوێت ملـــی دەقـــەکانی ئـــەو بـــەرەو لای مورجەئییەتیەکەی خۆی باداتەوە!!

ئیمامی ئیبنـو کـەثـیر رحمـە اللە دەربـارەی تـەتار، کـە شـەریعەتی خوایـان لادابـو، یاسـقیان هێنـابوە شـوێنی و حوکمیـان پـێ دەکـرد، دەڵـێ: ئایـا حـوکمی جاهیلییەتیان دەوێت؟! کێ لـە خـوای گـەورە حـوکم وداوەری خـەڵکانێك باشـتر دەکات، کە لە دینـداریان دڵنیـان بـون. ئیبنـو کـەثـیر دەفـەرموێ: خـوای گـەورە لێرەدا سەرزەنشتی ئەو کەسە دەکات، کـە وازی لـە حـوکمی خـوای پـەروەردگار هێناوە ـ کە هەمو خێرێکی لە خۆ گرتـوەو لـە هـەمو خراپەیـەکیش دورە ـ واز لـەم خێـرە دێنێـت بـۆ بەرنامـەی کەسـانێك، کـە هـەر هـەواو هـەوەس و ڕاو بۆچـونی کەسـانێکە، کـە خۆیـان پەسـەندییان کـردوە، بـێ ئـەوەی ڕەزامەنـدی خوای لەسـەر بێـت، یـان شـەریعەتەکەی خـوا بیگرێتـەوە، ئەمـەیان کـردوە بـە ڕێسای داوەری وحـوکم! ئەمـەش وەکـو ئەوەیـە، کـە ئـەهلی جاهیلییـەت (پـێش ئیسلام) گومڕایی و نەفامێتیەکەی خۆیان دەهێناو، بە دیـدو ڕای خۆیـان دایـان دەڕشت ودەیانکردە یاسای داوەری، یان وەکو ئەوەیە، کە تەتارەکان حـوکمی پـێ دەکەن، کە لە سیاسەتی پاشایەتی خۆیانەوە هێناویانە، دیدو ڕای جەنگیزخانی پاشـای خۆیانــە، ئـەو بەرنامەیـەکی بـۆ داڕشـتبون ونـاوی نـابو (یاسـق)[1]، کـە بریتییە لە کتێبێکی کەشکۆڵی ئەحکام و یاسا، کە لە چەندین شەریعەتی جودا وەری گرتبو، وەك شەریعەتی جولەکەو دیانەکان وشـەریعەتی میللـەتی ئیسلام وهی تر، زۆر ئەحکام وبڕگـەو بڕیاریشـی تێدایـە، کـە هـەر لـە هـەواو هەوەسـی

---

١ـ وا دەزانم ئەوەی لە فارسیدا پێی دەڵێن یاساغ هەر ئەم یاسقەیەو ئەوان چونکە ق دەکەن بە غ ئاوای لێ هاتووە، کوردیش یان لە فارسیەوە وەرگرتووە، یان هەر لە زەمانی تەتارەوە لای ماوەتەوەو بووە بە یاساغ واتە مەمنوع، پاشان بووە بە یاسا.. والله اعلم. گرنگ ئەوەیە زاراوەیـەکی زۆر گونجاوو چەسپاوە بۆ بەکارهێنانی لای ئیسلامییان، چونکە لە مێشك و کلتووری کوردیدا بڕیارەکانی حکومەتە، کە بەرامبەر شەرع دانراوە، بۆیە کـوردەواری، کـە دەیانـەوێت کێشـەی کۆمەڵایـەتی خۆیـان چارەسـەر بکەن، دەڵێن یا با مەلایەك شەرعمان کات، یان با بیبەینە دادگاو یاسا بۆمان یەکلابکاتەوە! ! کـەوابوو یاسا شتێکەو شەرعیش شتێکی تر... (وەرگێر).

خۆیەوە دایڕشتون، ئیتر دواتر لای کورو نەوەکانی بو بە یاساو ڕێسایەك، کە شوێنی کەوتون وخستویانەتە پێش حوکمی قورئانەکەی خواو سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم حوکمی هەر کەسێك لەوانە وا بکات (دایڕێژێت یان داوەری پێ بکات) کوفرە، پێی کافر دەبێت وپێویستە جەنگی دژ بەرپا بکرێت، تا دەگەڕێتەوە سەر حوکمی خواو پێغەمبەری خوا، تا داوەری بە غەیری حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی لە هیچ شتێکی، کەم یان زۆردا ناکات.. (تفسیر القران العظیم / لابن کثیر ٢/٦٧).

کاتێك عەلیل حەلەبی هەستی کرد، کە ئیمامی ئیبنو کەثیر تەکفیری ئەو کەسە دەکات، کە شەریعەتی خوا دەخاتە کەنار یان لێی دەگۆڕێت، یان حوکم بە یاساو ڕێسای پێچەوانەی شەرع دەکات، دەستێکی کەوتە ئەملاو دەستێکی کەوتە ئەولا! ئەوجا بۆ خۆ قوتار کردن سێ تەختە رزیوی کردە بەلەم:

**یەکەم:** هەوڵیدا، کە قەولەکەی ئیبنو کەثیر تایبەت کات بە حوکمی تەتارەوە بۆیە دەڵێ: ئەوە پەیوەندی تەنها بە تەتارەوە هەیە! ئینجا کەوتە وێزەی تەتار، کە چەند کافرو خراپەکارو خوێنڕێژبون ئەمە هەڵاتن و خۆدزینەوەیە، چونکە تایبەت کردنی حوکمی شەرع بە ڕوداوێکی تایبەتەوە باتڵە.. ئەمە جگە لەو چەواشەکاریی و تەدلیسەی، کە لە فەتواکەی ئیبنوکەثیردا کردویەتی، چونکە ئەوی خوێندەواری هەبێت و دەقەکەی ئیبنوکەثیر بخوێنێتەوە دەبینێت کە ئەو دەڵێ: ئەهلی جاهیلییەت و تەتار کە هەیانبو هاتبوە ناو ئیسلامەتیەوە، ئەمانەی کردبوە نمونەی ئەوانەی، کە حوکمی شەرعیان خستۆتە لاوەو یاساو ڕێسای دیکەیان خستۆتە شوێنی و حوکمی پێ دەکەن، ئیبنو کەثیر بۆ هەر یەکەیان نمونەی هێنابۆوە تا بواری ئەو تێکەڵاوی و تایبەت کردنەی حەلەبی دەیەوێت نەمێنێت! باسەکەی ئیبنوکەثیر لەسەر دو پۆلە کافرە یەکەمیان ئەهلی جاهیلییەت و دووەمیان تەتارە، بۆ هەر یەکەشیان نمونە دێنێتەوەو دەیاناسێنێت، ئینجا حوکمی هەردولایان دەکاتەوە بە یەك، چونکە ئەوەی، کە کۆڵکەی هاوبەشی

حوکمەکەیە ئەوەیە، کە هەردولایان شەریعەتی خوایان خستۆتە کەنارو، لە لای خۆیانەوە یاساو ڕێسای دیکەیان هێناوەتە جێی و حوکمی پێ دەکەن..

**دووەم:** دوای ئەمە حەلەبی پەنای بردۆتە بەر درۆیەکی ئاشکرا، کە دەڵێ ئیبنوکەثیر تەتاری هەر بەوەندە تەکفیر نەکردوە کە شەریعەتی خوایان گۆڕیوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە ئەوان (درۆیان کردوەو مەبەستیان ئەوە بوە کوفر بکەن)! بۆیە دەڵێ: ئەو بۆیە تەکفیری کردن، چونکە تەتارەکان بە ئەنقەست و کەللەڕەقی خۆیان نکوڵییان لە حوکمی شەرعی خوا کرد.. (التحذير ل ١٥). ئەمەش وا نیە.. حەلەبی وا دەزانێت وەك بە ئاسان بەسەر کەسانی خۆیاندا بازی داوە، بەسەر ئێمەمانانیشدا باز دەدات! خوای گەورە هەر زو مەکرو فێڵەکەی فەزح کرد، چونکە هەر کەسێك بچێتەوە سەر تەفسیری ئیبنوکەثیر ٩٨/٢ لە تەفسیری ئایەتی ٤٥ ی مائیدەدا ئەوە ڕون دەبێتەوە، کە ئەوەی حەلەبی دەیەوێت بە زمانی ئیبنوکە ثیرەوە ڕێکی خات، ڕێك ناکەوێت!! چونکە ئەوەی حەلەبی لەوەوە نەقڵی دەکات لەسەر جولەکەکانە، نەك لەسەر تەتارو مەغۆل! ئەم بە زۆر ملی قەولەکەی ئیبنوکە ثیر بەرەو ئەولایە دەشکێنێتەوە، کە خۆی دەیەوێت! دەنا ئەو باس لە جولەکەکان دەکات، کە چۆن بە نکوڵی کردنی حوکمی شەرعی کافر بون.. جا بڕوانە ئەو فێڵکارییەی کاکەی (سەلەفی) ی دەیکات؟!!

ئاخر لەبەر ئائەم فێڵ و چەواشەکارییەیە، کە هەمیشە هۆشدارپی دەدەینە موسوڵمانان، کە لە کتێبەکانی عەلی الحەلەبی بە حەزەر بن.. پێش ئێمەش زانایانی تر ئەو هۆشدارییەیان داوەتە موسوڵمانان، کەسێکی وەکو دکتۆر محمد ئەبوالرەحیم لە کتێبەکەیدا (تحذير الامة من تعليقات الحلبي على أقوال الائمة/جامعة العلوم التطبيقية ض ١/١٩٩٧)...

**سێیەم:** حەلەبی لە کتێبەکەیدا (صيحة النذير) هەوڵی ئەوەی داوە هۆکاری تەکفیرکردنی ئیبنوکەثیر بۆ ئەو کەسەی شەریعەتی خوای گۆڕیوە، ئیعتیقاد

بێت، نەك كردار! تا بە حسابی خۆی مەسەلەی تەكفیر زەبت و رەبت كات!! بەڵام ناچار بوە قسەی وا بە دەم ئیبنوكەثیرەوە دروست كات، كە ئیبنوكەثیر نەیفەرموە! زۆر بە جورئەتیشەوە درۆی بەدەم ئەم ئیمامە بەرێزەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە دروست كردوە!! دەنا توخوا مەعقولە عەقیدەی ئیمامی ئیبنوكەثیر، هەر وەكو عەقیدەی (حەلەبی) و (جەهم) بێت؟!

بڕۆرەوە سەیری دەقەكەی ئیبنو كەپیر بكەرەوەو ورد دیقەتی بدە داخۆ هیچ شتێكی لێ دەفامرێتەوە، كە حەلەبی بیكاتە بەڵگەی ئەو تەدلیسەی كردویتی؟! بزانە بە هیچ كلۆجێك ئیمامی ئیبنوكەثیر دەڵێ، كە مەرجە بۆ كافربونی ئەو كەسەی شەریعەتی خوای گۆڕیوە، یان لادان و گۆڕینی شەرعی بە حەلاڵزانیوە، لە ناخدا ئیعتیقادی كافربونی هەبوبێت، یان جەخت لەوە دەكاتەوە، كە هەر بەوەندەی گوفتارێكی كوفرین، یان رەفتارێكی كوفرین لە یەكێك دەركەوت كە بەهانەی شەرعی نەبو پێی كافر دەبێت.. بڕوانە ئیمامی ئیبنوكەثیر دەربارەی ئەو كەسانەی، كە حوكمیان بە یاسا دەكەن چی دەڵێ: هەر كەسێك ئەو شەریعەتە پاكە رەوایەی بۆ محمدی كۆتا پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم هاتۆتە خوارەوە واز لێ بهێنێت و، داوەری خۆی بباتە لای ئەو شەریعەتانەی پێش ئەو، كە بە دینەكەی ئەم نەسخ بونەتەوە (حوكمیان سڕراوەتەوە) كافر دەبێت، چ جای كەسێك، كە دەیباتە لای یاسق وئەوی پێ قبوڵە، چ جای ئەو كەسەی، كە حوكمی یاسقەكەش لە پێشتر دەگرێت وهی ئەوی پێ باشترە لەوەی خواو پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم ؟! هەر كەسێك وا بكات، ئەوە بە كۆڕا (ئیجماع) ی هەمو موسوڵمانان كافرە.. (البدایة والنهایة ١٣/١١٩).

# گومانی یەكەم

## مەبەستی كافربون لە گوفتارو كرداری كوفریندا مەرجە بۆ بەكافر دانان

شێخی ئەلبانی رەحمەتی زۆر هەوڵی دەدا بەلگە لەسەر ئەو بۆچونەی بهێنێتەوە، كە گوایە هەر كەسێك گوفتارێك، یان كردارێكی كوفرینی كرد، ئەگەر مەبەستی كوفر نەبوبێت، پێی كافر نابێت! یەكێك لەو بەلگانەی، كە زۆر پشتی پێ دەبەست حەدیسی كابرایە، كە پێش مردنی وەسێتی كرد، كە ئەگەر مرد بیسوتێنن و سوتوەكەی لە رۆژێكی رەشەبادا بە هەوادا بدەن، تا خوای گەورە نەتوانێت كۆی كاتەوەو سزای بدات..

شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە شریتی (منهج الخوارج) دا كە یەكێكە لە زنجیرە شریتەكانی الهدى والنور ژمارەكەی ١/٨٣٠) دەڵێ: (لو كانَ كُفْراً، فالكفرُ لا يُغْتَفَرُ بنصِّ الاية، ليسَ كفراً لأنَّهُ لم يَقْصِدُ الكفرَ) واتە: بە كوفر حسێب ناكرێت، چونكە كوفر بە پێی دەقی ئایەتەكە لێخۆشبون نایگرێتەوە.. كەوابو مادام مەبەستی كوفر نەبوە پێی كافر نەبوە.. لە شریتی (الكفر كفران) یشدا، كە تسجيلات بيت المقدس لە عەممان بلاوی كردۆتەوە دەربارەی كافر نەبونی ئەو كابرایە دەڵێ: (إنَّهُ كُفْرٌلَم يَكُنْ مَقْصُوداً في القلبِ، لَم يَكُنْ مَعْقُوداً في القلبِ) واتە: ئەوە كوفرێكە مەبەستی دڵی لەسەر نەبوە، لە دڵدا بڕیاری لەسەر نەدراوە.. واتە شێخی رەحمەتی پێی وایە، كە كارەكەی كابرا بۆ خۆی كوفرەو بكەرەكەی لە دین و ئوممەتەكە دەكاتە دەرەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم پیاوە لە دڵ و دەرونیدا مەبەستی ئەوە نەبوە كافر ببێت، بەو كارەی كافر نابێت..

ڕەتكردنەوەی ئەم بۆچونە لە چەند لایەكەوەیە:

**یەکەم:** پێشتر باس لەوە کرا، کە بە مەرج وەرگرتنی (مەبەستی دڵ لە کوفر کردندا) بۆ حوکمی تەکفیر کردنی کەسێك، کە گوفتارێك، یان کردارێکی کوفرینی ئەنجامداوە، ئەوە بۆچون و هەڵوێستی (جەهم) و شوێنکەوتوانێتی، ئەوە پێچەوانەی بۆچون وهەڵوێستی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە..

**دووەم:** شێخی ئەلبانی بەردەوام ئەم بەڵگەیەی بۆ ئەوە دەهێنایەوە، کە گوایە ئەنجامدانی کوفر بە کردەوە مادام (مەبەستی کافربونی لە ناخەوە لەگەڵدا نەبێت) بە کوفری گەورە حسێب ناکرێت. بەڵام دیارە ئەلبانی رەحمەتی خوای لێ بێت، لە هێنانەوەی بەڵگەو چەسپاندنی ئەم مەزهەبە بیدعەیەیدا، شەپرێوانە دۆش داماو نەیتوانی خۆشی قوتار کات.. چونکە بە کەمێك سەرنجدانە خودی هەڵوێستەکەی کابرا دەزانین، کە هەڵوێستەکە کردار نیەو ئیعتیقادە. کابرا لە مەبەستی دڵیەوەیەتی، کە باوەڕی بە بێ دەسەڵاتی خوای گەورە هەیەو پێی وایە خوای گەورە ناتوانێت ئاوا بە سوتویی کۆی کاتەوەو موحاسەبەی بکات!

کەوابو کابرا بەوە کافر نەبوە، کە ـ وەکو شێخ لێی حاڵی بوەو بەرگریی پێ لە بۆچونی خۆی دەکات ـ گوایە کوفرێکی عەمەلی کردوە.. چونکە کابرا بە هۆیەکی تر کافر بوە، کە بریتیە لە:

**سێیەم:** نەزانین.. هەر کەسێك کەمترین ئاستی حوکمی شەرعی لە کێشەی تەکفیردا شارەزا بێت دەزانێت، کە نەزانین بەربەستێکە بۆ تەکفیر نەکردنی کەسانی دیاری کراو.. دیارە کە خوای گەورە ئەم کوفرەی لەم کابرایەی نەگرت لەبەر نەزانینی بو، نەك لەبەر ئەوەی مەبەستی کافربون نەبوە..

ئیمامی ئیبنوتەیمییەی رەحمەتی دەڵێ: هەمیشە ئەو فەرمودەیەم دەهێنایەوە کە لە سەحیحی بوخاری وموسلیمدا هەیە، ئەم کابرایە گومانی لە توانای خوای گەورە هەبوە، گومانی لەوە هەبوە، کە ئەگەر ببێتە خاك و خۆڵ

خواى گەورە ناتوانێت كۆى كاتەوە! باوەڕيشى وابوە، كە ناتوانێت! ئەمەش بە كۆڕا (ئيجماع)ى موسوڵمانان كافربونە، بەڵام ئەو نەزان بو، موسوڵمانيش بو لەوە دەترسا، كە خواى گەورە سزاى بدات .. (مجموع الفتاوى ٣/١٤٨).

بە هۆى ترسى لە خواى گەورەو نەزانينيەوە خواى گەورە لێى خۆش بو، هەرچەندە داواكەى لە كوڕەكانى هەڵەش بو، بەڵام خواى بەخشندە پاداشتيشى دايەوە، بەڵام لە لوتفى خواوە بۆى بو بە خێرو رژا بەسەريدا!

شێخى ئيسلام دەڵێ: ئەم كابرايە كەوتبوە ناو نەزانين و گومانەوە، نەزانينى ئەوەى، كە خواى گەورە ئێسك و پروسكى پواوى خەڵكى كۆدەكاتەوە، ئينجا زيندويان دەكاتەوەو لێيان دەپرسێتەوە ئەمەش دوو ئەسڵى گرنگە:

يەكەميان: پەيوەندى بە خواى گەورەوە هەيە، كە بريتيە لە باوەڕ پێبونى، بەوەى كە تواناى بەسەر هەمو شتێكدا هەيە .

دووەميان: پەيوەندى بە رۆژى دواييەوە هەيە، كە باوەڕبونە بەوەى خواى گەورە ئەم مرۆڤە زيندو دەكاتەوەو پاداشتى كردەوەكانى دەداتەوە..

ئەم كابرايە بە شێوەيەكى گشتى دەيزانى، كە خوا هەيەو قيامەت هەيەو سزاو پاداشت هەيە، كردەوەيەكى چاكەى دەربڕيوە، كە ترسانێتى لە خواى گەورە، كە زيندوى دەكاتەوەو سزاى دەدات، لەبەر ئەم بڕە باوەڕەى، كە بە خواى رۆژى دوايى هەيبو و كردەوەى چاكەشى پێكرد، خواى گەورە لێى خۆش بو. (مجموع الفتاوى ١٢/٢٦٣).

# گومانی دووەم

## دڵخۆشبون بە کوفر کردن مەرجە بۆ بەکافر دانان

شێخی ئەلبانی رەحمەتی خوای لێ بێت زۆرجار بۆ سەرخستنی بۆچونی خۆی، کە گوایە (بۆ بەکافردانانی کەسێك، کە گوفتاری کوفرین، یان کرداری کوفرینی ئەنجامداوە، دەبێت بە ئەنجامدانی کارەکەی دڵخۆش بوبێت، دەنا بە کافر دانانرێت) بەڵگەشی ئەو ئایەتەیە، کە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١٠٦ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٠٧﴾ النحل، واتە: هەر کەسێك دوای موسوڵمان بونی کافر ببێتەوە، مەگەر کەسێك لە ژێر تین و فشاردا ناچاری کافربون بکرێتەوە، کافر نابێت بەو مەرجەی دڵی پڕ لە باوەڕ مابێت، بەڵام کەسێك، کە بە کافربونی دڵخۆش بێت ئەوانە خوا غەزەبیان لێ دەگرێت و سزای زۆر سەختیان دەبێت. چونکە ژیانی دونیایان پێ چاکتر بو لە ژیانی دوارۆژیان، خوای گەورەش رێنمایی کافران ناکات..

ئەم بۆچونە رێی راستی نەگرتوە، لەبەر ئەوەی:

**یەکەم:** نەدەبو شێخ خۆی لەم لێکدانەوە مورجیئانە بدات، دەبو لەسەر رێسا شەرعیەکە برۆیشتایە، کە هەمیشە دووبارەی دەکردەوە کە دەیگوت: (دەبێ بگەرێینەوە سەر قورئان وسوننەت، بە تێگەیشتنی سەلەف) لەم هەڵوێستەشدا دەبو وای بکردایە.. بەڵام ئایا بۆچی لەم باسە دژوارەدا وای

نەکرد؟ بۆچی لەم کێشە خەتەرەدا، کە هەزاران زانا شوێن هەواو هەوەس کەوتن تێیداو پێییان تێیدا هەڵخلیسکاو رێ وشوێنی سەلەفی سالحی ئەم ئوممەتەیان تێدا بزر کرد؟! بۆچی ئەمیش کەوتە شوێنی ئەوانە ؟!

**دووەم:** زانایانی ئەهلی سوننەت زۆرن لەوانەی ئەو جۆرە حاڵیببونە مورجیئەییەیان لەو ئایەتە رەت کردۆتەوە. شێخ حەمەدی کوڕی عەتیقی نەجدی رحمەاللە دەڵێ: ئەمما ئەو (بەرامبەرەکەی کە موناقەشەی ئەم مەسەلەیە دەکات) بۆ ئەوەی خۆی راپسکێنێت لەو بەرپرسێتیەی قورئان و سوننەت دەیخاتە سەری، بۆ ئەوەی لە رێی یاوەران و سەلەفی سالحی ئەم ئوممەتە دەرباز بێت دەڵێ: (هەر کەسێك بە کوفر کردنەکەی دڵخۆش بو، یەعنی بواری کافربونی بۆ خۆی کردەوەو کردی بە شارێ و لە دینەکە پاشگەزبوەوەو بەمەش بەختیارو کامەران بو، ئا ئەوە دەشێت بە کافر دابنرێت) ئەمە عیبارەتە راشکاوەکەیەتی، کە دەڵێ: ئەو کەسەی، کە گوفتارێکی کوفرین، یان کردارێکی کوفرینی ئەنجامداوە بە کافر حسێب ناکرێت، هەتا خۆشحاڵی خۆی بەو کافربونە دەرنەبڕێت!! ئەمە بەراستی پێچەوانەی ئەقڵی راست و نەقڵی دروستەو رێبازێکی تری غەیری رێبازی موسوڵمانانە، چونکە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە و سلم و کۆڕا (ئیجماع)ی ئوممەتەکە هەمو لەسەر ئەوەیە، کە هەر کەسێك گوفتارێکی کوفرین، یان کردارێکی کوفرینی ئەنجامدا، پێی کافر دەبێت، خۆشحاڵبونی نەکراوە بە مەرجی دەرچونی حوکمی بە کافر دانانەکەی.. ئەو کەسەی ئەم حوکمە نایگرێتەوە، ئەو کەسەیە کە خراوەتە ژێر تین و فشارەوەو ناچار کراوە رەفتارێکی کوفرین ئەنجام بدات.. ئەمما ئەو کەسەی، کە رەفتارێکی کوفرین دەکات و پێی خۆشحاڵە ئەوە کافری موتڵەقەو دوژمنی خواو پێغەمبەری خوایە صلی اللە علیە و سلم، با بە گوفتارو کرداریش وا

نەڵێت، ئەمەش لە قورئان و سوننەت و کۆڕا(ئیجماع)ی ئوممەتدا شتێکی رون‌و ئاشکرایە[١] ..

شێخ محمدی کوڕی عبدالوەهاب رەحمەتی خوای لێ بێت دەربارەی هەمان ئایەت دەڵێ: خوای پەروەردگار کەسی لە حوکمی ئەو ئایەتە دەرنەکردوە، مەگەرناچارکراوێك نەبێت، کە هێشتا دڵی بە باوەڕ ئاوەدانە، ئەمما غەیری ئەمی بە کافر داناوە، جا ئیتر رەفتارە کوفرینەکەی لە ترساندا کردبێت، یان لەبەر خاتران، یان لە ترسی دەرنەکردن وجێنەهێشتنی کەسوکارو عەشیرەت و ماڵ وحاڵی،یان بۆ سوعبەت و یاری و مەزاقی خۆی و هاودەنگانی خۆی کردوە، یان بۆ هەر شتێکی تر.. ئایەتەکە ئەم حوکمەی لە دوو لاوە تێدا رون و ئاشکرایە:

**یەکەم:** ئایەتەکە دەفەرموێ: (إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ ) جگە لەو کەسەی خراوەتە ژێر تین وفشارەوەو ناچارکراوە، حوکمی ئایەتەکە هەموان دەگرێتەوە، جگە لەم ناچار کراوە.. دیارە کەسێك، کە ناچار دەکرێت بۆ ئەنجامدانی گوفتارێکە، یان کردارێکە، خۆ کەس کەسێکی تر ناچار ناکات، کە دەبێت باوەڕی لە ناخدا بە شتێك هەبێت!![٢]

**دووەم:** کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ چونکە ژیانی دونیایان پێ چاکتربو لە ژیانی دوا رۆژیان.. ئەمە رون کردنەوەی هۆکاری کوفر کردنەکەیانە، کە لەبەر ئەوە نیە

---

١- حمد بن عتيق النجدي : الدفاع عن أهل السنة والاتباع ل ٢٢-٢٣ لە (عبدالقادر بن عبدالعزيز: الجامع في طلب العلم ل ٥١١) وەرگیراوە ..

٢- بێگومان ئەگەر کەسێك کەسێکی تری لەسەر ئەوە ناچار کرد، کە دەبێت باوەڕی بە شتێك هەبێت، یان نەبێ، هەر دەبێت ناچار کراوەکە بە رەفتارێك (گوفتار بێت، یان کردار)ئەوە دەربڕێت، کە باوەڕی هێناوە، یان رەفزی کردۆتەوە.

ئیعتیقادیان وایە، یان نازانن، یان رقیان لە دینەکەیە، یان کافربونیان پێ خۆشە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە، کە ژیانی دنیایان هەڵبژاردوەو پشکێکی ئەمیان پێ باشتر بوە لە ژیانی رۆژی دوایی، بۆیە فەزڵی ئەوەیان داوە بەسەر دینەکەدا.. (کشف الشبهات ل٤٣).

شێخولئیسلام ئیبنوتەیمییە دەربارەی هەمان باس دەڵێ: (لو كان التَّكَلُّمُ بالكفرِ لا يكونُ كفراً إلَّا إذا شَرَحَ بِهِ الصَّدْرُ لَمْ يَستثنِي الْمُكْرَهَ فَلَمَّا اسْتَثنَى الْمُكْرَهَ عُلِمَ أنَّ كُلَّ مَن تَكَلَّمَ بالكُفْرِ غيرَ الْمُكْرَهِ فَقَدْ شَرَحَ بِهِ صَدراً فَهو حُكْمٌ وليسَ قَيداً لِحُكْمٍ) (ابن تيمية: الصارم المسلول ل١٧٨) واتە: ئەگەر ئەنجامدانی رەفتاری کوفرین پەیوەندی بە پێخۆشحاڵیی و دڵخۆشبونەوە بوایە، ناچارکراوی لێ دەرنەدەکرد ئێستا، کە ناچار کراوی لەو حوکمە دەرکردوە، ئەوە نیشان دەدرێت، کە هەر کەسێك رەفتاری کوفرینی ئەنجامدا بە مەرجێك ناچار نەکرابێت، ئەوە خۆی لە خۆیدا بە کافربونەکەی دڵخۆش بوە، ئەمە حوکمە، نەك مەرجی حوکم ..

لە شوێنێکی تری هەمان کتێبدا دەڵێ: (ومعلومٌ انَّهُ لَمْ يُرِدْ بالكُفرِ هُنا اعتقادَ القلبِ فَقَط لانَّ ذلكَ لَم يُكرَه الرَّجُلُ عَلَيهِ، وهو قد اسْتَثنَى مَن أُكْرِهَ) (ابن تيمية: الصارم المسلول ل٥٢٤)واتە: دیارە لێرەدا مەبەستی لە باسی ئەو کوفرە ئەوە نیە باوەڕێك بێت و تەنها لە دڵدا چەسپا بێت، خۆ ئەمە ئەو باسە نیە، کە کابرای لەسەر ناچار کراوە، کە ئەسڵەن ناچار کراو لەو حوکمە کراوەتە دەرەوە..

خۆ لەفزەکە وا نەهاتوە بفەرموێ: (وتی وباوەڕی وابو) بەڵکو بە راشکاوی دەفەرموێ: (ئەو کەسەی بێ ئەوەی ناچار کرابێت وتی).. کەوابو هەر کەسێك، کە قسەیەکی کوفرینی کرد ئەوە کەوتۆتە بەر غەزەبی خواو حەتمەن سزایەکی بەژان دەدرێت، چونکە بەوە کافر بوە، مەگەر ناچار کرابێت لەسەر کردنی ئەو قسەیە، ئەمیان بەر لێخۆشبون دەکەوێت، بەو مەرجەی ناچار دڵی پڕ لە باوەڕ مابێت و ئیمانەکەی لاواز نەبوبێت.. بەڵام ئەمیش، ئەگەر لەژێر

ناچار كردنەكەدا بە خۆشحاڵیەوە قسە كوفرینەكەی كرد، ئەمیش ناچاریەكەی لێ قبوڵ ناكرێت و بەو قسە كوفرینەی كردوێتی كافر بوە..

كەوابو پوختەی حوكمەكە ئەوەیە، كە (هەر كەسێك گوفتارێكی كوفرینی كرد، پێی كافر دەبێت، جگە لەو كەسەی ناچار كراوە لەسەری و دڵی پڕ لە باوەڕ ماوە.. بۆ تەئكید لەوەشە كە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ﴾التوبة٦٦، واتە: تازە ئێوە بە تەئكید دوای باوەڕ هێنانەكەتان كافر بونەتەوە.. یەعنی بە كردنی قسەی كوفرین كافر بون، ئەمە لە كاتێكدایە، كە ئەوان لە ناخیاندا باوەڕیان وا نەبوەو پێشیان راست نەبوە .. ئەمە باسوخواسێكی دورودرێژە .. (الصارم المسلول ل٥٢٤ ) .

# گومانی سێیەم

## ( مەدخەلیەكان و پالانتەوانانی سەلەفی ) دەڵێن زانایان لەگەڵ ئێمەدان

(حەلەبی) خۆی هێناوبرد، تا كڵاوی مورجەئییەتی خۆی بكاتە سەری ئیمامی ئیبنولقەییمی رەحمەتی و بە ئێمەمانانیش بڵێ ئەوەتا زانای وا لەگەڵ بۆچونەكەی ئێمەدایە.. بەڵام ئەمەی بۆ نەچوە سەر، چونكە خوێندەوارانی شەرع ئەو ئیمامە بەرێزە دەناسن و دەزانن عەقیدەی چۆنە.. ئەم (حەلەبی سەلەفی) یە دەبو رێزی خۆی و ئەو ئیمامە بەقەدرەو ئەقڵی خوێنەرانیشی بگرێت وئەو چەواشەكارییە نەكات، نەدەبو ئیمامی ئیبنولقەییم بخاتە ریزی جەهمی كوڕی سەفوان و هاوبیرانیەوە، بەڵام وا دیارە حەزی خۆسەرخستنی ئەو رێ چەوتەی پێ گرتۆتە بەر.. ئەوەش ئەو زەین كوێریی و دڵڕەشییەیە، كە خوای مەزن باسی فەرموە خوا لامانەدا: (فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَـٰرُ وَلَـٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ) الحج/٤٦: خوای گەورە بینینەكان كوێر ناكاتەوە، بەڵكو زەینەكان كوێر دەكات لەو دڵانەی وان لە سینەدا ..

(حەلەبی) لە ئیمامی ئیبنولقەییمەوە ئەم قەولەی نەقڵ دەكات: (والكلامُ اذا لَمْ يُرِدْ بِهِ قائِلُهُ مَعناهُ، إمَّا لِعَدَمِ قَصدهِ لَهُ، أمْ لِعَـدَمِ عِلْمِـهِ بِـهِ، او أنـه أرادَ غـيرَ مَعناهُ، لَمْ يُلْزِمْهُ مَا لَم يُرِدْهُ بِهِ بِكلامِهِ، هذا دينُ اللهِ الذي أرسَلَ بِهِ رسولَهُ) (الحلبي: التحذير ل٧٢) واتە: ئەگەر قسەیەك بكەرەكەی مەبەستی ماناكەی نەبوبێت، چ لەبەر ئەوەی مەبەستی نەبوە وا بڵێ، یان لەبەر ئەوەی پەی پێ نەبردوەو

نەیزانیوە، یان لەبەر ئەوەی مەبەستێکی تری لێی هەبو، پێوەی پابەند ناکرێت .. ئەمەش ئەو دینەی خوای گەورەیە، کە بە پێغەمبەری خۆیدا صلی الله علیه و سلم ناردویّتی ..

(حەلەبی) ئابەو شێوەیە لە ئیبنولقەییمی رەحمەتی نەقڵ کردوە، تا وا تێبگەیەنێت، کە ئیبنولقەیمییش وەکو ئەم دەڵێ: (بۆ بە کافر دانانی بکەری رەفتارێکی کوفرین مەرجە بکەرەکە مەبەستی لەو کارەی کافربون بێت و پێشی خۆشحاڵ بێت)! ئەمەی لە شوێنێکی تریشدا هێناوەتەوەو چیرۆکی حەججاجی کوڕی عیلاتی خوا لێی رازی بێت هێناوەتەوە. (شریتی رد شبهة التكفيريين/ تسجيلات الميلم ـ مراكش).

شیکردنەوەو رەت کردنەوەی گومانەکەی (حەلەبی) لە چەند لایەنێکەوەیە:

یەکەم :پێشتر ئەو جیاوازیانەمان دیاری کرد، کە وا لە نێوان (ئەنجامدانی کرداری کوفرین بە ئەنقەست) و (ئەنجامدانی کرداری کوفرین بە مەبەستی دڵ)، وتمان، کە حوکمی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەربارەی یەکەمیانە، بەڵام جەهمیەو هاوبیرانیان قسەیان لەسەر دووەمیانە، ئەویش نەك لەسەر بە کافر دانانی بکەرەکە، بەڵکو لەسەر حسێب کردنی کارەکە، کە کردارێکی کوفرینە!

(حەلەبی) بە ئەنقەست هاتوە دوو مەسەلەی تێکەڵ کردوە: (مەسەلەی بەکافردانانی گشتی) و(بەکافردانانی کەسی دیاری کراو) (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی) زۆر جار ئەم حیلەو حەواڵانە دەکەن ..

١ـ ئیمامی ئیبنولقەییم وەکو هەر یەکێك لە پێشەوایانی سەلەفەو باوەڕی وایە، کە کردەوە جۆری وای هەیە، کە حوکمی کوفری گەورەی بەسەردا

دەدرێت، بێ ئەوەی مەبەستی بکەرەکەی بە نەزەری ئیعتیبار وەربگیررێت، بەڵام (حەلەبی) و ئەمسالی ئەو وەکو پێشتر رونمان کردۆتەوە باوەڕیان وایە، کە مەرجە کەسی بکەر کردەوەکەی بە حەڵاڵ بزانێت و، لە ئەنجامدانیدا مەبەستی کافربونی هەبێت!

ئیبنولقەییم دەڵێ: (وأمَّا كُفرُ العمَلِ فَينْقَسِمُ الى: مَا يُضادُّ الايمانَ والَى مَـا لا يُضادُّه، فَالسُّجُودُ لِلصَّنَمِ والاستهانَةُ بالمُصْحَفِ وقَتْلُ النَّبيِّ وسَبُّه يُضَادُّ الايمانَ) (ابـن القـيم: كتـاب الصـلاة ل٢٥) واتـە: کـرداری کـوفرین دەبێـت بـە دوو بەشـەوە: ئەوەی، کە پێچەوانەی باوەڕەو ئەوەی، کە پێچەوانەی باوەڕ نیە، سوجدە بردن بـۆ بـت و سـوکایەتی کـردن بـە قورئـان و کوشـتنی پێغەمبـەرو جنێـو پێـدانی لەوانەن، کە پێچەوانەی باوەڕن.

ب ـ ئیمامی ئیبنولقەییم و پێشەوایانی ئەهلی سوننەت چوار مەرج دادەنێن بۆ بەکافر دانانی ئەو کەسە دیاری کراوەی کرداری کوفرینی لێوە دەرکەوتووە، کە پێشتر باسمان کردن، لەوانە:

١. ئەنجامدانی کوفرەکە بە ئەنقەستێك پێچەوانەی هەڵەو ئەوی لە حوکمی ئەودایە، وەك: نوستن و سەرخۆشبون و شتی وا.

٢. بە زانینی پێچەوانەی نەزانین و پەی پێنەبردنەوە کردبێتی.

٣. سەربەستیەکی وای بوبێت کە پێچەوانەی ناچاریی.

٤. مانای بەڵگەو هەنجەتە شەرعیەکان وا لا ڕۆشن بێت، بواری لێکدانەوەی تری شیاوی بۆ نەمێنێتەوە ..

ئەگـەر کەسـێك بـە پێـی ئـەو خاڵانـەی سـەرەوە کردارێکـی کـوفرینی لێـوە دەرکـەوت، ئـەوە بـە کـافر دادەنرێـت، ئەگـەر یەکێکیشـیانی بـۆ بـو بـە عـوزر کوفرەکەی لەسـەر ناکـەوێت، مەگـەر خـۆی مەبەسـتی کـافربون دەربڕێـت، لـەم

حاڵەتە تایبەتیەیدا حوکمی کوفرە عەمەلیەکەی دەرێی لەسەر نەماوە، مەگەر خۆی بە قەولێکی کوفرین یان بە کردارێکی کوفرین تەعبیر لە کافربونی ناخی بکات. نمونە لەسەر ئەوە: کەسێك گوفتارێکی کوفرینی لێوە بیسترا، بەڵام دوای تەحقیق لێکردن دەرکەوت، کە ناچار کراوە لەسەری، یان بە هەڵە لەدەمی دەرچوە، ئەمە بە کافر دانانرێت، مەگەر مەبەستی کافربونی خۆی راگەیێنێت، بەوەی کە مەبەستی کافربون بوەو خۆشحاڵە بە ئەنجامدانی رەفتاری کوفرین، لەم حاڵەتەیدا ناچار بونی یان بەربەستی تری کافربون نایگرێتەوەو حوکمی کافربونی بەسەردا دەچەسپێت..

جا دیقەت لەمە بدەو هەڵوێستی مورجیئەی کۆن و (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەف) بهێنەرەوە بەرچاوی خۆت کە چۆن شتەکان تێکەڵ دەکەن!

ئیمامی ئیبنوتەیمییە لەوبارەوە دەڵێ: (ولكِنْ مَن شَرَحَ بالكُفرِ صَدراً مِن المُكْرَهينَ فإنَّهُ كافِرٌ أيضاً) (ابن تيمية: الصارم المسلول ل٥٢٤)، واتە: هەر کەسێك لە ناچارکراوەکان بە کوفر کردنەکەی خۆشحاڵ ببێت ئەویش کافر دەبێت.

کە ئەمەت بۆ رون بۆوە، ئەوە بزانە کە ئیمامی ئیبنولقەییم دوو مەرجی (مەبەستی کافربون) و (خۆشحاڵ بون بە کوفر کردن)ەکەی بۆ ئەو کەسە کردوە بە عوزر، کە رەفتارێکی کوفرینی بە هۆی نەزانین یان هەڵەکردن، یان جۆرێکی لێکدانەوە، یان ناچار کردنەوە ئەنجامداوە، نەك بۆ هەمو بکەری رەفتاری کوفرین. هەر وەکو ئەوەی رێی بە حەججاجی کوڕی عیلات (الحجاج بن عِلاط) دا خوا لێی رازی بێت ..

چیرۆکی ئەم یاوەرە بەرێزە وەکو بەیهیقی لە (دلائل النبوة ٤/٢٦٥-٢٦٦)و (ابن الاثير الجزري لە الكامل في التاريخ ٢/١٥١) و (ابن كثير لە البداية والنهاية

٢١٦/٤) ریوایەتیان کردوە، وەکو ئیمامی ئەحمەدو بەیهیقی لە معەممەرەوە ریوایەتیان کردوە، کە گوتویەتی: گویّم لە سابیتی بونانی بو لە ئەنەسەوە دەیگێڕایەوە کە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم بە سەرکەوتویی چوە ناو خەیبەرەوەو فەتحی کرد، حەججاجی کوڕی عیللات هاتە خزمەتی و فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا سامان وکەسوکارم لە مەککە جێهێشتوە، دەمەوێ بیانهێنم، ئەو پەیمانەم لەسەر سوك کە، کە پێم داویت (یەعنی وا حسێب، کە بەیعەتم هێشتا نەداویتێ) تا لەوە ئازاد بم قسەت پێ بڵێم و قسە بکەم ،پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم ڕێی دا چی دەڵێ ڕێپێدراو بێت!

نهێنی حوکمی ئەمە لەوەدایە، کە حەججاجی کوڕی عیلات هەرچی قسەیەکی بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم وتبێت لە دڵ و دەرونیدا مەبەستی کوفر کردن نەبوە، دەنا ئەوە دەبو بەرێچکەی هەمو موسوڵمانێك، کە هەر کەسێك بیەوێت سەروەت و سامانی لەدەست دوژمن دەربهێنێت بچێت و جنێو بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم بدات! ئەمە رەفتارێك نیە قبوڵ بکرێت، چ جای ئەوەی ببێتە حوکمێکی شەرع...

نهێنی بە کافر دانەنانی ئەم یاوەرە بەرێزە لە قسەوتن بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم لەوەدایە، کە حوکمێکی تایبەتە بە مافی خودی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم خۆیەوە.. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم دەیتوانی لەو مافەی خۆی بۆ هەر کەسێك بیەوێت تەنازول بکات.. بۆیە ئیمامی ئیبنوتەیمییە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم بۆی هەبو لە ژیانی بەفەڕی خۆیدا، چۆن خۆی دەیویست، لە هەر کەسێك لەوانەی جنێویان پێ دەدا، خۆش بوایە، بەڵام ئەمە لەسەر ئوممەتەکە فەرزەو، بۆیان نیە تەنازولی لێ بکەن ولە کەس خۆش ببن لەوانەی جنێو بە پێغەمبەری خوا

صلی الله علیه وسلم دەدەن، چونکە ئەوە بەڵگە نەویستە، کە هەر کەسێك لە موسوڵمانان جنێوی بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە و سلم دا، یان دوای مردنی سوکایەتی پێکرد ئەوە کافرەو خوێنی حەڵاڵە.. (ابن تیمیة: الصارم المسلول ل ٢٢٦).

ئا ئەمەت لە بیر بێت نەبادا بکەویتە تەونی جاڵجاڵۆکەیی مورجیئەو (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی)ی سەردەمەوە..

تەنازول کردنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە و سلم لە مافێکی خۆی، هۆیەکی تایبەتەو رێ لە حوکمی بەکافر دانانی ئەو جنێودەرە ناسراوە رێپێدراوە گرت، بۆیە بەو قسانەی، کە کردبونی کافر نەبو، مەگەر پێیان خۆشحاڵ بوایە، حاڵی ئەو حاڵی ناچار وەکو یەکیان لێ هاتوە.. بەڵام هەر کەسێك بێ هەبونی ئەو رێپێدانە، یان بێ ئەوەی ناچار کرابێت، یان بەربەستێکی تری حوکمی کافربونی هەبێت جنێوی دابێت، حەتمەن بە پێی کۆڕا(ئیجماع)ی شەرعناسان کافرەو خوێنی حەڵاڵە، کەسیش غەیری مورجیئە پێچەوانەی ئەم بۆچونەیان نەبوە.

بۆیە ئیبنولقەییم دەڵێ: خوای پەروەرگار گلەیی و رەخنەی لەسەر ئەو کەسە هەڵگرتوە، کە لە ناخی خۆیدا غایلەی وای بە دڵدا دێت، بێ ئەوەی بە گوفتار، یان بە کردار دەری ببڕێت، هەر وەکو کە گلەیی و رەخنەی لەسەر ئەو کەسە هەڵگرتوە، کە لە بێ ئاگاییەکیدا رەفتارێکی کوفرینی لێوە دەردەکەوێت، بێ ئەوەی ویست و مەبەستی بوبێت، بۆیە ئەو کەسەی لە گەشکەی خۆشیدا یان لە سەدمەی ناخۆشیدا لە ناکاودا بە بێ بیرکردنەوەی پێشتر قسەیەکی کوفرینی لەدەم دەردەچێت بە کافر حسێب ناکرێت، هەر وەکو خۆشحاڵیەکەی خوای پەروەردگار بە تۆبەی عەبدەکەی، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە و

سـلم نمونـەی پـێ دەهێنێتـەوە، کـە کـابرا خـۆراك و خواردنەوەکـەی بەسـەر حوشترەکەیەوە بو، لەو بیابانە چۆڵە حوشترەکەی لێ بـزر بـو، زۆری بـۆ گـەڕاو بەدویدا وێڵ بو نەیدۆزیەوە، کە هیـوابڕاو بـو، لـە پـڕ حوشـترەکەی هاتـەوە بـۆ لای، لە خۆشیاندا هاواری کرد: (اللهُمَّ أنتَ عَبدِي وأنا رَبُّكَ، أخْطَأ مِنْ شِدَّةِ الْفَـرَحِ) واتە: خوایە تۆ بەندەی منیت و منـیش خـوای تـۆم!! لـە زۆر خۆشـییدا هەڵـەی کرد.. خوای گەورە لێی نەگرت.. حوکمی ئەو کەسەش، کـە لـە زۆر توڕەبونـیدا ئاوا لێی تێك بچێت، هەر بە کوفر لەسەری حسێب ناکرێت .(ابن القـیم: إعـلام الموقعين عن رب العالمين ٣/٦٤).

هـەروەها دەڵـێ: بـاس لـەوە کـرا، کـە کـابرا لـە خۆشـی دۆزینـەوەی حوشـترو خۆراکەکەی وتـی: (اللـهُمَّ أنـتَ عَبـدِي وأنـا رَبُّـكَ) لـە خۆشـیاندا بەهەڵەداچو! هەرچەندە کوفرێکی زەق و راشکاوی کرد، بەڵام بە کافر دانـەنرا پێـی، چـونکە مەبەستی نەبو، ناچاریش وایـە کـە گوفتارێـك یـان کردارێکـی کـوفرین ئـەنجام دەدات و ویست و مەبەستی نیە، بە کـافر دانانرێـت پێـی.. ( ابـن القـیم: إعـلام الموقعين عن رب العالمين ٣/٧٦) .

ئـەمما ئـەو کەسـەی، کـە رەفتـارێکی کـوفرینی لێـوە دەرکـەوتوە، بـەڵام بەربەستێکی شەرعی هەیە، کە ناهێڵێت حوکمی کـافربونی بـدرێت، وەکـو ئـەو چوار خاڵەی پێشتر هێنامانەوە، یان هۆیەکی تایبەت بە سـەردەمی پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه و سـلم، ئـەوە نـە ئیمـامی ئیبنولقـەییم، نـە یـەکێکی تـر لـە پێشەوایانی سەلەفی ئەم ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، ئەوە ناکـەن بـە مـەرجی حوکم نەدانی، کە گوایە لە دڵی خۆیدا مەبەستی کافربون نـەبوە! کـەس ئەمـە ناکات بە مەرج غەیری مورجیئەکان..

لە روانگەی ئەم تێگەیشتنەوەیە، کە ئیبنولقەییم رەحمەتی خوای لێ بێت دوودڵ و ڕاڕا نەبو لە دەرکردنی حوکمی کافربونی ئەو کەسەی بە سوعبەتەوە یان بە گاڵتەکردنەوە، یان بە لاقرتێ و تانەو تەشەر لێدانەوە رەفتارێکی کوفرین ئەنجام دەدات، بێ ئەوەی ئەوەی لەسەر بکاتە مەرج، کە مورجیئە دەیکەن، کە دەڵێن:( دەبێ لە دڵەوە نیازی کافربونی هەبوبێت) بۆیە دەڵێ: بە پێچەوانەی گاڵتەجارو سوعبەتچییەوە، کە حوکمی کەوتنی تەلاق و کافربونەکە دەیان گرێتەوە، ئەگەر کابرا بە سوعبەتەوە وتنی، ئەوە حوکمی شەرعی هەردووکیان (تەلاق کەوتنەکەو کافربونەکە)ی دەکەوێتە سەر، لەبەر ئەوەی مەبەستی وتنەکە بوە (وتنەکە نەك مەبەستی تەلاقدان وکافربون لە دڵ و دەرونیدا)، سوعبەت کردنەکەی بۆی نابێت بە بەربەستی دەرنەکردنی حوکمە شەرعیەکە. بە پێچەوانەی ناچارو هەڵەویژو بیرچوەوە، کە خاوەن عوزرن و چاوپۆشیان لێ دەکرێت.. (ابن القیم: إعلام الموقعین عن رب العالمین ٣/٧٦).

هەروەها دەڵێ: ئەگەر قسەکەی بۆ گاڵتەو لاقرتێ کردبو، با مەبەستی ماناکەشیان نەبوبێت، شەرع حوکمی ئەوەی دەدات، کە بەڵێ ماناکەشی مەبەست بوە، وەکو ئەو کەسەی، کە گاڵتە بە کافربون و تەلاق کەوتن و مارەیی و گێڕانەوەی ئافرەتی تۆراو دەکات.. ( ابن القیم: إعلام الموقعین عن رب العالمین ٣/١٣٢).

ئەمانە فێربە با (حەلەبی) دینەکەت لێ تێك نەدەن، خوای گەورەش بەرچاومان رۆشنتر کات، گومانمان لە دڵ و دەروندا نەهێڵێت و حەقمان زیاتر بۆ رون کاتەوەو نیشانمان دا..

ئەمە بە نیسبەت حاڵ و دۆخی کەسێکی دیاری کراوەوەیە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەم کێشەیە بە پێی ئەو رێسایەیە، کە شێخولئیسلام

دەربارەی دەڵێ: (وبالْجُمْلَةِ فَمَنْ قَالَ أو فَعَلَ مَا هوَ كُفْرٌ كَفَرَ بِذلِكَ، وإنْ لَم يَقْصِدْ أنْ يَكونَ كافِراً، إذ لا يَقْصِدُ أحَدٌ الْكَفْرَ إلَّا مَا شَاءَ اللّٰهُ) (ابن تيمية: الصارم المسلول ل ١٧٨) واتە :بە شێوەیەکی گشتی هەر کەسێك گوفتارێك، یان کردارێکی کوفرینی ئەنجامدا، پێی کافر دەبێت، با مەبەستی کافربونیشی نەبوبێت، خۆ کەس مەبەستی کافربونی راناگەیێنێت، مەگەر خوا حەز کات!!

# کۆتایی باس

خــوا کــردی هەنجــەتی (ســەلەفیەکانی بــەر ســێبەرو مەدخەلیــەکان وپالأنتەوانانی سەلەفی)مان کەمێك بنبڕ کردو، بەلگەی شەرعیمان لەسەر دیدو پێناسەو بۆچونیان هێنایەوەو سەلماندمان، کە (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپالأنتەوانانی سەلەفی) بۆچونی مورجیئەیان تێخزاوە، لە باس و پێناسەی باوەڕ(الایمان)دا حالّیان شرەو مورجیئەیتیەکەیان پێوە دیارە، لەباس و پێناسەی کافربون (التکفیر) دا وێرانترن و دەلّیی لەم سەردەمەدا بە نوێنەری مورجیئەی کۆن هاتونەوە! بەلاّم لە دادو ویژدانی زیندوش نیە نکولّی کردنی رەنجیان لە لادان و رادانی بیدعەو زیندو کردنەوەی سوننەت، بە تایبەتی رەنجی شێخی ئەلبانی رەحمەتی، لەو هەمو خزمەتە گرنگ و گەورەیەی بە سوننەتی پێغەمبەری خوای صلی الله علیە و سلم کردوەو بەردەوام داوای بە فەرمودەوە پابەندبونی کردوەو، ئوممەتەکەی هانداوە ئەوەندە تەقلیدگەرا نەبن، بەردەوام داوای لە سۆفی دەکرد لە شیرکیات و بیدعە خۆ بپارێزن، لە حزبیەکانی داوا دەکرد ئیسلام نەکەنە قوربانی حزبایەتی خۆیان.. ئەم بانگەوازەی بنەماو ئوسولّی ئیسلامن، بۆیە هەمو لەگەلّیدا هاودەنگین.. هەمیشە دەمانەوێت بە دادو رێزەوە باس لە رەنجی خێریان بکەین، چونکە ناشێت لەبەر هەندێك هەلّوێستی هەلّە چاو لە چاکەکانیان بقوچێنین.. ئیمامی ئیبنولقەییم دەلّێ: جا هەر کەسێك هەلّەی کردو وازی لێ بهێنرێت، کەس باسی چاکەکانی نەکات، خۆ هەمو زانست و پیشەسازیی و ئەزمونەکان بە هەدەر دەدرێن، مەشخەلّێکی رێ نامێنێت و هەمو بەردەبازەکان ژێروژور دەبن.. (مدارج السالکین ٢/٣٩).

ئێمە وا دەڵێین، تا ئەوەندە دادو ئینساف رەچاو کەین، کە پارسەنگی پێ بێتە دی، نەبادا ئێمەش وەکو (سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپالأنتەوانانی سەلەفی) بێ ویژدانانە تێکەوین و نکوڵی لە ماف خەڵکانی تر بکەین، چونکە ئەمە پابەندبونە بە فەرمانی خوای بەرزو بێ هاوتاوە، کە دەفەرموێ: ﴿یَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ﴾ المائدة/٨ واتە بوغزتان دەرهەق بە کەسانێك واتان لێ نەکات دادپەروەر نەبن، دادپەروەر بن، چونکە ئەوە لە تەقواو خواویستی نزیکترە..

بەلأم ئەوەی لەگەڵ شێخی ئەلبانی و(سەلەفیەکانی بەرسێبەرو مەدخەلیەکان و پالأنتەوانانی سەلەفی)ی سەردەمدا جیاوازین،ئەومورجیئەێتی و جەهمێتیەیە، کە تێی کەوتون و سوریشن لەسەر لاف و گەزاف لێدانی سەلامەتی عەقیدەکەیان، کە واش نیە.. چونکە بەرنامەی خوێندنی شەرعی و بانگەشەکەیان لە خوێندنی عەقیدەکەدا زۆر نوقسانە، ئیسلامەکەیان بەش بەش کردوە، بەشێکی سوك و ئاسانیان دەست داوەتێ، کە هیچ دەسەلأتدارێکی کافرو ملهوڕیان لێ زویر ناکات! هەمیشە هۆشیان لای سەلامەتی خۆیان و پاراستنی ژیانی بەرسێبەریانە! ئەم هەڵوێستە نامۆیانەشیان لەسەر حسابی عەقیدەو دینەکەیە! زۆر پێچەوانەی مەنهەجی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت وەستاونەتەوە.. ئەوان سەلامی خوایان لێ بێت پێناسەی حەقیان پێ ئەرکی خواویستی بو، کەچی ئەمان لە پێناسەی حەقدا منجەمنجیانەو لەبەر خاتری حاکمە رەزاقورسەکان چەواشەکارانە پێناسەی عەقیدەکە دەکەن!

کە بیر دەخرێنەوە زۆر ملهوڕانە لەسەر هەڵەی خۆیان سور دەبن و بە داعیانی حەقناسدا هەڵدەشاخێن و دەست و دەمیان دژیان دەخەنە کار! بە جۆرەها ناوناتۆرە ناوزەدیان دەکەن، لەبەر خاتری حکومەتەکان بە داعیانی حەق دەڵێن خەواریج، تا هاونەغمەی دوژمنانی ناوەو دەرێ بچڕن! دژی هەمو

**زاناو کەسایەتیەکن، کە لەگەڵ خۆیان هاوبیر نیە، چاویان بەرایی نایات کۆمەڵێکی ئیسلامی گەشە بکات، پێیان ناخۆشە کەسێك لە غەیری خۆیان نزیك بێتەوە، دەڵێی مەعسومیەتی شیعەیان بۆ خۆیان پچڕیبوە!**

**(سەلەفیەکانی بەر سێبەرو مەدخەلیەکان وپاڵانتەوانانی سەلەفی) هەر چیەك بن، هەر چۆنێك بن لای ئێمە موسوڵمانن ئەهلی قیبلەن، هەر دەبێت بیرخستنەوەیان بخەینە بەر دەست، تکای خواناسانیان لێ بکەین، تا برایەتی دینی لەگەڵ موسوڵمانانی تردا نەپسێنن، تا سینەفراوان بن، حەقیان پێ گرنگتر بێت لە خەت وخاڵ و شیوخ و شاڵ.. تا ئەوەندە شوێن گومان و دوودڵیی نەکەون، تا بگەڕێنەوە سەر ئەم دیدە دینیەی لە قورئان و سوننەتەوە هەڵهێنجراوە، تا نەفس ونەوسیان بخەنە لاوەو لەگەڵ موسوڵماناندا بکەونە رێ نەك ببنە خزمەتکاریی خۆڕایی حاکمە مورتەددو مەلعونەکان.. با هۆشیان لە سزاو پاداشتی قیامەت بێت و لەبەر خاتری خوا فەزڵی ئەو دنیا بدەن بەسەر دنیای بەردەستیاندا.. لە کۆتاییشدا پێمان چاکە بۆ بیرخستنەوە چەند خاڵێك راشکاوانە بخەینەوە رو، چونکە هەمیشە خوای کارزان بیرخستنەوەی کردوە بە مایەی سود، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَىٰ تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ الذاریات/٥٥:**

**یەکەم: پابەندبون بە قورئان وسوننەت بە پێی تێگەیشتنی سەلەف و پێشەوایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت فەرزە، لەگەڵ رەچاوکردنی گۆڕاو نەگۆڕی ئەحکامەکانی شەرع، وەکو ئیمامی ئیبنول قەییم دەڵێ: بە رەچاوکردنی کات و شوێن و بارودۆخ و نیازو مەبەست و کارو کاردانەوە..**

**دووەم: کۆبونەوەو گردبونەوەمان لەسەرعەقیدەوبەرنامەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، وەکو زانست و مومارەسە، چونکە بە بێ گەڕانەوە سەر عەقیدە پاکەکەو بیناکردنەوەی دیدو رێ لەسەری، ئەستەمە سەر لە نوێ ژیانێکی**

ئیسلامیانە دارێژرێتەوە، ئەمەش بەوە دەبێت، کە ڕێبازی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم و یاوەرانی بکرێتە نەخشەی ڕێ و شێوازی کاری ئەو شەرعناسانە بگیرێتە بەر کە ئوممەتەکە شایەتی دینداریی ساغ و سەلامەتی ڕێبازو ڕەنجی پڕ خێرو فەزڵی بۆ داون .

**سێیەم:** پێکەوە گرێدانی بانگەوازی گشتی خواویستی و پەروەردەی پشودرێژیی لەسەر سەرچاوەی پاکی ئیسلام، دور لە هەمو خلّتەو خۆڵ و ڕەچاوکردنی چۆنیەتی شایەتیدانی حەقویستیی و قۆناغی ململانێ و نەشونمای چەندو جۆر، هەر وەکو قۆناغەکانی سیرەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم..

**چوارەم:** فەرمانکردن بە چاکەو بەرهەڵستی کردن لە خراپە، کە مایەی کۆمەڵکاریی موسوڵمانان وپاکبونەوەی ریزو کۆڕو کۆمەڵیانە لە مونکەرات و هۆکاری ڕەفتاری دۆستانەی ناو خۆی موسوڵمانانە.. لەگەڵ ڕەچاوکردنی بارودۆخ و تواناو لێوەشاوەیی موسوڵمانان.. بۆ ئەوەی لانی کەم داعیانی خواویستی بتوانن ئەوە لە خۆیاندا بچەسپێنن، کە خوای خاوەن دەفەرموێ: (وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا) الفرقان/٥٢ واتە: جهادیان بەم قورئانە لەگەڵدا بکە. پێویست بەوە ناکات چاوبەست لە موسوڵمانان بکرێت و فریو بدرێن بەوەی، کە گوایە ئەم واقیعەی تێی کەوتون ناشەرعی نیەو لەبەر خاتری سەلامەتی و تێکنەچونی بارودۆخی گەدەبەلەکانی بەر سێبەر بوترێت ئیدارەی سیاسی و بارودۆخی یاسایی و داوەریی و ئابوری و فێرخوازی وڵات ناشەرعی نیە!

**پێنجەم:** مەرجی ڕاستی ڕێباز وەرگرتنی هەمو ئیسلامەکەی پێکەوە،

بێ ئەوەی دابڕدابڕ بکرێت و بەشێکی لێ بگیرێتە بەر.. لەگەڵ باش تێگەیشتنی ئیسلامەکە پێویستە لە واقیعەکەش باش تێبگەێنرێن و دیراسەی

هەمو هۆكارو شێوازەكانی سەرخستنی حەق بكرێت و وەسیلەی كاریگەری خۆی بۆ بگیرێتە بەر، تا گشتگیریی ئیسلامەكەش دەركەوێت...

ئەگەر داعیانی ئیسلام و پێشڕەوانی كۆمەڵكاریی ئوممەتەكە لایەنێكی ئیسلامەكەیان وازلێهێنا، یان لایەنێكی ژیان واقیعەكەیان فەرامۆش كرد، بۆ نمونە گوێیان بەوە نەدا كە عەقیدەكە چۆن دەچەسپێت، یان بەرنامە سیاسیەكە چۆن دادڕێژرێت ودەخرێتە بەرچاوان، یان وەسیلە كاریگەرەكانی سیستمی ئاراستەی ئابوری ئیسلامی دیاری نەكران، یان وەسیلەو چۆنیەتی فەرمان بەچاكەو بەرهەڵستی لە خراپە دیاری نەكران، یان هۆكاری خۆبەهێز كردن نەگیرانە بەر، حەتمەن خوای پەروەردگار سەركەوتنی خۆی دەگرێتەوەو لە جیاتی خەریكبون بە دوژمنانی خواوە، ناكۆكی و پشێوی دەكەوێتە نێوان موسوڵمانان خۆیانەوەو ئەمەش هەر سەردەكێشێت بۆ ناكۆكی و شەڕو پێكدادانی موسوڵمانان لە ناو خۆیاندا.. بۆ شیكاریی زیاتری ئەم پێشەكی و ئەنجامانە بڕوانە: (ابن تيمية: مجموع الفتاوى ١٥/٤٤ـ٤٥)، (محمد بوالنيت: الحركة الاسلامية و مسألة الافتراق ل ٨٧ـ٨٨).

خوای گەورە هەمومان بۆ ڕێی ڕاستی خۆی ڕێنمایی بكات .. ئامین

والحمد لله رب العالمين

# سەرچاوەكان


* ابن أبي شيبة، أبوبكر عبدالله بن محمد :
- كتاب الايمان/ تحقيق الالباني/ الكويت .
* ابن الأثير، ابو الحسن علي الجزري:
- الكامل في التاريخ/ دار الكتاب العربي، بيروت ـ الطبعة السادسة .
* ابن تيمية، ابو العباس تقي الدين أحمد بن عبدالحليم:
- مجموع الفتاوى/ مطابع الرياض، الطبعة الاولى ١٣٨٢ هـ .
- مجموع الفتاوى/ تحقيق الجظار والباز/ الطبعة الاولى ١٩٩٧ .
- منهاج السنة النبوية/تنحقيق د. محمد رشاد سالم، مكتبة ابن تيمية ـ القاهرة الطبعة الثانية ١٩٨٦ .
- الصارم المسلول على شاتم الرسول: تحقيق محي الدين عبدالحميد، عالم الكتب ١٩٨٣ .
ابن الجوزي، عبدالرحمن :
- موافقة صحيح المنقول لصريح المعقول: دار الكتب العلمية، بيروت / الطبعة الاولى ١٩٨٥.
- ابن حجر، أحمد بن علي العسقلاني :
- تقريب التهذيب/عناية عادل مرشد ـ مؤسسة الرسالة: الطبعة الاولى ١٩٩٦.
- تهذيب التهذيب / مؤسسة الرسالة ـ الطبعة الاولى ١٩٩٦ .
- فتح الباري شرح صحيح البخاري/ تحقيق عبدالعزيز بن باز: دار المتب العلمية / بيروت
- الطبعة الاولى ١٩٨٩.
ابن حزم، ابو محمد علي الاندلسي:
- المحلى بالآثار/ دار الفكر.
- الفصل في الملل و الآهواء والنحل: دار صادر ـ الطبعة الاولى ١٣١٧هـ .
ابن حنبل، أحمد الشيباني:
- المسند/دار صادر ـ بيروت.
ابن خزيمة، ابوبكر:

- متاب التوحيد/ تحقيق د. عبدالعزيز بن شهوان، الطبعة الخامسة ١٩٩٤.
ابن رجب الحنبلي، عبدالرحمن بن أحمد الحنبلي:
- جامع العلوم والحكم/ تحقيق شعيب الارناؤوط و ابراهيم باجس/ الرسالة - الطبعة الثانية ١٩٩١ .
- شرح علل الترمذي/ تحقيق السامرائي، دار الكتب العلمية، الطبعة الثانية١٩٨٥ .
ابن عبدالعزيز، عبدالقادر:
- الجامع في طلب العلم الشريف/ الطبعة الثانية/١٤١٥ هـ .
ابن عبدالوهاب، محمد:
- اسباب نجاة المسؤول من السيف المسؤول .. وا له ناو(مجموعة التوحيد) مكتبة المؤيد - الطبعة الثالثة ١٩٩٦.
كشف الشبهات/ دارابن خزيمة، الطبعة الاولى ١٩٩٧.
ابن عثيمين، محمد صالح:
- المجموع الثمين/ مكتبة الثقافة - الطبعة الاولى ١٤١٦ هـ.
ابن القيم، شمس الدين محمد بن أبي بكر :
- إعلام الموقعين عن رب العالمين/ دار الفكر، بيروت/ الطبعة الاولى ١٩٥٥.
- مدارج السالكين/تحقيق محمد حامد الفقي/ دار الكتاب العربي، بيروت ١٩٧٢.
- الفوائد/ دار النفائس/ الطبعة الاولى ١٩٧٩ .
- كتاب الصلاة/ دارالفكر - الطبعة الخامسة ١٣٩٩ .
ابن كثير، ابوالفداء الدمشقي :
- البداية والنهاية/ تحقيق أحمد ابو ملحم وآخرون - دار الكتب العلمية - بيروت / الطبعة الثالثة ١٩٨٧ .
- نفسير القرآن العظيم/ دار الفكر، الطبعة الثانية ١٩٧٠.
ابن ماجة، ابو عبدالله محمد بن يزيد القزويني :
- السنن/ تحقيق محمد فؤاد عبدالباقي، دار إحياء التراث العربي ١٩٧٥.
أبو بصير، عبدالمنعم حليمة:
- الانتصار لأهل التوحيد/ نيه ..

ابوداود ، سليمان بن الاشعث السجستاني:
- السنن/ الدار المصرية اللبنانية ١٩٨٨.
ابوالرحيم، محمد:
- تحذير الأمة من تعليقات الحلبي على الائمة/ جامعة العلوم التطبيقية، الطبعة الاولى ١٩٩٧.
أبو زيد، بكر بن عبدالله:
- تصنيف الناس بين الظن و اليقين/ دار العاصمة، الطبعة الاولى ١٤١٤ هـ.
- الخطاب الذهبي/ مكتبة السنة .
* الالباني، محمد ناصرالدين:
- التحذير من فتنة التكفير، دار الراية/ الطبعة الاولى ١٤١٧ع .
- التحرير لاصول التكفير(شريته)سلسلة الهدى و النور ٨٥٥/١.
- ثلاث مسائل مهمة (شريته) سلسلة الهدى و النور ٨٢١/١.
- حكم تارك الصلاة/ دار الجلالين، الطبعة الاولى ١٩٩٢.
- سلسلة الاحاديث الصحيحة/ الجزء الاول، المكتب الاسلامي - الطبعة الرابعة ١٩٨٥.
- سلسلة الاحاديث الصحيحة/الجزء السادس، مكتبة المعارف - الطبعة الاولى ١٩٩٦.
- الكفر كفران (شريته) تسجيلات بيت المقدس - عمان.
- من منهج الخوارج (شريته) سلسلة الهدى و النور٨٣٠/١ .
البغدادي، عبدالقاهر بن طاهر :
- الفرق بين الفرق/ دار الجيل ١٩٨٧.
البغوي، الحسين بن مسعود:
- شرح السنة/ تحقيق شعيب الارناؤوط و زهير الشاويش، المكتب الاسلامي، بيروت: الطبعة الثانية ١٩٨٣.
بوالنيت، محمد المراكشي :
- الحركة الاسلامية ومسألة الافتراق و الفرقة الناجية/ دار الاعتصام، الدار البيضاء/المغرب الطبعة الاولى ١٩٩٧.
البيهيقي، أبوبكر أحمد بن الحسين:

- دلائل النبوة ومعرفة أحوال صاحب الشريعة / تحقيق د. قلعجي / دار الكتب العلميـة، بيروت/ الطبعة الاولى ١٩٨٥.
الحلبي، علي حسن:
- التصفية والتربية/ دار التوحيد، الطبعة الثانية ١٤١٤.
- رد شبهة التكفيريين (شريته) تسجيلات المسلم / مراكش ز
- صيحة نذير بخطر التكفير/ نيه .
الحوالي، سفر:
- ظاهرة الارجاء في الفكر الاسلامي / منشورات جامعة أم القرى / مكتب الطيب.
حوى، سعيد:
- دروس في العمل الاسلامي/ دار عمار بيروت ١٩٨٨.
الدارقطني:
- السنن/ عالم الكتب بيروت: الطبعة الرابعة ١٩٨٦.
الذهبي:
- سيرأعلام النبلاء: تحقيق شعيب الارناؤوط/ مؤسسة الرسالة بيروت/ الطبعة السادسة.
سليمان، ابن عبدالله بن محمد بن عبدالوهاب:
- حكم موالاة أهل الأشرام وا له ناو( مجموعة التوحيد) دا.
الشاطبي، ابو اسحاق ابراهيم بن موسى بن محمد اللخمي:
- الاعتصام/ دار الطكتب العلمية بيروت الطبعة الثانثة ١٩٩١.
- الموافقات في أضول الشـريعة: شـرح عبـدالله دراز/ دارالكتـب العلميـة الطبعـة الاولى ١٩٩١ ز
شقرة، محمد ابراهيم:
- هي السلفية/ مكتبة ابن تيمية/ الطبعة الاولى ١٩٩٢.
الشهرستاني:
الملل و النحل، حاشية الفصل/ ابن حزم.
الشوكاني، محمد بن علي بن محمد :
- إرشاد الفحول/مؤسسة الكتب الثقافية الطبعة الرابعة١٩٩٣.

الطبري، جعفر محمد بن جرير:
- جامع البيان في تفسير القران/ دار لافكر بيروت ۱۹۸۷.
الطحاوي، ابو جعفر:
- العقيدة الطحاوية/ شرح الالباني/ المكتب الاسلامي الطبعة الثانية ۱۹۹۳.
اللالكائي، ابو القاسم بن الحسن:
- شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة/ تحقيق سعد حمدان/ دار طيبة / الرياض الطبعة الثانية ۱۹۸۵.
المباركفوري، محمد بن عبدالرحمن:
- تحفة الاحوذي بشرح جامع الترمذي/ دار الكتب العلمية بيروت الطبعة الاولى ۱۹۹۰.
النسائي، ابوعبدالرحمن أحمد بن شعيب :
السنن/ دار المعرفة بيروت الطبعة الاولى ۱۹۹۱.
النووي، ابو زكريا محي الدين بن شرف:
- صحيح مسلم بشرح النووي/ دار الفكر بيروت، الطبعة الثانية ۱۹۷۸.

# ناوەڕۆک

ئەم بیرو راو بۆچونانەی ، کە لەم کتێبە دایە، بیرو رای نوسەرە، مەرج نییە ئیمەی بڵاوکار هەمان دید و راو بۆچونمان هەبێت، نوسەر لە بیر و رای خۆی ئازادە .

ئێمەش ئامادەین بیرو راو بۆچونی جیاواز بە بیرو رای نوسەر بڵاوبکەینەوە...




نوسینگەی تەفسیر

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت: 2518138

موبایل: 07504605122

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com


